نووسینی:
هیوا مەلا حەسەن

# مێژووی چەند هۆزێکی کورد



دکتۆر کەیوان ئازاد ئەنوەر
پێشەکی بۆ نووسیوە

مێژووی چەند هۆزێکی کورد
نووسینی
هیوا مەلا حەسەن
بەرگ: ئیبراهیم سالح



هیوا حەسەن حوسەین عەبدولکەریم رەحیم
لە ١٠/٨/١٩٨٧ لە قەزای کەلار هاتۆتە دونیاوە،
ساڵی ١٩٩٥ خراوەتە بەرخوێندن، قۆناغی
سەرەتایی لە قوتابخانەی سەیدەی سەرەتای
تەواو کردووە، پاشان قۆناغی ناوەندی و ئامادەیی
لە ناحیەی رزگاری سەر بە قەزای کەلار تەواو کردووە،
ساڵی ٢٠٠٨ لە زانکۆی سلێمانی کۆلێژی پەروەردەی
کەلار بەشی مێژوو وەرگیراوە، لە ساڵی ٢٠١١ ژیانی
هاوسەری پێکهێناوە و خاوەنی سێ منداڵە بە ناوەکانی
(سەوداو سروش و رۆنیا). ساڵی ٢٠١٢ بە سەرکەوتووی
زانکۆی تەواو کردووە. لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٣ دامەزراوە
وەک مامۆستا. لە ساڵی ٢٠١٧ لە پەیمانگای بانگخوازان ناوی هاتۆتەوە
لە ساڵی ٢٠١٩ پەیمانگای بانگخوازی تەواو کردووە.

کتێبخانەی (PDF)

ناوی کتێب: مێژووی چەند هۆزێکی کورد .

نوسینی: هیوای مەلاحەسەن .

تایپ:نووسەر

هەڵەچن: ئەوین فایق

نەخشەسازی بەرگ: ئیبراهیم ساڵەح

نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم .

شوێنی چاپ: چاپخانەی چوارچرا ـــ سلێمانی ٢٠١٩

تیراژ : ( ٦٠٠ ) دانە .

نرخ : ٨٠٠٠ دینار

ئەم کتێبە لەسەر ئەرکی ئەحمەد حاجی غەفور کاوانی چاپکراوە

## سوپاس و پێزانین

پاش سوپاس و ستایشی خوای بالآدەست کەتواناو هێزی جەستەیی و عـەقڵی پیێ بەخشیم بۆ نوسینی ئـەم بەرهەمە، هەروەها لـەناخی دڵەوە سوپاسی خێزانی خۆشەویستم (ئەوین فایق)دەکەم، کەهاوکارم بوو تەواو بۆ کردنی ئەم بەرهەمە، هەروەها سوپاسی ئەو بەرێزانە دەکەم کەبە ووشە یەکیش یارمەتیان داوم لەبەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبەدا بەپێدانی زانیاری و وێنە یان تێبینی وسەرنجەکانیان.وەسوپاسی کاك ئەحمەد حاجی غەفور دەکەم کەئەرکی لەچاپدانی کتێبەکەی گرتە ئەستۆ.

# مێژووی  چەند هۆزێکی کورد

ڕامانێك لەمێژوو:



**دکتۆر کەیوان ئازاد**

کاتێـك بـەنێو ڕووداو و بەسـەرهاتەکانی مێـژوودا گـوزەر دەکەین، بەچەندین تۆمار و ئامـاژەی ئاسـایی و لەهـەمان کاتـدا پڕکێشـەو ململانـێ دەگـەین. کۆمەڵـە ڕووداوێکـی واقیعی و تێپەڕیوو و گرنگی مێژوویی، هەندێکی پڕ کێشـە و ململانێی و تەنانەت سەیروسەمەر و بێ ماناش!

سەیر ئەوەیە مرۆڤ خۆی هۆکاری دروستبوون و ڕوودانـی هـەردوو جـۆری ڕووداوەکـان بـوون، کەچـی سـەرباری ئـەوەی لـەتۆمارەکانی مێـژووی مرۆڤایەتیـدا جێیـان کراوەتـەوە، هەنـدێك بەکـەم بایـەخ و هەنـدێکی تـر بەدواکـەوتووی کۆمـەڵگای ئـەو ڕۆژگـارە سـەیریان کـردووە؟ کـار گەیشـتۆتە ئـەوەی، هەندێك بەشەرمەوە خۆیان لێداوە و بەڕابوردووی قۆناغێکی مێژووی سەیریان کـردووە، تەنانەت بەقۆناغێکی سەردەمی دواکـەوتووی کۆمـەڵگایان زانیـووە، یـەکێك لـەو بابەتـە هەستیار و جێ سەرنجانەی کۆمـەڵگاش، نووسـینەوەی مێـژووی خێـڵ و هـۆز و تـیرە و بنەماڵەکانە. ئەوانەی هۆکاری درێژەپێـدەری ژیـان و دەسـەڵات و ڕەوتـی پێشـکەوتن و پێخسـتنی کۆمـەڵگا بـوون، لەهەرسـێ قۆنـاغی مێـژوویی کـۆن و ناوەڕاسـت و نـوێی مێژوویدا، تەنانەت مێژووی سەراپای تـاك و خێـزان و کۆمـەڵگا و دەوڵـەتانی جیهـانیش بـووە لـەو مێـژووە دوور و درێـژەدا، چـونکە یـەك خێـزان و کۆمـەڵگاش نـەبووە سـەر بەبنەماڵە و تیرە و هۆز و خێڵێك نەبێت، بەئاستێك لەهەرسێ قۆناغە مێژووەکەدا، جگـە لەمێـژووی بنەماڵـە و تـیرە و هـۆز و خێڵـەکان شـتێکی دی نـابینین. تەنانـەت هۆکـاری درووستبوونی زۆرینەی ڕووداوەکانی مێژوو بوون. لێـرەوە بـا لـەخۆمان و دەوروبـەرمان

بپرسین: کەئایا هەرەمەکانی میسر و شورای چین و سەدان کاری لەو جۆرە لەپێناو کێدا دروستکران؟ ئەرێ لەپێناو گەورەیی و شکۆمەندی بنەماڵەیەکی دەسەلأت دارنەبوون، کە ئەمڕۆ بوونەتە شاکارێکی هەرمێژوویی جیهان و مرۆڤایەتی؟ یان بۆ نەپرسین، کە چ دەسەلأتێکی مێژوویی لەو سێ قۆناغەدا بنەماڵەیی نەبوون و لەهەناوی تیرە و هۆز و خێڵێکەوە نەکەوتوونەتە خوارەوە؟ بێگومان هیچیان. تەنانەت لەفۆناغی مێژوو و هاوچەرخ و دونیای ئێستاماندا زۆرینەی دەسەلأت و هێزی کیشوەر و ولأتانی جیهان بەدەست بنەماڵە و هۆزەکانەوەیە، بەلأم بەمۆدێلێکی سیاسی نوێوە. هەربۆیە خۆلادان لەمێژووی بنەماڵە و تیرە و هۆز و خێڵەکان، خۆلادانە لەواقعێك، کەبێ ئەو، نەمێژوو مانایەکی هەیە و نەمرۆڤایەتی. ئیتر ئەوە واقع و مێژووە ڕاست بووبن یان هەڵە، باش بووبن یان خراپ، بۆیە هەڵەیە بەکەم بایەخ لێیان بڕوانین و بەقۆناغێکی دواکەوتوویی کۆمەڵگایان بزانین. لەم سۆنگەیەوە کوردیش وەك پێکهاتەیەکی ئەم جیهانە پان و پۆڕە، لەو واقع و مێژووە بەدەر نەبووە. تەنانەت ئێستاشی لەگەڵدا بێ، کۆمەڵگەی کوردی، کۆمەڵگایەکی خێڵەکی و هۆزایەتی و بنەماڵەییە، تائەوەی ئەو تاك و هێزانەی لەیەك سەدەی ڕابردوودا وویستیان و هەوڵیان دا کۆمەڵگای کوردی لەبنەماڵەکان و تیرە و هۆز و خێڵەکان دابڕن، شکستیان هێناو و گەڕانەوە بۆ هەمان ڕێچکە و سیستەم و گەورەیی بنەماڵەیی. هەربۆیە لەم پێودانگەوە برای ئازیز و خۆشەویستمان کاك (هیوای مەلا حەسەن)، کەساڵانێك خوێندکارێکی ئازیز و گوێڕایەڵم بوو لەکۆلێژی زانستە مرۆڤایەتیەکانی زانکۆی سلێمانی (کۆلێژی پەروەردەی کەلار)، تاوی دایە بەرهەمێکی ناوازەی جوان لەسەر (مێژووی هۆزی گەلأڵی)، ئەو هۆزەی خۆی بەشێك بوو لێ و ئەندامێکی خوێنەوار و پسپۆری بواری مێژوویی بووە. هەربۆیە کاتێك ڕووی لێنام و دوای لێکردم چەند ووتەیەك بۆ بەرهەمە نوێیەکەی (مێژووی چەند هۆزێکی کورد) بنوسم، نەدەبوو پشتی تێبکەم و بەدەنگیەوە نەچم، چونکە لەلایەك ڕۆژانێك خوێندکارێکی ئازیز و لێهاتووم بوو، وە دەبوو وەك مامۆستایەك بەرامبەری وەفادار بم، لەلایەکی دیکەوە بۆ من جێگای شانازی بوو، خوێندکارێکی پێشووی خۆم و

مامۆستایەکی سەرکەوتووی ئێستا، پەلاماری بەرهەمێکی مێژووی وا گەورە بدات و بەدەنگیەوە نەچم، ئەمەو جگە لەوەی ڕیشەی هۆزایەتی هەردووکمانی دەکردەوە خزم، بۆیە بەهەموو ئەو پێوەرانە، دەبوا بەدەم داواکاریەکەی بچم و ئەم چەند دێڕەی بۆ بنوسم. ئەوەش دوای ئەوەی بەرهەمەکەم خوێندەوە و بەناوەڕۆك و زانیاریەکانی نێوی ئاشنا بووم. لەناخەوە دەستخۆشی لێدەکەم، کەزۆر جوان بۆبابەتەکەی چووە، بەوەی سەرەتا بەکورتەی مێژووی هۆزەکانی کورد دەستی پێکردووە، دواتر هۆزی گەورەی جاف لەنێو ئەو هۆزانەدا دەرهێناوە، بەدوایدا لەهەناوی هۆزی گەورەی جاف، هۆزی گەلاڵی دەرهێناوە، تابیخاتە بەرنەشتەرگەری مێژوو و شیکاریکی جوانی بۆبکات و بەزۆرترین زانیاری نوسراو و بیستراو، مێژوویەك بۆهۆزی گەلاڵی بنووسێتەوە.

ماوەتەوە بڵێین: ئەم کارەی کاك (هیوای مەلاحەسەن) خزمەتێکی زۆر گەورەی بەمێژووی هۆزەکانی کورد بەگشتی و هۆزی گەلاڵی بەتایبەت کردووە، بەوەی مێژووی ئەو هۆزەی بەشێوەیەکی زاستی لەفەوتان و لەناوچوون ڕزگار کردووەو بەرهەمێکی ناوازەی لێ پێکهێناوە، تەنانەت ئەگەر کەسێکی دی بیەوێ کارێکی تر لەسەر ئەم هۆزە بکات، بێگەڕانەوە بۆ ئەم بەرهەمە، کارەکەی ناتەواو ئەنجام دەدات. دیارە ئەوەش بەو مانایە نییە بەرهەمەکەی تەواو بێ هەڵەو بێ کەم و کوڕی بێت، چونکە کەماڵی تەواو هەرشایستەی خودایە، بۆیە بوونی هەڵەیەك یان ناتەواویەك لەم بەرهەمەدا هیچ لەبایەخی جوانی و چاکی کەم ناکاتەوە. لەم بوارەشدا لەوانەیە هەندێك بپرسن، کەئەگەر هەڵە یان کەموکوڕیەك کەوتبێتە نێو ئەم بەرهەمە، بۆ هەڵەو کەموکوورییەکانمان چاك نەکردووە؟ بۆ وەڵامی ئەو بەڕێزانە تەنیا ئەوەندە بەسە ، کەبڵێم لەلایەك ویستوومە نووسەر لەهەموو شوێنێکی ئەم بەرهەمە ئازاد بکەم. لەلایەکی دی زۆر ئاساییە دێڕێك و بۆچوونێك لای من هەڵەبێ و لای ئەندامانی هۆز و تیرە و بنەماڵەکانی کورد و هۆزی گەلاڵی و خودی نوسەری بەڕێز ڕاست بێت، بۆیە بەندە ئەم کارەم بۆ خوێنەرانی بەجێهێشتووە، تاخوێنەران و ئەندامانی هۆزی گەلاڵی و

هەموو ئەوانی تر، کاکە هیوایەکی جیاواز و باش ببینن. لەگەڵ هیوای سەرکەوتن و بەردەوامی بۆ برای نوسەرمان و خۆشەویستیمان بۆخزمانی گەلاڵی.

**پرۆفیسیۆری یاریدەدەر دکتۆر کەیوان ئازاد ئەنوەر**

**(١٨شوباتی ٢٠١٩)**

**(٢٨ڕێبەندانی ٢٧١٨ك)**

**سولەیمانی**

**پێشەکی نوسەر:**



هیوا مەلا حەسەن

هـۆز کۆڵەکەیـەکی بەرچـاوی پێکهاتـەی دروسـت بـوونی نەتــەوەی کــوردە، وەك نەتــەوەکانی دیکــەی ناوچــەکە کـوردیش لەچـەند هـۆز و تیرەیـەك پێکهـاتووە و دابـەش بوونــە بەســەر ناوچــەکانی کوردســتان دا، ئەمــەش وای کردووە لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جۆرێك جیاوازی هەبێت لەڕووی کەلتوور و هەڵسووکەوت و نەریتەوە.

ئێمـە لـەم لێکۆڵینـەوەمان مەبەسـتمان ئـەوە نیـە کـە بـیری هۆزایـەتی و دەمـارگیری عەشرەتایەتی زیندوو بکەینەوە یان کەم کـورتی هۆزێـك دەربخەیـەن و بـەهۆزێکی تـردا هەڵبدەین، بـەڵکو مەبەسـتمانە زانیـاری لەبارەیانـەوە بخەینـە ڕوو کـە دواجـار دەبێتـە بەشێك لەکۆی مێژووی نەتەوەکەمان. بێگومان مێژووی نەتـەوەی کـوردیش پێکهـاتووە لەمێژووی هەموو پێکهاتە جیاوازیـەکانی کۆمەڵگـەی کـوردەواری، جامێژووەکـە ڕەش و تاریك بێت یان ڕۆشن و گەشاوە بێت. ئەم هۆزانە خـاوەن زۆر لەسـەرکەوتن و شکسـتی نەتەوەکەمانن، لەزۆربەی ڕاپـەڕین و مـل نەدانـەکان بەداگیرکـەران هـۆز ڕۆڵـی گـەورەی هــەبوو، بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا زۆر جــار بوونەتــە کۆســپ لەبــەردەم پێشــکەوتنە گشـتیەکاندا، بـەوەی ئاسـتەنگیان لەبـەردەم پێشـکەوتن و گـەورەبوونی دەسـەڵاتی هۆزێکی تردا دروستدەکرد، بۆیە کارێکی ئاسان بوو داگیرکەران ئەم هۆز یـان ئـەو هـۆز لەیەکتری ڕاستبکەنەوە .

بەداخـەوە ئـەو هـۆز و تیرانـەی کوردسـتان هێنـدە بەشـەڕ و دووژمنایـەتی ناوخۆیـەوە سـەرقاڵ بـوون، نـەیان توانیـووە بەشـداریەکی کارابکـەن لەگەشـانەوەی بیروهەسـتی کوردایەتی، گلەیی شەرەفخانی بەدلیسیی لەهۆزە کوردەکان ئەوە بـووە هـەرگیز لـەناو خۆیاندا یەکگرتوو نەبوون و گوێرایەڵی یەکتر نـەبوون، شـەرەفخان بـەداخێکی گرانـەوە دەڵێت: هەر هۆزێك بۆ سەربەخۆیی بەجیا هەوڵی داوە، نافەرمیانـە ئـاڵای هـەڵکردووە و هیچ بۆچوونێکی یەکگرتوو لەناویاندا نیە، یەك حاکم کەهـەموو کـورد لەسـەری هـاوڕابن

نیە. یەکێ لەوکارەساتە مرۆیی و نەتەوەییانەی لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە ڕووبەڕوی کورد و خاکەکەی و ناسنامەی نەتەوەیی و هەبوونی کراوە، تواندنەوەی ڕەگەزی کورد بووە لەنێو نەتەوەکانی دیکە و هەروەها لەنێو ڕەگەزی خۆیدا، خۆیانکردووە بەخاوەنی خاکی کوردستان و بەهۆی ژێردەستەیی زۆرێك لەکورد مێژووی ڕاستەقینەی خۆی لە بیرچووەتەوە، بۆنمونە ئەمڕۆ بچیتە شارێکی لوڕستانی گەورە لەخەڵکی ئاسایی و قەڵەم بەدەست بپرسە ڕەگەزی تۆ چیە؟ زۆربەیان دەڵێن لوڕین و خەڵکی ئێرانین، هەندێکیان خۆیان بەگەلێکی سەربەخۆ ناودەبەن و کەخاوەنی زمان و مێژووی خۆیەتی، تاك تەرایش دەڵێن لوڕ و کورد یەك ڕەگەزن .

مەولانا جەلالەدین بەڵغی لەدێڕە شیعرێکی بەرزدا دەڵێت:

هەرکەس لەئەسلێ و نەسەبی خۆی دوور کەوتبێتەوە لەکۆتایدا ڕۆژێك لەڕۆژان خۆی پەیوەست ئەکاتەوە بەئەسڵەکەی خۆی و خۆی تێدا دەدۆزێتەوە .

بۆناسینی پێکهاتەکانی هەرکۆمەڵگایەك بنەماڵە، هۆز، عەشیرەتەکان بەرچاوترین و سەرەکیترین و بناغەکانی پێکهێنەری کۆمەڵگان، کۆمەڵگەی کوردی وەك هەر کۆمەڵگایە کی تر لەچەندین هۆز و عەشیرەت دروست بووە، کاتێك بنەماڵەیەك پەرەدەسێنێت و گەشە دەکات، ئێل یان عەشیرەت یان هۆزێك پێکدێت .

لێرەدا دەمانەوێت تیشکێك بخەینە سەر مێژووی هۆز و تیرە و تایفەکانی کورد، هیوادارم توانیبێتم دلۆپێك لەمێژووی هۆز و تیرە و تایفەکانی کورد بەخوێنەرانی کورد بگەیەنم .

گەلی کورد وەك هەرنەتەوەیەکی تری ئەم جیهانە پان و بەرینە، لەکۆمەڵێك هۆزی گەورە و بچوك پێك هاتووە، کەزۆرێك لە هۆزەکان بەگوێرەی ناوچەی جوگرافیا دابەش بوونە، هەندێك هۆزی تریش هەیە لەیەك کاتدا لەدەیان ناوچەی جوگرافیای جیاواز بوونیان هەیە وەك هۆزی گەورەی جاف و زەنگنە وکەڵهور و گەلاڵی هەمەوەند هتر ....

ئەم کتێبە لەبەردەست دایە باس لەچەند هۆزێکی کورد دەکات کە بەشێوەیەکی کورت و پوخت زانیاریان لەبارەیەوە وەرگیراوە، دەربارەی مێژووی سەرهەڵدانیان و ناو و شوێنی جوگرافیان بە ڕونی دەست نیشان کراوە .

گرفتی بەردەم لێکۆلینەوەکە: لێکۆلینەوەیەکی ئاوا بێگومان لەگرفت و ئاستەنگ بەدەر نیە، لەوانە کەمی سەرچاوەی تایبەت کە بەتەواوی باس لەوردەکاری بابەتەکە بکات وکەمی یان نەبوونی سەرچاوەی سەرەکی لەم بارەیەوە بەگوێرەی پێویست کە بەشێوەیەکی ئەکادیمانە باس لەهۆزو تایفەکانی کورد بکات. یەکێك لەو گرفتانە دووچارم بوو ناشارەزای لەزمان بەتایبەت عەرەبی و فارسی. بەلأم لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا توانیمانە پشت بەخوا لێکۆلینەوەیەکی باش بەئەنجام بگەیەنین، لەڕاستیدا پاش هەوڵ و ماندووبونێکی زۆرگەیشتە ئەنجام .

لەکۆتایشدا هیوادارم ئەم تۆژینەوە ببێتە هۆکاری پڕکردنەوەی کەلێنێك — یاخود چرایەکی گەش بۆ ولأتەکەمان، وەلەکەم و کورتیمان ببورن .

ئێمە لەم کتێبەماندا ئەگەر هەڵەو کەم و کورتیەکمان کردبێت هەموومان مرۆڤین و قابیلی هەڵەین، خۆم لێی بەرپرسیارم هیوادارم بەڕەخنەی زانستی و دوور لەڕق و قین ڕاستبکرێتەوە کەیاریدەی باسەکە بدات و خزمەت بەمێژووی هۆزەکان بکات .

**نووسەر**

**٢٠١٩ کەلار**

پێشینەیەکی مێژوویی :

ئەلفرێد ژاکوب* کە ڕۆژهەتناسێکی فەرەنسایە لەچارەکی دووەمی سەدەی نۆزدە سەفەرێکی دوور درێژی بەکیشوەری ئەفریقاو ئاسیادا کردووە، لەو سەفەریدا سەری لە کوردستان داوە یاداشتەکانی خۆی لەساڵی (١٨٥٣)ز لەپاریس چاپ کردووەو لەوەسفی کوردەکان دەڵێت :

کوردەکان سوارچاکی یەکجار لێهاتوون، کەسواری ئەسپ دەبن هەمیشە چەك بە خۆیانەوە دەکەن، جەنگاوەرەکانیان تیر و کەوان لەخۆیان دەبەستن، مرۆڤی تابڵێی بە جەرگ وئازاو جەسوورن، کوردەکانی دەوروبەری دیمەشق و حەلەب و موسڵ هەروەها ئەوانەی وڵاتی فارسیش بەشێوەی هۆز هۆز لەناوڕەشماڵاندا بە کۆچەری دەژین، دەتوانین بڵێین تاڕادەیەك سەربەخۆن، لەکاتی کۆچکردن و ڕەشماڵ گواستنەوەدا باج و خەراج زۆر کەم دەدەنە دەوڵەت، دەتوانین بڵێین هەموو هۆزە کوردیەکان هەمان دابونەریت و ئاکاریان هەیە، سەر بەمەزهەبی عومەرن (دیارە نوسەر لێرەدا بەهەڵەدا چووە کورد بە زۆری سونەن و لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعین) زۆر حەز لەتاڵانکاری دەکەن، بەڵام لەهەمان کاتدا هەتا بڵێی بەخشندەو و میوان دۆستن، بە بەروبومی مەڕو ماڵاتەکانیان دەژین، زۆر لەسەر بەڵێن و گفتی خۆیان ڕژدن، شانازیکردنێکی جوان بەنەتەوەو نیشتمانی خۆیان دەکەن .

ئەم میلەتە بەتەواوەتی لەدەرەوەی بازنەی یاساکانی ئەو ڕژێمانەدان کەئاسیا بەڕێوە دەبەن، لەناو خۆیاندا ژیانێکی ئازادو سەربەخۆیان پێکهێناوە، ئەم میلەتە جەنگاوەرە کەبەڕاستی خوێنێکی شکۆمەندانە لەناو دەمارەکانیاندا دەگەڕێ، پێویستی تەنها بەوە هەیە کەسەرکردەیەکی ئازادیخواز و یاسادان بۆ خۆی پەیدا بکات، بۆ ئەوەی بتوانێ ڕژێمە کۆن و کەودەنەکانی تورکیا و فارس سەرەونگون بکاتەوە.

هەروەها بۆ ئەوەی بتوانێ بەیارمەتی شارستانیەتی ڕۆژئاوا دەسەڵاتداریەکی گەنجانە و بەهێز لەناوچەکەدا دابمەزرێنێ[1] .

[1] د . فەرهاد پیر باڵ: کورد لەدیدی ڕۆژهەڵات ناسەکانەوە ،چ١ ،٢٠٠٩ ، ل ١٣٣ .

د. شاکر خەسباکیش لەسەروبەندی دامەزراندی کۆماری عێراق لەکانوونی دووەمی ساڵی (١٩٥٩) لە٣٢توێژنەوەیەکی دا لەسەر کورد بەم شێوەیە دەنوسێ :

هۆزە کوردیەکان لەپێشدا وەك نەریت کاری ئاژەڵداریان کردووە گرنگترین ئاژەڵیشیان مەڕ و بزن بووە، ئابوریان لەسەر بازرگانی بەبەرهەمی ئاژەڵەوە بووە لەخوری و شیرەمەنی و هەروەها ئاژەڵی زیندو، هەندێکیشیان کشتوکاڵیان کردووە .

کاروباری هۆز لەلایەن سەرۆکێکی بەرزەو کە یەکێکە لەئەندامانی خێزانی دەسەڵاتدار بەڕێوەدەبرا لەگەڵ ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری پێکهاتووە لەسەرۆکی تیرەکان هاوکاری سەرۆکی هۆز دەکرێت، ئەندامانی خێزانی دەسەڵاتدار پێیان دەگوترێ ئاغا یا بەگ، سەرۆك هۆز پارەیەك بۆ خەرج و تێچوونی دیوەخان تەرخان دەکات، دیوەخان جێگای کۆبوونەوەو گفتوگۆ کات بەسەربردن و باسکردنی کاروبارو پێشکەشکردنی نارەزایی و ئەنجامدانی دادگەری نێوان ئەندامانی هۆزە، سەرۆك هۆز دەبێت چاوتێرو ئازاو جێی متمانەی هۆز بێت، سەرۆکایەتی هۆزیش وەك باوە میراتییە (پشتاوپشتە) .

لەڕاستیدا زۆرێك لەسەرۆك هۆزەکان پاش ئەوەی جێگربوون بوونە موڵکدارێکی گەورە و پێوەندی لەگەڵ ئەندامانی هۆزەکە بووە پەیوەندی موڵکدار و وەرزێر، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا خێڵەکییەکان چارەسەری گیروگرفتەکانی خۆیان بەهۆی سەرۆکەکانیانەوە پێ چاکتر بووە، بەدەگمەن هاتوچۆی کارگێری میریان کردووە، دەسەڵاتی سەرۆك لەناو هۆزە جێگربووەکان کز بووە، سەرۆك هۆز تەنها دەسەڵاتێکی ئەدەبی بەسەر ئەندامانی هۆزەکەیدا ماوە[٢] .

ڕەشماڵ :

هۆزە کۆچەریەکان لەژێر ڕەشماڵ دەژیان، بەلاَم ڕەشماڵی سەرۆك لەهەموو ڕەشماڵەکانی تر گەورەتر بووە، لەنێوەندی کۆمەڵێ ڕەشماڵی تردا لەخۆی بچوکتر هەڵئەدرا، کەپڕفەرش تر بووە و لەناوەوە دابەشدەکرا و ڕەشماڵ پایەی کۆمەلاَیەتی خاوەنەکەی لەنێو هۆزدا نیشانداوە، تا پلەی خاوەنەکەی گەورەتر بوایە ڕەشماڵەکە

---

[٢] د . شاکر خەسباك: کورد و مەسەلەی کورد ،و ئەمجەد شاکەلی ، چ١ ، ٢٠٠٥ ،ل ٦٩–٧٢.

گەورەتر دەبوو، هەر لەوێدا کۆبوونەوە گشتییەکان ئەنجام ئەدران، چەشنی دادگایەکی بالاّ بوو، سەرجەم کێشەکانی تاکی هۆزی تێدا تاوتویّ دەکرا، زۆر جاریش بە بڕیارێك یەکلایدەکرایەوە، ئیدی ئەو بڕیارە ستەمکارانە بوایە یان دادوەرانە(٣) .



ڕەشماڵ

بەشێوەیەکی گشتی ئەو ڕەشمالاّنە نزم بوون بەهۆی گوریس (حەبل)ی بچوکەوە بە مێخ لەزەوی قایم ئەکران، ئەو ڕەشمالاّنە لەمووی بزن دروست دەکران، هەربۆیە پێی دەوترا ڕەشمالّ، پتەو قایم بوون و ڕێگایان بەچوونە ژوورەوەی دلۆپە باران نەدەدا، لەکاتی کۆچکردندا گواستنەوەی ئەو ڕەشمالاّنە لەنێوان لەوەڕگاکانی هاوین و زستان دا ئاسان بوو .

ڕەشماڵەکان بەچیغی ڕەنگاو ڕەنگاوڕەنگی جوان دابەش دەکران ئەو چیغانە لە قامیش دروست دەکران، هەر بەشێك بۆ مەبەستێکی تایبەتی تەرخان دەکرا، بە جیا بۆ میوان و کۆگای زەخیرەو بەرهەمی شیر و جێگای ئافرەتان بەکار دەهێنران، ژنانی کۆچەری بەتایبەتی جاف خۆیان مووەکەیان ئەرست و هەر خۆیان دروستیان ئەکرد، ڕایان ئەخست لەسەر ئەرز وەکو مەوج و بەکەڵکیتی دار ئەیان کوتا (٤).

---

٣ خالد مەحمود کریم : س ،پ ، ٨٩ .

٤ حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ: س ، پ ،ل٢١٥-٢١٦ .

## هۆزی گاوانی (کاوانی) :

گاوان هۆزێکی کۆن و گەورە و فرەخێڵ و بەناوبانگی کوردە، لەمێژووی عێراق دا لەهۆزە هەرە بەناوبانگەکانە، ئەم هۆزە لەمێژووی عێراقی ڕۆژگاری ئیسلامەتیدا دەورێکی زۆر گرنگیان هەبووە، لەهەموان زیاتر ناودارتر بوون، لەناوچەکانی مەندەلی، واسیت (کووت)، حیلە لەباشوری بەغداد و کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلە نیشتەجێ بوو بوون[٥] . گاوانیەکان پێشووتر لەدەوروبەری ڕووباری سیروان و قەرەتەپەدا نیشتەجێ بوون[٦] . پێشووتر لەچەند تیرەیەك پێکهاتووبن وەك: بەشیری، نەرگسیەت، زوهەیری، هەواری . لەدواساڵەکانی کۆتای سەدەی چوارەم میرنیشنێکیان دامەزراند، زیاتر لەسەدە و نیوێك فەرمانڕەوایی ڕووبەرێکی زۆری ناوەڕاست و ڕۆژهەڵاتی عێراقیان دەکرد، پیاوانی ئەم هۆزە دەوری دیار و کاریگەریان لەڕووداوەکانی عێراق هەبوو، لەجیهانی ئەدەب و زانست و ڕوناکبیریدا جێپەنجەیان دیارە لەڕیزی پێشەوەی هۆزەکانی کورد دێت، گەلیك زانا و فەقیە و شاعیر و نوسەر لەخێل و تیرەکانی ئەم هۆزە هەڵکەوتوون وەك :

١- ئەبوسەعیدی گاوانی (٤٦٨-٥٦١ کۆچی/١٠٧٦-١١٦٦ زاینی)، ئەبوسەعید شارەزاییەکی قوڵی لەفیقە و فەرموودەدا هەبووە، لەهەمان کاتدا لەبواری شیعر و وێژەی عەرەبیدا شوێن پەنجەی دیارە، کتێبێکی لەبارەی هونەری شیعرەوە نوسیوە .

٢- شێخ وەرامی گاوانی: شێخ وەرام کوڕی میر ئەبو فیراس عیساوی کوڕی ئەبونەجمی گاوانیە (٥٣٠-٦٠٥ کۆچی/١١٣٥-١٢٠٨ زاینی)، بەناوبانگترین کەسایەتی ئاینی هۆزی گاوانە، لەماڵبات و میرانی هۆزی گاوان بووە، دەستی لەکاروباری میرایەتی و لەشکری کێشایەوە و ژیانی تەرخان کردووە بۆ

---

[٥] حەسەن مەحمود حەمەکەریم: کابانی کوردی، چ٣، ١٩٩٨، ل٢٤ .

[٦] د.مستەفا جەواد: پوختەیەك لەکتێبی هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانیە بەناوبانگەکان، و هەژار موکریانی، چ٢، ٢٠٠٨ ،و هیتد....

خواپەرستی و گۆشەگیری و کاتی خۆی بەقورئان خوێندن و دینداری و ئامۆژگاری و پاڕانەوە بەسەربردووە، تا وای لێهات خەڵکی بۆ ڕاوێژ سەردانیان دەکرد و ئامادەی وانەو ئامۆژگاریەکانی دەبوون. شێخ وەرام کتێبی تنبیە الخواتر و نزهە النواظر داناوە، لەساڵی ١٢٠٨ کۆچی دوای کرد و لەمەزاری ئیمام عەلی لەنەجەف بەخاك سپێردرا .

٣- شێخ موتەلیبی کوڕی بەدری موتەلیبی زوهمانی بەشیری گاوانی (٥٤٧-٦٢٤کۆچی/١١٥٢-١٢٢٧زاینی): لەخێڵی بەشیریە کەیەکێکە لەخێڵەکانی هۆزی گاوان، زۆربەی ژیانی لەبەغداد بەسەربردووە، لەزانستی فەرمودە و شەریعەت دا شارەزابووە، لەخوێندنگەکانی بەغداد وەك مامۆستا دامەزراوە، مێژوونوس(المنزری) یەکێکە لەوانەی لەلایەن شێخ موتەلیبەوە بڕوانامەی زانستی پێبەخشراوە، شێخ موتەلیب لەساڵی ١٢٢٧زاینی کۆچی دوای کردوە و لەبەغداد بەخاك سپێدراوە .

ئەندامانی ئەم هۆزە زۆر حەزیان لەشعیر کردووە و برەویان پێی داوە، لەمێژووی ئەدەبی عەرەبی دا بەتایبەتی لەشیعردا دەوری کاریگەریان هەبووە، ئەم هۆزە لەمێژووی عێراقی ڕۆژگاری خەلافەتی ئیسلامیدا دەورێکی زۆر گرنگی هەبووە، لەناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی دا لەهۆزە هەرە بەناوبانگەکانی کورد بوون .

عیمادی ئیسفەهانی لەسەدەی شەشەمی کۆچی دا باسی ئەم هۆزە دەکات و باسی هەندێك لەفەرمانڕەواکانی دەکات، دەڵێت ئەبووشوجاع عاسم کوڕی ئەبوو نەجمی کورد لەگەورە پیاوانی کوردی گاوانە.

فەیرووزابادی دەڵێت: گاوان هۆزێکی کوردە لەعێراق دا لەحیلەی مەزیدیە نیشتەجێ بوون، زانای ئاینی محەمەد کوڕی عەلی لەوانە، لەحلە لەشوێنێك نیشتەجێ ئەبن بەناوی (حی الاکراد) گەڕەکی کوردان، ئەو گەڕەکە هەر لەڕۆژی درووست بوونیەوە هەتا ئەمڕۆیش هەر بەناوی کوردەوەیە، شاری حیلە لەکۆتایەکانی سەدەی پێنجەمی کۆچی دا دروستکراوە، هۆزی گاوانی لەگەڵ هۆزی بەنووئەسەد هاووپەیمان بوون، لەسەردەمی دەسەڵاتی خەلیفەکانی عەباسی شان بەشانی بەرەی هۆزی ئەسەدی عەرەبی شاری

حیلـەی ئێسـتای عێراقیـان بنیادنـاوە، ماوەیـەکی زۆر مەیـدانی زۆرانبـازی و ڕێبـازی پڕلەشانازی یان بووە لەخانەقین* و مەندەلی و حەلوان و بەدرە و جەسانی لای کووت و عەمارە، گەلێك چیاو و کەژ و دەشت و بەنـدیان لەبـەر دەسـت بـووە، کـەس نـەیوێراوە دەستیان بۆ بەرێ و هۆزێکی ئازا و بەهێز بـوون، ئـیبن بەتووتـە لەسـاڵی(٧٢٧) کۆچـی بەحیلـە دا تێپـەڕ بـووە دەڵێـت: خـەڵکی ئـەم شـارە هـەموویان دوازدە ئیمـامین و دوو تـیرەن، تیرەیـەکیان پێیـان دەڵـێن کـورد، ئـەوی تریـان بەخـەڵکی جـامعین ناسـراون، هەمیشە شەڕ و ئاژاوەیان لەناودایە، کەبێگانە دووبەرەکییان بۆدەنانەوە و بەگژیەکیاندا دەدا، ئـەم هـۆزە پاشـان بەدەوروبـەری حیلـە تـا واسـیت بلاّوبووەتـەوە، نـاوی وەرام لەهەرەبەناوبانگەکانی ئەم هۆزەیـە، پاشـان کەتێکـەلاّوی عـەرەب بـوون، گـەلێك نـاوی عەرەبیشی وەك موهەلهەل، تەغلەب، عەنتەری لەناویاندا پەیدا بوو[٧] . هەنـدێك دەڵـێن هەوارگەی سەرەتایی هۆزی گاوانی (کاوانی) چیا بەرزەکانی ناوچەی دەماوەنـد بـووە، کەناوچـەیەکی شـاخاوی و سـەخت بـووە، بـەهۆی سـەرماو بوومەلـەرزەی زۆرەوە ئـەو ناوچەیان جێهێشـتووە، هـاتوون بـەرەو گـەرمیان و پاشـان ڕۆیشـتوون تاگەیشـتوونەتە ناوچەی حلە، پاشان شاری حلەیان دروستکردووە لەگەڵ هۆزی بـەنی ئەسـەد، لـەدوای ئەوەی هۆلاکۆ بەغدادی داگیر کردوو کۆتـایی هێنـا بـەحوکمی خەلافـەتی عەباسـیەکان، بەنی ئەسەدەکان بوون بەهاوپەیمانی مەغۆل و لەگەڵ سوپای هۆلاکۆ ڕوویانکردە شاری

---

[٧] د.مستەفا جەواد: پوختەیەك لـەکتێبی هـۆزی لـەبیرکراوی گـاوان و گاوانیـە بەناوبانگـەکان، و هـەژار موکریانی، چ٢، ٢٠٠٨ ،و هیتد...

خانەقین: یەکێکە لەقەزاکانی سەربەپارێزگای دیالە و زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردن، کەوتۆتە نێـوان قەزای کفری لەباکورەوە،قەزای مەندەلی و شاخی حەمرین لەباشوردا دیاری دەکات، ڕوبـاری سـیروان لـەڕۆژئاوا، سـنوری عێـراق و ئێـران لەڕۆژهـەلاّت، بەشـێوە زارەکـانی کـەلهوڕی، گـۆران، فـەیلی قسەدەکەن، لەڕووی ئاینیەوە موسڵمانن و بەشێکی زۆری شیعە مەزهـەبن بەشـەکەی دیکـە سـونەیە، بەشـێکیش پـەیڕەوی ئـاینی کاکـەیی (یارسـان)ن، جگـە لـەکورد کەمینەیـەکی تورکمـان و سـائبی و مەندائی لەخانەقین دەژین .لەڕیفرانـدۆمی باشـوری کوردسـتان دا نزیکـەی ٩٩/ دەنگیـان بـەڵی دا بـۆ سەربەخۆی کوردستان. دیاری ئەحمەد .

حلە، زۆرێکیان کەوتنە بەر گرتن و کوشتن و لەناوچوون، گاوانیەکان هەر ئەوەیان پێکرا بەژن و منـدالّ و پـیرو پەککەوتەیانـەوە ڕاکەنـەوە ئاژەڵـەکانیان پـێش خۆیـان بـدەن و بەهەموو بەشەکانی کوردستاندا بلاّو بوونەوە، هەر بنەماڵە و بەرەبابێك لەهۆزی کـاوانی لەشوێنك جێگربوون، پاشان بەشێکیان گەڕانەوە شاری حلە کەزێدی خۆیان بوو، بـەلاّم بەهەموویانەوە ناوی هۆزەکەیان تائێستا پاراستووە، گەورەترین سـەرکردەی سـەربازی گاوانیـەکان(کاوانی) لەوکاتــەدا حوســامەدین ئەبوفراســی جـاوانی بــوو، کەبــەهێزێکی گەورەی گاوانیەکان بەرگیری لەبەغداد دەکرد لەگەڵ عەباسیەکان هەموویان تیاچوون و کوژران[٨].ساڵی ٤٢٠ کۆچی کاتێك تورکە سەلجووقیەکان ڕوویـان کـردە خـاکی ئێـران و ولاّتــە موســڵمانەکانی تــر، کــورد و عــەرەب بــۆ بەربــەرەکانێی ئــەوان یــەکیان گــرت، سەرکردەی کوردەکان ئـەوکات ئـەمیر ئەولفـەتحی گـاوانی و حوسـامودەولە ئەبولشـۆك کـوڕی محەمـەد کـوڕی عـەنازی کـوردی شـازنجانی بـوون، لەشـکری کـورد و عـەرەب لـەباکوری شـاری موسـڵ تووشـی سـەلجووقیەکان هـاتن، لەوشـەڕەدا تـوورك و ئـەمیرە سەلجوقیەکان تێکشکان و هەموو خێوەت و بار و بارخانـەیان لەمەیـدان دا جێهێشـت و ڕایان کرد .

لەناوەڕاسـتی مـانگی شەشـی سـاڵی ٤٤٩ کۆچـی ئەبوفـەتح کـوڕی وەرامـی گـاوانی و بەدرانی کوڕی نوورەدەولەی مەزیـدی هاتنـە بەغـداد، لەلایـەن تـوغرول بـەگ پێشـوازی لێیـان کـرا و زۆر ڕێـزی لێگـرتن، ڕۆژی دواتـر سـەرۆکی سـەرۆکەکان ئەبولقاسـم کـوڕی موسلیم بانگی کردنە لای خۆی لەناو قسەکانیدا دەسـتی کـرد بەسـەرکۆنەی ئەبولفـەتح بـەوەی خـۆی کـردووە بەدۆسـتی ئەرسـەلانی بەساسـیری، ئەبولفـەتح لەوەلاّمـدا ووتـی لەوکاتەی توغرول بەگ هاتە ئەم ولاّتە دڵی کەستان ڕانەگرت و هەموو کەستان لەخۆتان دوورخستەوە، سولّتان مالّ و سامانی خەڵکی تالاّنکرد، جێگایەکتان نەهێشت پەنای بـۆ بەرین...، پاشان وەزیـر دڵـی دایـەوە لـەباتی خەلیفـە قـائیم بیئـەمریلا بـەڵێنی هـەموو چاکەیەکی پێدا، لەقسەکانی ئەبولفەتح وادەرکەوت لەناو کوردەکاندا هی وا هەبوون

---

[٨] دەستنوسی حەمەخان حمە ئەحمەد کاوانی: دەستنوس، سلێمانی، ٢٠١٩/٣/١٣.

تــەواو خۆیــان کردۆتــە عــەرەب و بــەڕەوانی بەعــەرەبی قســە دەکــەن. ســاڵی ٤٥٠ ئەبولحارس ئەرسەلانی بەساسیری بەناوی خەلیفە موستەنسـیربیلای فاتیمیـەوە بەشـی ڕۆژئاوای بەغدادی داگیرکرد، لەمزگـەوتی مەنسـوردا خوتبـە بـەناوی خەلیفـەی فـاتیمی خوێنرایەوە، خوتبە خوێن و بانگ دەر جلی سـپیان لەبـەردەکرد، کـەدروشمی تایبـەتی فـاتیمی بـوو، (حـی علـی خـیر العمـل)یش خرایـە سـەر بـانگ. بەساسـیر و گاوانیـەکان پەیوەنیان هەبوو بەڵام هۆزی گاوان وەکو کوردەکـانی دیکـە شـافیعی مەزهـەب بـوون. بەساسیری دوای ئەوەی بەغـدادی گـرت لەسـاڵی ٤٥١ کۆچـی بـەرەو واسـیت ڕۆیشـت و نیازی وابوو بەرە و ئەهواز بچـێت هێزێکـی زۆری لەگـەڵ بـوو لـەکورد، تـورك، عـەرەب، دیلەم، بەڵام بەساسـیری لەمەیـدانی شـەڕدا کـوژرا، ئەبولفـەتحی کـوڕی وارامـی گـاوانی بەدیل گیرا بەڵام سەردارەکەی لەشکری توغروڵ بەگ ئازادی کـرد، دواتـر گاوانیـەکان و ئەسەدیەکان خۆیان خستە ژێردالّدەی توغروڵ بەگ، سوێند دران هەمیشـە فەرمانبـەر و گوێ لەمستی سولّتان بن وە خەڵاتیش کران، ئیتر لەو کاتەوە هـۆزی گـاوان و ئـەمیرانی بنەماڵەی وەرام بوونە یاریدەری خەلافەتی عەباسی و بۆگەشەپێدانی وڵات تێدەکۆشان. زۆرینەی گاوانیـەکان لەوکاتـەدا لەبـەری ڕۆژئـاوای دیجلـە بەرامبـەری ڕێگـای خۆراسـان دەژیان، لەوکاتەدا بەلەدرووزیان بەدەستەوە بوو .

ساڵی ٤٥٥ کۆچی تۆغروڵ بـەگ لـەڕەی کۆچـی دوایـی کـرد، عەرەبـەکان لەدەوروبـەری شاری بەغداد دەستیان کرد بەشرەخۆری و خەڵك ڕووتاندنەوە، خەلیفە قائیم بیئـەمریلا بۆ ئەمیرە کورد و عەرەبەکانی لایەنگری خۆی نامەی نوسی داوای لێکردن بێنـە بەغـداد لەگەڵی کۆببنەوە بۆ ئەوەی دەربارەی وڵات و کاروبـار و ڕوداوەکـان چـارەیەك بـۆ ئـەم دۆخە بدۆزنەوە، ئەمیر ئەبولفەتحی کوڕی وەرام و ئەبونەجمی کوڕی وەرامی گاوانی بـە هێزێکی زۆرەوە هاتنە بەغداد لای ڕۆژهەڵاتی شارەوە لەپشت ماڵی خەلیفەوە دامەزران، ئەو جێگەیە ئێستا بازاڕی شۆریجەی لەت کردووە، پێشووتر ئـەو شـوێنە هـەموو بـاخ و باخات و جۆگە و جۆبار بووە. ئـەمیرە عەرەبـە دۆسـتەکانی بـریتی بـوون لە(موسـلیمی کوڕی قورەیشی عوقەیلی، دەبیسی کوڕی عەلی مەزیدی) هەموویان کاربەدەستی وڵات

بوون، خەلیفە داوای لێکردن گیر نەبن و زوو بێنە بەغداد و لەگەڵی کۆببنەوە، بەڵام دەبیسی مەزیدی دواکەوت و لەبەغدادیش وا بڵاو بوویەوە موسلیمی کوڕی قورەیشی عوقەیلی نیازی وایە بدات بەسەر بەغداد و داگیری بکات، بەو هەواڵە خەڵکی بەغداد پەرێشان بوون و ترسێکی زۆریان لێ نیشت، کۆبوونەوە لەنێوان خەلیفە و ئەمیرە گاوانیەکان کۆتایی هات و بڕیاریان دا شاری بەغداد بپارێزن لەتالآن کەر، پاشان موسلیم نامەیەکی بۆ خەلیفە نوسی و پاکانەی خۆی تێدا کرد و ئەو دەنگوباسەی بەدرۆخستەوە، بەڵام خەلیفە گوێی بەو پاکانەیە نەدا، پاشان ئەمیر ئەبولفەتحی کوڕی وەرامی گاوانی لەشاری بەغداد کۆچی دوای کرد و تەرمەکەیان بردەوە بۆ (جرجرایا) شوێنێکە نزیکی شاری (کووت)ە لەوێ بەخاکیان سپارد، لەسونگەی زیرەکی لێهاتووی ئەم میرەوە هۆزی گاوان زیاتر ناسرا، د.مستەفا جەواد دەڵێت: وام بۆ دەردەکەوێ لەپاش مەرگی ئەبولفەتح کوڕی وەرام، مەزنایەتی هۆزی گاوان دراوە بەئەبونەجمی برای. لەسەردەمی ئەمیر وەرام کوڕی ئەبوفەڕاس زۆرێك لەگاوانیەکانماڵیان بارکردووە و هاتوونەتە (جامعین) نزیکی بابل، ماوەیەکی زۆر خەلیفەکانی عەباسی بوونە شافیعی مەزهەب لەگەڵ گاوانیەکان یەکیان گرتبوو، لەو کاتەدا ئەمیر موهەلهەل کوڕی عەسکەری گاوانی مەزنایەتی حیلەی دەکرد، یەکێکی تر لەئەمیرەکانی هۆزی گاوان ئەمیر سەیفودەولە ئەبو نەجم بەدر کوڕی وەرامی کوردی گاوانی لە(گاسفونج) دادەنیشت، کە گوندێکی گەورە بوو لەبەرامبەر نوعمانیە لەنێوان بەغداد و واست لەرۆژهەڵاتی دیجلە هەڵکەوتبوو، ئەم ئەمیرە لەساڵی ٤٧٢کۆچی کۆچی کردووە، ئەمیر سەیفودەولە برایەکی هەبووە ناوی شەرەفودەولە کوڕی وەرام بووە و لەواست فێرگەیەکی ئایینی بۆ شافیعی مەزهەبەکان دروستکردووە و زۆر کەس لەم خوێندنگەیەوە پێگەیشتن. لەپاش رۆژگاری خەلافەتی عەباسی د.مستەفا جەواد دەڵێت ئەمیرایەتی هۆزی گاوانیش کۆتایی هات، ئەوەندەی بەکتێبەکانی مێژوودا ڕوانیومە چاوم بەناوی ئەمیرێکی هۆزی گاوان نەکەوتووە، وا دەردەکەوێت خۆیان کردبێتە عەرەب و لەگەڵ عەرەبەکانی ناوچەکانی فوراتی ناوەڕاست تێکەڵاو بوون و لەبیر

چووبنەوە، بەڵام گەڕەکەیان تائێستاش هەر بەناوی کوردەوە ماوەو نەگۆڕاوە[٩] . وەك دەردەکەوێت گاوانیەکان ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر گاوانی کوردی(ئەبو بەسیر) ،ئەبوبەسیر لەقۆناغی نهێنی دا شاری مەکە بەشدار دەبێت ابن ایسحاق دەڵێت لەمەکەدا خرایە بەندیخانەوە، دواتر قورەیش ڕێیان لێگرت کۆچ بکات بۆ مەدینە، بەڵام دواتر خۆی دەرباز کرد و گەیشتە مەدینە، کەدەگاتە مەدینە زۆرنیە موسڵمانان ڕێکەوتننامەی حودەیبەیان لەگەڵ قورەیش مۆرکردووە، ئەبوبەسیر بەنهێنی ڕوو لەشاری مەدینە دەکات، بێباوەڕانی قوریش دووکەس بەنامەوە دەنێرن هەتا بیهێنێتەوە، چونکە بێ پرس ڕای کردووە. پێغمبەری خوا (د.خ) بانگی ئەبوبەسیری کرد و فەرمووی خۆت دەزانی ئێمە پەیمانمان مۆرکردووە، ناتوانین غەدر بکەین بگەڕێرەوە بۆ مەکە، هیوادارم خوا دەروتان لێ بکاتەوە، ئەبو بەسیر گوێڕایەڵ بوو لەگەڵیان ڕۆیشت، موسڵمانان زۆر نارەحەت بوون، دەگریان بۆ پاشە ڕۆژی ئەبو بەسیر، کاتێك دەگەنە ناوچەی (ذوالحليفة) ئەبو بەسیر شتێك هات بەخەیاڵیدا بە بت پەرستەکانی ووت من ماندوو بووم با دانیشین و نان بخۆین، مامۆستا پارەزانی دەڵێ بەکابرای عامری ووت کامەیە ئەم شمشێرەی تۆ بزانم تیژە، بەرزی کردەوە و کوردانە عامری کوشت، ئەوی تریان بەهەناسە بڕکێ ڕایکرد بۆمەدینە چووە مزگەوت پێغمبەر(د.خ) کەبینی فەرمووی ئائەوە ترساوە بزانن چیە، پاشانیش ئەبوبەسیر بەپەلە خۆی کرد بەژووردا و شمشێری خوێناوی بەدەستەوە بووکەپێغمبەر (د.خ)بینی فەرمووی دایك نەیبینێ ئەمە ئەگەر هاوڕێی هەبوایە جەنگی هەڵدەگیرساند، وا دیار بوو کارەکەی پێخۆش بوو.

گاوانی کوردی(ئەبوبەسیر) فەرمووی ئەی پێغمبەری خودا تۆ پەیمانی خۆتت جێ بە جێ کرد و منیش ئاینم ڕێم نادات کە توشی خراپەم بکەن و یاریم پێ بکەن) . ئەبوبەسیر سەرنجی دا کەنابێت لەمەدینە دانیشێ، خۆ لەمەکەش ناتوانێت بژێت لەگەڵ پێنج کەسی تردا کەئەو ڕۆژە لەمەکەوە ڕایان کردبوو، ڕۆیشتن تاگەیشتنە جێگایەك

---

[٩] د.مستەفا جەواد: پوختەیەك لەکتێبی هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانیە بەناوبانگەکان، و هەژار موکریانی، چ٢، ٢٠٠٨ ،و هیتد....

بەناوی (ئەلعیسی) لەکەناری دەریا و لەسەر ڕێگای شام، ئەبووبەسیر چووە سەر ئەو ڕێگایەو هەر کاروانێ قورەیش بهاتایە دەیکوشت و تالآنی دەکردن. پاشان ئەبوجەندەل یش هەڵهات و هەتا ژمارەیان بووبە حەفتا کەس، ئەبوبەسیر بووە فەرماندەیان، قورەیش زۆر ترسان شەوێك بدەن بەسەر مەکەدا بۆیە ناچار دەبن داوای لابردنی ئەو بەندە بکەن، موسڵمانان ڕازی بوون بەلابردنی ئەو بەندە، ئەبوسوفیان بەخۆی ڕۆیشتبوو بەتکاو پاڕانەوەیەکی زۆر ئەو بەندەیان لابردبوو. پاشان پێغمبەر(د.خ) نامەیەکی بۆ ئەبوبەسیر نوسی و داوای لێی کرد، ئازاری کەس نەدەن و ئەو بەندەمان لابردووە، بۆ ئەبوبەسیر هەیە لەهەر کوێ خۆی پێی خۆشە دابنیشێ، کاتێك نامەکە گەیشتە ئەبوبەسیر لەکاتی نەخۆشیدا بوو، نامەکەی خوێندەوە و خستیە سەر سنگی و گیانی سپارد ئەبوبەسیر لەچیاکانی کوردستان لەدایك بوو، دوای ئەو هەموو تاو و توێیەی بیابان لاشەی بەچیای حیجازەوە ئەسپەردەکرا، لەچیاوە بۆ چیا .ئەو سەرکردە کوردە بوو ئەو بەندەی ڕێکەوتنامەکەی هەڵوەشاندەوە و خوای گەورە ئایەتی دابەزاند، ڕوون نیە پاش وەفاتی جابانی کوردی و ماڵ و منداڵی و خێزانی مەیمون نەگەڕابنەوە کوردستان، بەڵام پێدەچێت ئەوان گەڕابنەوە کوردستان و بەهۆی ئەوان کورد شەڕی سوپای ئیسلامی نەکردووە و دەسەلأتیان پێدراوەتەوە لە ناوچەکانی خۆیان[10]. هەندێك لەمێژوونوسان پێیان وایە هۆزی جاف نەوە و پاشماوەی هۆزی گاوانن بەوەی گاوان بووە بەجاوان لەبەرئەوەی لەعەرەبی دا پیتی (گ) نیە بووە بەجاوان و پاشان بەتێپەڕ بوونی کات بووە بەجافان پاشان جاف، بەڵام هیچ بەڵگەیەك نیە ئەمە بسەلمێنی تەنها ڕاو بۆچوون و گریمانەیە، خوسرەو جاف دەڵێت: لەساڵی ١٩٨٧ ئەنجومەنی ئەدیبانی شاری (حلە) دەعوەتیان کردم، کۆڕێکی ئەدەبی شیعر خوێندنەوەیان بۆ گێرام، تا دەربارەی شیعر و ڕۆمان و هونەری میعماری بدوێم، هەر لەسەرەتای دەست پێکردنەکەمدا دەستم کرد بەسلاو ناردن بۆ ڕۆحیانەتی باب و باپیرانم کە لەشاری حلەدا نێژراون و خوێنیان لەپێناوی ئەم شارەدا ڕشتووە،

---

[10] حەسەن مەحمود حەمەکەریم: کابانی کوردی، چ٣، ١٩٩٨، ل١٧–٢١ .

دانیشتووان بەسەر سامیەوە ووتەکانیان وەرگرت تا ووتم: براینە هیچ جێگای سەرسامی نیە، ئەوانەی ئاگاداری مێژووی شاری حلـەن بـەوردی دەزانـن هـۆزی گـاوان (جـاوان) و بەنی ئەسەد لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا ئەم شـارەیان دروسـتکردووە و مـن لەنـەوە و نەتیجەی ئەو جاوانیانەم، ئەگەر چی درەنگە بەلاَم وا دەبینن گەڕاومەتەوە شاری باب و باپیرانم، دانیشـتوان هـەمووی بەچـەپڵەڕێزانەوە هەسـتانە سـەرپێو و بڕیـاڕ درا لـەدوای کۆڕەکە خەڵکەکە لەگەڵما بـێن و بـڕۆین بـۆ سـەر مـەزاری شـێخ (وەرام) کەمەزارەکـەی لەگەڕەکێکی کۆنی نـاو شـاری (حلـە) دایـە، پاشـان لەگـەڵ خەڵکەکـە ڕۆیشـتینە سـەر مـەزراری شـێخ (وەرام)ی گـاوانی، لەوێـدا بـەڵێنم دا مەزارەکـەی نۆژەنـد بکەمـەوە و بەشێوەیەکی سەردەمیانە سازی بکەمەوە، ئاسن و شیش و چیمەنتۆم هەڵڕشـت و یـەك هەفتە دەستم بەئیش کرد و ڕژێمی بەعس کارەکەیان پێڕاگرتم و سوکە گۆبەندێکیان بۆ دروستکردم، سەرنجام سەرکارم چۆڵ کرد بۆ یەکێکی تر ئەو کەسە کام کـوردە و کـەی ئەو دەبێت؟ نازانم[11] . مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی دەڵێت: لەفەرهەنگە فارسـی یـەکانی ئێران ناوی چەند دێهاتێکم بەرچـاوکەوت کەلـەهۆزی جاوانی(گـاوانی) کـۆن بـوون، وەك (جابـان، ئـاب سـەد، ئایینـەوەرزان، سـەربەندان، میهرئابـاد، سـورخەدێ) بەتێکـەڵی لـەفارس نیشـتەجێن. جگـە لـەم گوندانـە لەدەوروبـەری ئەسـفەهان و جێـی تـریش زۆر بنەماڵەی گاوانی(جاوانی) پـەرت و بـڵاون، تەنانـەت چـوومە سـەردانی هەنـدێك گونـدی جاوان و لەگەڵ خەڵکەکەی ئاشنا بووم، شێوەزاریان کرمـانجی ژووروو بـوو. مەسـعودی لەمەوج الذهب و التنبیة و الاشراف دا نووسیوێتی جاوان لەهۆزە کوردەکانی چیایە[12] .

---

[11] خوسرەو جاف: مێژووی جاف ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی– هەولێر ، ٢٠١٣، ل٣٤.

***ئەلمسعودی ناوی تـەواوی علـی بـن حوسـێن بـن علـی بـن حەسـەن المسـعودیە، خـەڵکی ولاَتـی مەغریب بووە لە ساڵی ٣٤٦کۆچی و ٩٥٦زاینی مردووە ، خاوەنی چەندین بەرهەمی جۆراو جۆرە ، وەك کەسێکی شارەزاو مێژوو نوسێکی بەناوبانگ ئاماژەی بە هۆزی گاوانی داوە .**

[12] د.مستەفا جەواد: عێلی جاوان عێلی لەبیربراوە و ناودارانی لەبیرنەماو، و م جەمیل ڕۆژبـەیانی، چ١، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٨–١٢.

بەشەکانی تر ئەم هۆزە کەبەپاشماوەی جەنگ دادەنرێت دابەش بوونە بەسەر ناوچە جیاوازەکانی کوردستانی گەورەدا، تائێستاش هەر لەو ناوچانە جێگیرن و ماونەتەوە، بوونیان بەشێوەیەکی بەرچاو هەیە بەقەبارە و ژمارەی جیاواز لەوانە: لەباشوری کوردستان لەناوچەکانی کەرکوك و گەرمیان وەك: دوزخورماتوو، داقوق و چەند گوندێکی دەوروبەری. لەدەڤەری بادینان وەك ئاکرێ و لەچەند گوندێك نیشتەجێن لەوانە گوندی دووگوندان و گوندی مام خەلیفە، لەهەولێر لەناوچەی زرارەتی و گوندی کاوانیان لەشەقلاوە، کاوانیەکانی شەقلاوە یەکێکن لەناوچە کاریگەرەکانی سەرەتای شۆڕشی ڕزگاریخوازی کورد خاوەنی چەندان شەهیدی قارەمانن وەك (حەمید کاوانی، مەحمود کاوانی)، هەروەها بەشێکی زۆری گاوانیەکان(کاوانی) لەگەڵ دروستبوونی شاری سلێمانی هاتوون لەسلێمانی و دەوروبەری نیشتەجێ بوونە وەك گوندەکانی (کانی جنە، کانی بناو، تەپەڕەش، قازان، کانی بەردینە، کانی پان، بالجوغ، کۆسەی جەم، ناوچەی بەکرەجۆ).



ئەم هۆزە لە٢٠١٦/٤/٢٨ ڤیستیڤاڵێکی گەورەیان سازکرد لەژێرناوی کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی هۆزی گاوانی بەشێوەیەکی سەردەمیانە کەلەگەڵ باری کوردستاندا بگونجێت کەسەرجەم خزمانی گاوانی کوردستانی باشور تێدا بەشدار بوون .

هەروەها لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی عوسمانی بەشێکیان کۆچیان کردووە و بەرەو ناوچەکانی کوردستانی باکور و لەناوچەکانی نزیك شاری وان نیشتەجێ بوونە، لەڕۆژهەڵاتی کوردستان لەگوندەکانی (بڵەسەن، هەرگێنە)ی سەربە شاری بانە نیشتەجێ بوونەو بەشێکی تریان لەدەوروبەری تاران نیشتەجێن لەسەرەوە ئاماژەمان

پێی داوە. بەشێکیشیان کەوتوونەتە ڕۆژئاوای کوردستان مامۆستا هەژار موکریانی ئاماژەی بۆکردوون لەکتێبی چێشتی مجێور[١٣].ئەم هۆزە ئێستا لەلایەن ئەحمەد حاجی غەفورەوە سەرۆکایەتی دەکرێت. ئەم هۆزە لەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کوردا بەشداری کارایان هەبووە، هەمیشە لەبەرەی گەل بوون، کەهەر لەکۆماری کوردستان و شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان دەوریان هەبووە، یەکەم شەهیدی پێشمەرگە لەپشتی چیای ئەزمەڕ شەهید (مەحمود کاوانی) بوو، دواتر شەهید (حەمید کاوانی) بووە لەشۆڕشی ئەیلول، پاشان لەشۆڕشی نوێ بەشداری کاریان دەبێت دەیان شەهید لەو پێناوە دەبەخشنە نیشتمان[١٤].



مەحمود حمد عەلی کاوانی — (١٩٢٦–١٩٦٢)شەهید کراوە



حەمید کاوانی — ١٩٦٨ شەهید کراوە



ئەحمەد حاجی غەفور
براگەورەی هۆزی کاوانی



وێنەی کۆمەڵێك لەکەسایەتی هۆزی کاوانی



وێنەی کۆمەڵێك لەکەسایەتی هۆزی کاوانی

---

[١٣] ئەحمەد حاجی غەفور کاوانی: دەستنوس، سلێمانی، ٢٠١٩/٣/١٣.

[١٤] دەستنوسی حەمەخان حمە ئەحمەد کاوانی: دەستنوس، سلێمانی، ٢٠١٩/٣/١٣.

## هۆزی بۆتان :

هۆزێکی گەورە و کۆنی کوردە، لەسەرچاوەکان دا ناویان بە بۆتی یان بووختی هاتووە، جەزیرەی ئبن عومەر یان جەزیرەی بۆتان و دەوروبەری شوێنی ئەم هۆزەی کوردە، بەپێی نوسراوەکانی (شهاب ئەلدین ئەلعومەری) مێژووی نوسی عەرەب، لەسەدەی چواردەی زاینی ڕکەبەرایەتی لەگەڵ هۆزی بەتوانا و بەهێزی حەمیدی کردووە، شەرەفخانی بەدلیس هەندێك جار هۆزی بۆتانی وەك هۆزەکانی بۆتان ناو دەبات، بۆتانیەکان وەك هۆزێکی یەکگرتوو هەڵدەسەنگێنێ، وشەکانی مێژوونوس پڕە لەفەخر شانازی، بۆتانیەکان بەپیاوەتی و بوێری سەربازی بەتایبەت لەئەسپ سواری دا بەناوبانگ بوون، بۆتانیەکان لەشەڕەکانیاندا بەچەکی گرانبەها، ئەسپی عەرەبی، شمشێری میسری، خەنجێری دیمەشقی شەڕیان دەکرد، لەڕۆژی تەنگانەدا لەبەرامبەر دووژمن دا لەڕیزێکی یەکگرتوو و پتەودا بەبێ سڵکردن ڕاوەستاون .

ئازایی و گەورەیی و هۆزی بۆتان هەلی مەزنبوون دەڕەخسێنێ بۆ بنەماڵەیەك کە دەبنە خانەدانێکی بەناوبانگی کوردستان و نمونەی کوردایەتی، کە بەخانەدانی بەدرخانیەکان ناوبانگ دەردەکەن . شەرەفخان دەڵێت : خانەدانانی میرەکان بەپشتیوانی هۆزی بۆتان توانیان قورسایی سیاسی خۆیان زیاتر بکەن و ببنە خانەدانێکی مەزن و بەتوانا .لەکاتی هاتنە سەرکاری حەسەن بەگی ئاق قۆینلوو(ئۆزۆن حەسەن) لەساڵی ١٤٥٣- ١٤٨٧ هۆزی بۆتان سەربەخۆی بەئاشکرا ڕاگەیاند لەبەرامبەر فشاری حەسەن بەگدا بەرگری هەمە لایەنەی کرد، لەئاکامدا بۆتان لەلایەن تورکەکانی ئاق قۆینلوو داگیر کرا، شەرەفخان دەڵی بۆتان و جەزیرە بۆماوەی سی ساڵ دەکەوێتە ژێر دەسەلاّتی ئاق قۆینلوو . شەرەفخان دەڵێت بەشی هەرە زۆری بەگزادەکانی هۆزی بۆتان دەکوژرێن، خانەدانی دەسەلاّتدار و خودی میری بۆتان، دەست و پێیان زنجیر دەکرێت و دەخرێنە بەندیخانە، هۆزی بۆتان پرش و بلاّو دەبنەوە، بەلاّم پاش کۆتای دەسەلاّتی ئاق قۆینلو میر شەرف سەرۆکایەتی هۆزی بۆتان دەکات و بۆتانیەکان لەژێر ئالاّی خۆی کۆدەکاتەوە، میر شەرەف کوڕی میر بەدر بەپشتوانی هێز و توانا کۆکراوەکەی هۆزی

بۆتان توانیان ناوچەکەیان ڕزگار بکات و لەکۆتای سەدەی پازدە دەبێتە دەسەلأتێکی سەربەخۆ، بەلأم مام و براکانی میر شەرەف لەزیندان بوون، شا ئیسماعیلی سەفەوی (١٥٠١–١٥٢٤) دوای ئەوەی هێرش دەباتە سەر ئاق قۆینلوو دەست بەسەر ناوچەکانی کورد دەگرێت وەك موسلٚ، دیاربەکر، شەنگار، هێزەکانی ڕەوانەی جەزیرە دەکات لەنێوان هێزەکانی قزلٚباش و هۆزی بۆتان شەڕ و پێکدادنێکی زۆر ڕوویدا، شەرەفخانی بەدلیسی دەلٚێت لەتەواوی ئەو شەڕانەدا میر شەرەف و بۆتانیەکان سەرکەوتن بەدەست دەهێنن، لەیەکێ لەشەڕەکان قزلباشەکان هەزار و حەفتا کەسیان لێدەکوژرێت و ژمارەیەکی زۆریان لێ بەدیل دەگیرێت . شەرەفخان دەلٚێت : عەلی بەگ جێ نیشنی میر شەرەف لەگەلٚ سی لەمیرەکانی تری کورد چوون بۆ دیداری شائیسماعیل، بۆ ئەوەی ئامادەی خۆیان بۆ خزمەتکردن بەشای سەفەوی ڕابگەیەنن، بەلأم بەفرمانی شا دەست بەسەر دەکرێن و دەخرێنە زیندانەوە، ناوچەکانی ژێر دەسەلأتیان پێشکەش بەپیاوەکانی شا دەکرێت، عەلی بەگ پاش ئازاد بوونی لەزیندان هێرش دەباتە سەر سوپای قزلٚباش و نوێنەری شا لەدەسەلأت لادەبات و دەست بەسەری دەکات، پاشان لەگەلٚ میری بەدلیس لەسەربنەمای برایەتی و یەکێتی پێکدێن، ئیتر لەوەبەداوە عەلی بەگ سیاسەتی خۆی بەئاراستەی سولٚتانی عوسمانی تورك دەبردەپێش. لەلایەن میری بۆتانەوە بەناوی برایەتیەوە، بەردەوام دەست تێوەردان لەکاروباری میرنیشنی بەدلیس کراوە، پێداگری بۆتانیەکان لەپێناوی ئەو مافەدا بووەتە هۆکاری ناکۆکی و پێکدادانی بەردەوام لەنێوان هۆزەکانی بۆتان و ڕۆژەکی، دەستێوەردان لەکاروباری تەختی دەسەلأتی میرنیشین لەبەدلیس، بەردەوام هۆزی بۆتانی تووشی شەڕ و کێشە کردووە لەگەلٚ هۆزی ڕۆژەکی [١٥] .

---

[١٥] یەڤگێ ئیلی نیچنا ڤاسیلی یەڤا: هۆزەکانی کورد لەڕوانگەی مێژوو نووسانی کورد، و مەسنور سدقی، ٢٠١٦،ل١٥–٢١ .

## هۆزی کەڵهوڕ :

هۆزی کەڵهوڕ لەگەورەترین هۆزەکانی کورد بووە لەکرماشان زیاتر لەدوازدە هەزار خێزان بوون، لەمێژەوە فەرمانداری ئەم هۆزە و سەرۆکایەتی هێزەکانی بەدەست بنەماڵەی حاجی زادەکان یان بنەماڵەی محەمەد عەلی خانەوە بووە کەخوشکە زای حاجی زادەکان بوو، پاش دە ساڵ (عەلائوئەلدەولە) ئێلخانی بەداود خان سپارد، داود خان کوێخای تیرەی خاڵدی کەڵهوڕی بوو دەسەلاتێکی زۆری بەدەست هێنا، تاساڵی ١٨٣٠ زۆربەی کەڵهوڕ لەسەر ڕێبازی عەلی ئیلاهی بوون، بەلاّم لەسەرەتای ساڵی (١٩٠٠)ەکاندا کاتێك ڕۆڵی گرنگیان گێڕا، هەموویان ڕێبازی خۆیان گۆڕی بوون بەشیعە، لەدەیەی یەکەمی سەدەی بیستەم داود خانی کەڵهوڕ ناوبانگی بەڕێگری دەرکردبوو، کە ناودارترین سەرۆکی کەڵهوڕ بووە، دواد خان کاتێك مرد کوڕە گەورەکەیی و کوڕەزاکانی لەسەر سەرۆکایەتی هۆزی کەڵهوڕ بووە ململانێیان و سامانی هۆزەکەیان بەفیڕۆدا . هۆزی کەڵهوڕ بەدیالێکتی کوردی باشوری دەدوێن، نزیکترین زارەیە لەدیالێکتی کوردی ناوەندی کەناوەڕۆکی زمانی یەکگرتووی کوردیە[١٦].

هونەرەکانی هۆرە و گۆرانی کاریگەرترین هۆکاری پاراستن و زیندو ڕاگرتنی زاراوەی کەڵهوڕین کەیەکێکە لەزارە سەرەکیەکانی زمانی کوردی، بەپێی توێژینەوەیەکی زانکۆی هارڤاردی ئەمەریکی کەڵهوڕ گەورەترین هۆزی کوردە، ئەم هۆزە دوای هۆزی قەشقایی بەڕەگەز تورك بەدووەم گەورەترین هۆزی نێو گەلانی ئێران دادەنرێت، نیشتیمانی سەرەکی کەڵهوڕ ڕۆژهەلاّتی کوردستانە، بەتایبەت پارێزگای کرماشان و ئیلام .

کرماشانەکەم هەی خاکی زێڕین

هاوزاراوەکەی بەدرە و خانەقین

بەلاّم ئێستا هۆزێکی پەرتەوازەن لەشارەکانی سنە، سلێمانی، گەرمیان، خانەقین، هەڵەبجە، کەرکوك، هەولێر،هەمەدان، ئورمیە، شیراز، قەزوین، مازندەران، یەزد، تاران، خۆراسان، بەشێکی زۆری باکوری ئێران، بەغداد، ناوچەی سەند لەپاکستان، باکوری

---

[١٦] عەلی ڕەزا گۆدەرزی: ئێلی کەڵهوڕ لەسەردەمی مەشرووتە، و محسن بنی وەیس،٢٠١٣، ل٢٦ .

خۆرئاوای ئەفغانستان، بەشێك لەولأتی ئیسرائیل نیشتەجێن. هۆزی کەڵهوڕ لەشوێنی خۆیان دا لەڕۆژهەلأتی کوردستان بەکشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریك بوون، بەلأم ئەو گۆڕانکارییەی کەلەسەردەمی شای ئێران دا لەسیستەمی کشتوکاڵ کرا، بەشێکی زۆری ئەو هۆزەی بەرەو باشوری کوردستان و شاری بەغداد تۆران. کەلتور و داب و نەریتی ئەم هۆزە هەمیشە جێگای سەرنج بووە، پێگەی ژن لەم هۆزە بەرز بووە، قەدەم خێر یەکێك لەدیارترین ژنە سیاسی و کۆمەلأیەتیەکانی کەڵهوڕ بووە، تا ئێستاش ژنانی کەڵهوڕ لەسوارچاکێتی و تفەنگچێتی بەناوبانگن .

ئەو پەرتەوازیەی هۆزی کەڵهوڕ کاریگەری نەرێنی لەسەر پاراستنی کەلتور و زاراوەکەیان دروستکردووە، ئەو بەشەی لەباشوری کوردستان دەژین جگە لە دانیشتوانی قەزای خانەقین بەشی زۆریان ناتوانن بەزارەکەی خۆیان بدوێن، کەلتور و جل و بەرگیشیان هەمان کەلتوری دانیشتوانی هەرێمی کوردستانە، لەڕۆژهەلأت و شارەکانی تریش کەوتوونەتە ژێر کاریگەری زمانی فارسی و عەرەبی زمانی ئەو گەلانەی کە لەولأتەکانیان دەژین، بۆیە ئێستا سالأنە خێزانەکانی ئەو هۆزە کۆدەبنەوە بۆ یەکتر ناسینەوە و زیندو ڕاگرتنی نەریتەکانی خۆیان، لەهیچ بەشێکی کوردستان خوێندن و نوسین بەزاراوەی کەڵهوڕی یان لوڕی بوونی نیە، ئەوەی هۆکاری پاراستنی ئەو زاراوە بووە تائێستا هەندێك لەدیوانی شاعیران و ژمارەیەك کتێبی کەمن، بەلأم لەڕووی هونەرییەوە هونەرمەندانی لوڕ و کەڵهوڕ ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە و هەیە لەپاراستنی زاراوەکەیان دا بەجۆرێك کەچەندین هونەرمەندی تر کورد بەهەمان زاراوەی کەڵهوریەکان گۆرانیەکانی ئەوانیات وتووەتەوە[17] . دەربارەی ناوی هۆزی کەڵهوڕ چەند بۆچوونێك هەیە بەم شێوەیە: مامۆستا هەژار موکریانی لەپەراوێزی شەرەفنامەدا نووسیویەتی کەڵهوڕ دەچنەوە سەر کلأهوڕ کەیەکێك بووە لەپاڵەوانەکانی حوکمڕانی مازیندەران لەسەردەمی ژیانی (کیکاوس) دا. مامۆستا ئەمین زەکی بەگ لە خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان دا نووسیویەتی کەڵهوڕەکان خۆیان زۆر بەڕەگدار

---

[17] کەناڵی ئاسمانی NRT : لەپەیام نێرانەوە، ڕۆڵی هونەر لەپاراستنی شێوەزاری هۆزی کەڵهوردا، ٢٠١٧.

دەزانن، پێیان وایە لەنەوەی (ڕەهام)ن، ڕەهام ئەو سەرکردە بووە کە بەفەرمانی (بەهمەنی کەیانی) لەشکری بردۆتە سەر (شام و میسر)[۱۸]. کەڵهوڕ ووشەیەکی لێکدراوە لەدوو وشە پێك دێت (کەڵ) و (هوڕ یا هر)، ئەم وشەیە بەچەند شێوەیەك دەردەبڕێت وەك کەڵهوڕ، کەڵهڕ، کەڵڕ، کەڵ بەواتای ئاسکە کێوی نێردێت و لەتایبەتمەندی ئەم ئاژەڵە بوێری و خۆڕاگرانە چوست و چالاکی و توندڕەوییە، هوڕ یا هر لەفەرهەنگەکاندا بەواتای خۆر، هەتاو دێت، لەتایبەتمەندی خۆر توندی و دروشاوەیە . ئەگەر بەدوای لایەنە لێکچووەکانی ئەم دووشەیە کەڵ و هوڕ بگەڕێین، دەبێ تەماشایەکی ژینگە و قەڵەمڕەوی ئەم هۆزەدا بکەین، ئەومان بۆدەردەکەوێ خەڵکی ئەم هۆزەبەدرێژایی مێژوو لەگەڵ سەختی و نالەباری ناوچەکەدا دەست و پەنجەیان نەرم کردووە، وەك ئاسکی کێوی ژیاون و خۆیان لەگەڵ سەختی ناوچەکە ڕاهێناوە و بەرگریان لەخاکی خۆیان کردووە، بەشێکی دی لەو بڕوایەدان کەڵهوڕیەکان لەنەژادی ئاری ڕەسەنن، ئەم خەڵکە بەهۆی ڕوخساری گەش و هەروەها خێرایی بەسەر شاخە سەختەکان شوبهێنراون بەخۆر کەسەرچاوەی سەرنج ڕاکێشانە .

سنوری باکوری هۆزی کەڵهوڕ هۆزەکانی کرند و گۆران بان زەردیە، سنوری باشوری پێشتکۆیە، سنوری ڕۆژئاوای خانەقین و مەندەلی، هەروەها گەرمیانی هۆزی سەنجاوی و هۆزی کرند کە مایەشت یا ماددەشت، سنوری ڕۆژهەلاتی کوێستانی هۆزی زەنگنە و لەگەڵ کوێستانی بەشێك لەهۆزی سنجاوی کە ماهیدەشت و کرماشانە. ئەم هۆزە نیشتەجێی شارەکانی (گەیلان غەرب، هاروون ئاوا) و بەشێك لە(کرند، نەفتشار، سۆمار، گاوەرە، ئەیوان، مایەشت، دێی قەلاشاین لەسەرپێڵ زەهاو، نەسرئاباد ی قەسری شیرین) نیشتەجێن .ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی کرماشان لەهۆزی کەڵهوڕن .

زۆربەی کەڵهوڕیەکان لەو شوێنانە ژیانیان بەئاژەڵ بەخێوکردن بەڕێوەدەچێت، بۆ دابینکردنی لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانیان لەوەرزەکانی ساڵ هەمیشە خەریکی کۆچ و شوێن گۆڕینن. ئەم کۆچکردنە هەندێك جار بووەتە هۆکاری بەرپابوونی ناکۆکی و ئاژاوەی

---

[۱۸] ئەیوب ڕۆستەم : هەگبە و هەوارگە، چ۱ ، ۲۰۰۳ ،ل ۹۰-۹۲.

نێوان ئەم هۆزە و هۆزەکانی دیکە، لەسنوری دیاریکردنی گەرمیان و کوێستانی هۆزە شاخاویە سەرکەشەکانی قەلاچە لەباکوری شاری گەیلان و دەوربەری دەکرێ بەسنور دابنرێت، باشوری ئەم شاخە گەرمیان و باکوری کوێستانی هۆزی کەڵهوڕە. بەشێك لەم هۆزە نیشتەجێن و کۆچەرنین و خەریکی کشتوکاڵن و بەشێوەیەکی کەم ئاژەڵ بەخێودەکەن .ئەولسەن گولستان دەنوسێ: نادرشای ئەفشار (١١٤٨-١١٦٨) لەترسی سەرکێشی کردنی کەڵهوڕ ژمارەیەکی زۆری دەشتەکیەکانی میشمەست و تورکمانی خۆراسانی هێنا و لەقەلای کرماشان نیشتەجێکردن، کەجەنگاوەری پیادە و سوارەی زەنگنە و گۆران بوون، ئەمانە لەقەلاکە نیشتەجێ بوون و ڕووبەڕوی ناڕەزایی نەجەف قولی خان سەرۆك هۆزی کەڵهوڕ بوونەوە، لەئەنجام دا نادرشا فەرمانی هەڵکۆڵینی چاوی نەجەف قولیخانی داو میلیان بەچاویدا کێشا، پاش مەرگی نەجەف قولیخان نادرشا بەهەمان دەستور چاوی خانیخانانی کەڵهوری هەڵکۆڵی، عەلی خان شوێنی خانیخانانی کەڵهوری گرتەوە، لەگەڵ کوشتنی نادرشا هۆزەکانی کەڵهوڕ و زەنگنە سودیان لەو هەراو ئاژاوە ئالۆزیەی بارودۆخی ناوخۆی وەرگرت، دانیشتوانی قەلاکەیان ناچاری ڕاکردن کران، پاشان لەسەردەمی دەسەلاتی کەریم خانی زەند هۆزی کەڵهوڕ بە قۆناغێکی نوێ تێپەڕی، پاش داگیرکردنی تاران، ئەراك، قەزوین کەریم خان ڕووی کردە کرماشان لەهارون ناوا و ناوچەی کەڵهوڕ سەرانی هۆزەکە بەپیریەوە چوون و پیشتیوانی خۆیان بۆ دەربڕی، کەریم خان لەو دیدارە پەیوەندیەکانی لەگەڵ کەڵهوڕ

بەهێزکرد، قەدەمخێری برازای یان کچی عەلی خانی کەڵهوڕی مارەکرد، ئاهەنگی لای کانیەکی دەشتی ماهیدەشت سازکرد، ئەم کانیە بەکانی شاپەسەند ناسراوە تائێستا چونکە ناوی قەدەمخێری ژنی گۆڕی بەناوی شاپەسەند. کەریم خان هەندێك سوارەی کەڵهوڕی لەگەڵ خۆی برد بۆشیراز تاکۆتای دەسەلاتی زەندیەکان لەوێ مانەوە، هەندێکیان بەهۆی ژن و ژنخوازی بەیەکجاری نیشتەجێی شیراز بوون. پاش زەندیەکان بنەماڵەی قاجاریەکان دەسەلاتیان لەئێران چەسپاند، دەسەلاتی هێزی کەڵهوڕ کەوتە ژێردەستی بنەماڵەی حاجی زادەکان، ئەمانە شارستانی بوون بۆیە

پایتەختی هۆزیان لەهاروناوە گواستەوە بۆکرماشان. لەو سەردەمە سمایل خانی کەڵهوڕ و کوڕەکەی مەهدی خان گەورەترین فەرمانبەری هۆزی کەڵهوڕ بوون، ئەحمەد ئاغا کوڕی محەمەد عەلی بەهبەهانی دەربارەی هۆزی کەڵهوڕ دەنوسێ (لەجوملەی سەردارانی پایەبەرزی هۆز جەنابی پایەبەرز مەهدی خان کوڕی خوالێخۆش بوو سمایل خان، گەورەی هۆزی شکۆداری کەڵهوڕ بێسنور پیاوێکی ڕاستگۆ و دادپەروەر و دەست بڵاو بووە و هۆنراوەی شیرین و ناسکی هەیە حەزی لەهاودەمی زانا و پیاوچاکانە) [19] .

مەردۆخی دەڵێت : کەڵهوڕ نزیکەی دەهەزار خێزان بوون، لەناو (ماهیدەشت، هارون ئاباد، قەڵاشاین) و ناوچەکانی قەسری شیرین و کەرەند نیشتەجێن، ناوەندەکەیان گەیلانە، نزیکەی دووسەد خێزانیان لەڕۆستەمانی خورخورە و ناوچەکانی سەقز نیشتەجێن[20]. ڕاوڵنسن نووسیویەتی: کەڵهوڕ زیاتر لەبیست هەزار ماڵ دەبن، نیوەیان بەئێراندا بڵاوبوونەتەوە، نیوەکەی تریان لە(زاگرۆس) دان دوو بەرەن :

بەرەی شابازی: لەکرماشان و مایدەشت و مەندەلی نیشتەجێن .

بەرەی مەنسوری: لەگەیلان نیشتەجێن .

کەڵهوڕەکان لەچەند شوێنێك لەسەردەمی جیاجیادا حوکمڕانیان کردووە، بۆ نمونە لەپاڵنگان ی سەربەسنە، هەروەها لەماییدەشت، دەرەتەنگ، چەند حوکمڕانێکی ناوداریان هەبووە لەوانە غەیبولاَ بەگ، زولفەقارخان. زولفەرقارخان سەرۆکی تیرەی موسڵۆی کەڵهوڕ بووە، لەسەردەمی حوکمی سوڵتان سلێمانی قانوونی .

کەڵهوڕ لەسەدەکانی ناوەڕاست لەشارەزوور نیشتەجێ بوون، لەدوای شەڕی (حوسێن شەهید) کە لەسەر ئاوی شلێر ڕویداوە، کەڵهوڕەکان زۆربەیان گەڕاونەتەوە بۆ ناوچەی ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگای (خانەقین– قەسری–کرماشان) کە مەڵبەندێکی سەرەکی نیشتەجێ بوونی هۆزەکەیان بووە، ژمارەیەکیشیان لەناو تیرەکانی تردا بڵاوبوونەتەوە.

---

[19] عەلی ڕەزا گۆدەرزی: ئێلی کەڵهوڕ لەسەردەمی مەشرووتە، و محسن بنی وەیس،٢٠١٣، ل١٨–٢٣.

[20] شێخ محەمەدی مەردۆخ: مێژووی کورد و کوردستان، و زانەر محەمەد ،چ١ ،٢٠٠١، ل٨٧–٨٨ .

کەڵهوڕەکان لەڕووی فۆلکلۆر بینـراو بیسـتراوە دەوڵەمەنـدن، جۆرێـك لـەهۆرەیان هەیـە پێی دەوترێت هۆرەی کەڵهوڕی، ئەمە جـۆرێکی ڕەسـەنە لەهونـەری گـۆرانی فۆلکلـۆری کـوردی لەبۆنـەی جیاجیـادا لەلایـەن دەنگخـۆش و هۆرەچـڕەکانیانەوە کـۆڕی پێگـەرم کراوە[٢١]. میرزا شکرولاّ سنندجی لەنێوان سالآنی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵێ: هۆزی کەڵهوڕ نزیکـەی دووسـەد خێـزانن لەناوچـەی سـەقز، بەشـێوەی دەوارنشـینی دەژیـن و لـە ئاوایەکانی سەقز دا گەرمیان و کوێستان دەکەن، نزیـك بـە سـەد خێزانێکیشـیان چـەند ساڵێکە دەسـتیان لـەخێوەت نیشـینی هـەلگرتووە و لـەئاوایی ڕۆسـتەمان و ناوچـەکانی سەربە خوڕخوڕە نیشتەجێ بوون. ئەم تایفە لقێکن لەهۆزی کەڵهوڕی ئـەیوان کەزێـدیان خاکی دارئەلدولەی کرماشانە [٢٢].ئەم هۆزە نزیکـەی بیسـت تـیرەن (خاڵدی، شـەیانی، سیاسیا، کازم خانی تەڵەش،خەمان ،قەڵەش،گڕگا، کوڵەپا، کوڵەجۆ، گـەیلانی، زوێـری، منشی، گڵـینی، شـێرگ، دێرەیـی، وەرمزیـاری، کەلـەجۆ، شـوان، قۆچـمی، مەنسـوری، ئەلوەندی، ماهیدەشتی، هارون ئابادی، شاهینی، موشـگیر، بـوداق بـەگی، زینـەڵخانی، کەمەرە)[٢٣] .هەر تیرەیەك لەم تیرانە ناوچەی خۆیان هەیە و ناوچەکە بەناوی خۆیانەوە بەناوبانگە، ناوچەکان بەڕێککەوتن لەنێوان سەرۆك و کوێخاکان دابەشدەکرا، دەسەلآتی داودخان گەیشتە ڕادەیـەك بەرپرسـانی کرماشـان بـەبێ ڕەزامەنـدی ئـەو نەیانـدەتوانی سەرۆك بۆ هۆزەکانی دیکـە دیـاری بکـەن یـان لای بـدەن[٢٤].شـەرەف خـانی بەدلیسـی لەشەرەفنامەدا دەڵێ: کەڵهوڕ نەتـەوەی (گیـوی کـودرز)ە، خانـەدانانی ئـەمارەتی ئـەم هۆزە سێ بەشە :

١– بەگزادەی پەلکان .

---

[٢١] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە، چ١، ٢٠٠٣ ،ل ٩٠–٩٢ .

[٢٢] میرزا شکرولاّ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفـەی کـورد لـە کوردسـتانی ئـەردەلآن،و ئـەنوەر سـولّتانی ، چاپخانەی ژین–سلێمانی، چ١ ،٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل١٠٤ – ١٠٥.

[٢٣] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل١١٢ .

[٢٤] عەلی ڕەزا گۆدەرزی: ئێلی کەڵهوڕ لەسەردەمی مەشرووتە، و محسن بنی وەیس،٢٠١٣، ل٢٦ .

٢-بەگزادەی دەرتەنگ .

٣- بەگزادەی ماهی دەشت .

لەومەڵبەندەی کە کەتۆتە نێوان حلوانی کۆن و کرماشـان تادەگاتـە سـنە، هەنـدێك لـە کەڵهوڕان لەو مەڵبەندەوەپەرەوازە بوون[٢٥]. لەناوچەی کرماشان لـەپێنج هـەزار خێـزان زیاترن، بەشێکیان کۆچەرن وئەوانی تریـان نیشـتەجێن، هەوارگـەی هاوینیـان چـیاکانی سەرووی ڕۆژئاوای ناوچەی پشتگۆیە و زسـتان ئەگەڕێنـەوە بـۆ تەختایـەکانی دەشـتنی زەهاو و قەسری شیرین وناوچە سنووریەکانی نێـوان ڕۆژهـەڵات و باشـوری کوردسـتان، ئەم هۆزە عەلی ئیلاهی و شیعەی ئێجگار زۆرە[٢٦].

## هۆزی گەڵاڵی :

ئەم هۆزە لەکۆنەوە بوون و بوونیان وەك هۆزێکی دیارو ناسـراو ڕۆڵ و دەوری خۆیـان گێـراوەو لـەڕووداوەکان دا، لەسەرچـاوە میژوویـەکان دا باسـکراوە، هـۆزی گـەڵاڵی لەگەورەترین و دێرینترین هۆزەکانی(شارەزوور، داقوق ،کەرکوك) بووە هۆزێکی دێرین و ڕەسەنە، یەکەم هەواڵ لەبارەیانەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(٢٦٧کۆچی و٨٨١زایـنی) کـە لەناوچـەیەکی فـراوان ژیـاون نـاکرێ کتـووپڕ لـەو سـەردەمەدا دروسـت بـووبێ، ئـەبێ پێشـینەیەکی مێـژوویيان هـەبووبێ، کـوردە گەڵاڵیـەکان شۆڕشـیان بەرامبەر(ئـەبی ئەلهەیجاو عەبدوڵا بن حمدان)ی والی موسڵ و شارەزوور کردووە، دیارە لـەو سـەردەمە زۆر بەهیز بوونە، بۆیە هەڵساون بە سەرکردایەتی شۆڕش لـەدژی نـەیارانی کـورد .فضـل

---

[٢٥] محەمەدئەمین زەکی بەگ :س ، پ ، لل٤١٠-٤١١ .

[٢٦] ئی ،جەی .ئار: س ، پ ، ل٢٠ .

اللـة العمـری: کەسـاڵی(٧٤٩ك)(١٣٤٨ز) کۆچـی دوای کـردووە، دوای ئـەوەی پێناسـەی (هەرێمی چیاکان) دەکات وجوگرافیای کێوەکانی زاگرۆس ڕوون دەکاتەوە، ئینجا باسی بیست شوێن دەکات هەر شوێنەی هۆزێکی کوردی لێ هـەبووە، لەبڕگـەی سـێیەمی ئـەو زنجیرە شوێنانە دەڵێ، داتسرك و نەهاوەند تا دێتە نزيك (شارەزوور) مەڵبەندو جێگـەی هۆزی گەلاڵی بووە و ئەمانە بەکۆمەڵی شێر ناسراون، تابڵی ئازاو نـەبردن هـەزار پیـاوی شـەرکەریان هـەبووە، سـەرۆکی هۆزەکـەیان ئاغایـەتی بەسـەر هۆزەکـانی دەوربەریـدا دەکات و ئەگەر بیەوێت خەرج و باجیان لێ دەسێنێت، فـەرمان ڕەوایـی سـەرۆکی هـۆز بەسەر پیاوانی هۆزەکەی دا زۆر تۆکمە و تۆند و تۆڵە، هەموویان گەردن کەچ و گوێڕاڵی فەرمانەکانین، هـەروەها لـەنزيك هـۆزی گـەلاڵی ولـەکێوەکانی هەمـەدان کـوردی زنگلـی نیشتەجێ بوون، محەمەدعلی عەونی لایوایە (زەنگەنە)یە، ناوەکەی تێك چووە .

دیارە مەبەستی (فضل اللة العمري) دیاری کردن و شوێن و جێگای هەموو هۆزی گەلاڵی نـەبووە، چـونکە ئاشـکرایە بەشـێکی ئـەم هـۆزە لەداتسـرك و نەهاوەنـد بـوون نـەك هەموویان، چونکە ناگونجێ ئەو شەست هەزار خێزانەی لەگەشـتنامەی (ئـبن ئەلمهلـهل) ساڵی (٢٣٠ك) (٩٤٢ز) لەشارەزووردا ئاماژەی بـۆ دەکـات و زۆربـەیان لـەهۆزی گـەلاڵی بـوون، نـاکرێ وایـان لـێ هاتبێـت لەسـەدەی چـواردەی زایـنی (شـارەزوور) یـان جـێ هێشـتبێت و لـەدوو ناوچـە گیرسـابنەوە وایـان لـێ هاتبێـت تـەنها بتـوانن تـەنها هـەزار شەرکەر ئامادە بکەن، بەڵکو ئەوان لەشاری (داقوق) دەورووبـەری ژمارەیـەك خێزانیـان هـەبوو ژمارەیـان دەگەیشـتە هـەزار خێـزان، لەشـنۆ و لاجـانیش ژمارەیـەکیان هـەبوو هەمیشە توانیویانە دووسەد پیاوی شەڕکەر ئامادە بکـەن. یـاقوتی حەمـەوی* لـەکتێبی معجم البلدان لەسالأنی (١١٨٠– ١٢٢٩) زاینی ئاماژەی بەناوی هۆزی گەلاڵی کردووە بەم شێوەیە باسی کردوو: گەلاڵی هـۆزێکی کوردیـە، (شـارەزوور) زسـتانە هـەواری شەسـت هەزار ماڵە کوردی (گەلاڵی، باسیانی، حەکـەمی، سـۆلی) یـە، یـاقوت دووجـار ئامـاژەی بـەناوی ئـەم هـۆزەی داوە، جـاری یەکـەمیان بەیـەکێك لـەهۆزەکانی (شـارەزوور)ی ژماردووە، زانیاریەکەیشی لەگەشتنامەکەی (مسعربن مهلهل) گواستۆتەوە .

بۆجاری دووەمیش ڕەچەڵەکی یەکێك لەهاورێکانی، کەنیشتەجێی گوندی (باکلیا)ی نزیك (هەولێر) بوو دەگەڕێنێتەوە بۆسەر هۆزی گەلاڵی کەناوی (الفقیه ئەباحەسەن عەبدوڵلاّ کوڕی شروین) بوو لەڕیزی کەسایەتیە زانستخوازەکان ئاماژەی بۆ کردووە .

یاقوت حەمەوی شوێنی (گەلاڵیەکان)ی لە(شارەزوور) و ئەو شارو و ناوچانەی کە سەربە (موسڵ) بوون دیاری دەکات دەڵێ: یەکێ لەهۆزە نەبەزەکانی کوردە، ئەم هۆزە بەناوچەیەکی ستراتیژی سنوری نێوان دوو هەرێم گەیشتوون، بەلاّم ناگەین بەئەنجامێك ئایا ئەم هۆزە چۆن هاتوون وخۆیان خزاندۆتە ناو مێژووی ئەم شوێنانە هەر لەو سەردەمە ئەم هۆزەی کورد، جگە لەسنوری ناوبراو، لەچەندین شوێنی تر بەدی کراون وەك لەشاری (ئوشنۆ، داقوق، دەرتەنگ، نەهاوەند) .

لەماوەی سەردەمی مەغۆل دا گەلاڵیەکان لەچوار شوێن نیشتەجێ بوون :

١- چینێکیان لەدانترك تا نیهاوەند نزیك شارەزوور .

٢-چینێکی تریان لەدەوروبەری لادیکانی داقوق وکەرکوك نیشتەجێ بوون .

٣- چینی سێیەمیان کەوتونەتەوە(ئەشنۆیا)ی سەربەهەرێمی ئەزربایجان.

٤- بەشێکیشیان لەهەولێر نیشتەجێ بوون. کە (مەلیك شەرەفەدینی کوڕی سالار) سەرکردایەتی دەکرد، کە لەساڵی (٦٥٨ك١٢٦٠ز) بە دەستی مەغۆلەکان کوژرا . ئی.جەی .ئارهینری فێڵد دەڵێ: گەلاڵی هۆزێکی کوردی شاخاوی مل هوڕو جەربەزە بووە، مەڵبەندی بنەڕەتی ئەم هۆزە سێ گۆشەیە سنورەکەی نێوان (ئێران، تورکیا، ڕوسیایە) هەندێکیشیان لەدەوروبەری (شارەزوور) دا نیشتەجێ بوون، سەرۆکیان لەدواسالآنی سەدەی شازدەهەم وسەرەتای سەدەی هەڤدەهەم دا (حەلیم شای گەلاڵی)بووە. عباس العزاوی کە (مسالك الا بصار) نقلێ دەکات دەڵێ: گەلاڵیەکان لە هەولێر و دەوروبەریدا فەرمانڕەوا بوون، هێرشی تەتەر و مەغۆلەکان ئەوانی تەفرو تونا کردووە و پەرتەوازەی کردوون، کاتێك مەلیك شەرەفەدین کوڕی سالار گەلاڵی کە تەتەرەکان کردوو بوویانە فەرمانڕەوای هەولێر بەدەستی کافرەکان کوژرا،

گەلاڵیەکانیش لەدژی کافرەکان ڕاپەڕین و یاخی بوون، هەندێکیشیان بەرەو ولاّتی شام و میصر هەڵهاتن، (ئەمیری کوڕی مەلیك شەرەفەدین) بەفەرمانڕەوایی مایەوە بەسەر ئەو گەلاڵیانەی لەناوچەی شنۆ مابونەوە، (عوسمانی کوڕی مەلیك شەرەفەدین) یش بوو بە فەرمانڕەوایی ئەو گەلاڵیانەی لەهەولێرو دەورو بەری مابوونەوە، کەعوسمان مرد ئیتر کەس نەبوو لەو بنەماڵە جێگەی بگرێتەوە کەسانی دیکە فەرمانڕەوایی دەکردن.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت هۆزی گەلاڵی ڕۆڵێکی گرنگیان لەمێژوودا گێڕاوە، تا ئاگری شەڕی مەغۆل و تەتەر یەخەی گرتن و فەرمانڕەواو دەسەلاّتی ڕووخاندن و شارو گوند و قەلاّیان وێران بوون، ئەوەی فریا کەوت بە دەست بەتاڵی سەری خۆی هەڵگرت و ئاوارەی ولاّتی میصر و شام بوون، خاوەنی کتێبی (مسالك الا بصار) باسی ئەمیرەکانی هۆزی گەلاڵی دەکا و یەك بە دوای یەك ناوی دێنێ ، پاشان باسی ڕوخاندنی فەرمانڕاواییەکان دەکات، ئەمەش ئاماژە بەوە دەکا کە هۆزی گەلاڵی لەو ڕۆژگارەدا پلەو پایەی تایبەتی خۆیان هەبووە، هۆزێك بووە فەرمانڕەوا جیرانەکانیان حیسابی تایبەتیان بۆ کردووە، بەلاّم دوای بەقڕ چونیان لەسەردەستی تەتەر ومەغۆلەکان پەرتەوازە بوون بەلاو ئەولادا، بۆیە لێرەوە ڕۆڵیان لەمێژوودا وەك پێویست نەماوە، بۆیە لەسەدەکانی (١١، ١٢ ،١٣، ١٤) ك ناویان لەڕووداوەکانی کوردستان نایەت، پەرتەوازە بوونیان بە جۆرێك بووە هەر کۆمەڵە و بنەماڵەو خێزانیان کەوتوونەتە هەرێمێك و هیچ پەیوەندیان بەیەکەوە نەماوە، هەر ئەوەندە توانیانە پارێزگای لەناوی هۆزەکەیان بکەن، نەهێڵن ئەو (ئنتیما)یان لەبیر بچێتەوە، زۆربەیان کەوتووبوونە دەورو بەری قەلاّی دم دم، هەندێکیان لەدەشتی هەولێر و کۆیە، برێکیانیش لەشاری داقوق و دەوروبەری جێگر بوون، بەشێکیشیان لەگوندەکانی شارباژێر (گەلاڵە، قامیش، ولاّغلوو) نیشتەجێ بوون، هەندێك پێیان وایە هۆزی شینکی بەشێکن لەگەلاڵی، بەلاّم ڕیچ بەهۆزێکی سەربەخۆ داینـاوە، کۆمەڵێکیشیان بەرەو ئێران و مەڵبەندی نەهاوەند و کرماشان کۆچیان کردووە، بەشێکی تریان بۆ ناوچەی شارەزوور و شێروانە و کفری و دۆڵی گەلاڵ بلاّو بوونەتەوە، ئەم بەشەیان تێکەڵی خێلاّتی جاف بوون، ناویان بەیەکێك

لەتیرەکانی جاف هاتووە، بۆ نمونە زێوەر لەکتێبی گەنجینەی مەردان دا هـۆزی گـەلاڵی بەلقێك لەجاف دادەنێت، ئەوەندە گەلە کۆمێ و ئێلجاری لەم هـۆزە کـراوە مەگـەر خـوا خۆی بزانێ، کەچی وێڕای ئەوەش دوژمن نەیان توانیووە زەفەریان پـێ بـەرن و مـەرازی خۆیـان بهێننـە دی، هـەر ئـەوانیش بـوون کەئـەو مـاوە دوورو درێـژە لەقـەڵای دم دم بەرنگاری سوپای زۆر بێ شوماری شاعەباسی سەفەوی بوونـەوە ئـەو هـەموو کوشـت و کوشتارەیان لەسوپای داگیر کەر کرد تا هەناسەیان مابوو بـەرگرییان کـرد، دووژمـن بـە زیندووی نەیتوانی جەنگاوەرێکیان لێ دیل بکات. مەلا مەحمود گەلاڵـەیی دەڵـێ بـەپێی سەرچاوەکانی مێژوو: بەشێکی زۆری هـۆزی گـەلاڵی لەسـێ کۆچـکەی (ئێـران، تورکیـا، عێراق)دا دەژین و بـەهۆزی جـەلالی ناسـراون و چەرمەسـەری گۆبەنـدی زۆریـان تـووش بووە. زۆرێکیان کەوتووبوونە ناوچەی بایەزید، ئەوانەی ناو ئێرانیش لەناوچـەی (مـاکۆ) گیرسابوونەوە، ئەمانەی نـاو خـاکی ئێـران کـاتی خـۆی لەسـاڵی (١٩٢٠) دا لـەتورکیاوە پەنایان بـردوو بـووە بـەر ئێـران . بەجـەلالی دەڵـێن کـوردی کەڕە،لـەژێر فـەرمانڕەوایی سەرداری ماکۆدا بوون، سەرداری ماکۆ بەیارمەتی هۆزی گەلاڵی و تاهیرخانی حەیـدەری ئەو دەڤەرەی کۆنترۆڵ کـرد.بەکشـتوکاڵ و ئاژەڵداریـەوە خـەریك بـوون، بەشێکیشـیان لەبەینی (بەدلیس، دیاربەکر) نیشتەجێن .

کەواتە گەلاڵیەکان لەمێژە خاوەن توانا و دەسەڵاتێکی سیاسی و گەورە بوون، چ لە هــەولێر و دەوروبــەری چ لەناوچــەکانی نەهاوەنــد تــا گەیشــتوونەتە شــارەزوور، سەردەمێکیش لەناوچەی ئازەربایجان باڵادەست بـوون، گـەورەیی پێگـەو دەسـەڵات و فراوانی ئەم هۆزە وای کردبوو پێش هاتنی جاف بۆ ناوچەکە زۆربەی تـیرە و خێڵـەکانی کورد سەریان خوارکردبوو بۆی، هەندێك لەوتیرانە کە دواتر شوێن جاف کەوتن لەکۆچ و ڕەودا پێشتر لەژێر هەژموونی کوردە جەلالیەکان بوون یان هەربەڕەچەڵەك لـەوان بـوون ،پاش هاتنی بەشێك لە جافەکان بۆ ناوچەکانی ژێـر دەسـەڵاتی ئـەم هـۆزە ،بەشـێکیان بوون بەپێکهێنەری هۆزی گەورەی جاف، تائیسـتایش گـەلاڵی لەگـەڵ جـاف پەیوەنـدی باشی هەیە . (کەریم بەگی جاف) کەیەکێکە لەسەرۆك هۆزەکانی جافە لەساڵی (١٩١٤)ز

دەڵێت: گەلاڵی تیرەیەکی گەورەن لەناو هۆزی جاف، نزیکەی (١٢٠٠) ماڵ بوون دانیشتوانیان زۆر کەم بوو بەبەربلاو لەناحیەی (شێروانە (کەلاری ئەمڕۆ) زەنگاباد، ناحیەی وارماوە) لەحاصڵ و چالگەی کەلی جەلیل (١٥٠) ماڵیان بووە لەشارەزوور دەژیان،هەروەها لەکوردستانی ڕۆژهەلات لەناوچەی (خورخورە)دا (٥٠)ماڵ بوون، بەشێکی زۆریان گەڕیاوون و لەڕێگەی سێدارو داری خلەوە ئەچوونە ناحیەی سەنگاو لەڕێی پەیکولی دا ئەچوونە ناحیەی وارماواو لەڕێگەی شاتریەوە ئەچوونە پێنجوێن، لەوێ بەسەر ڕێی (ڕۆغزادی، تەرخانی) ئەچونە ڕۆژهەلاتی کوردستان کەجێی هاوینەی ئەمانە لەمەحالی خورخوڕ (سوورمووسا، دوورە قەلاّ، گاوەکەچ) بوو، لەمەحالی دیواندەرە (کەلی هەواس بەگ، هۆبەتوو، کەڵەکان،جیران مێگا) ئەم تائیفەیە چوارسەد سوارو پێنج سەد پیاوی تفەنگداریان بەزیادەوە هەبووە، لەمەو بەر بەفکرم دێ لە ئێران سواریان بەسەد سوار تاوەکو زەنگان و تەرەف تەبریز ئەچوون و کاروانیان ئەهێنا. گەلاڵیەکان کۆچەری بوون و لەسەرەتای وەرزی هاوین ئەچوونە دیواندەرە و سنە* و تیلەکۆ و گەرووس، لەوەرزی زستان دا دەگەڕانەوە دەشتی شاکەل و شێروانە و سەرچەمی کفری و دەوربەری قەرەتەپە و جەبەل حەمرین، ئەم کۆچ وبارە تاسالی (١٩٢٦) زایینی بەردەوام بووە لەڕاستی دا هۆزی جاف و بەشێك لەگەلاڵیەکان مێژوویەکی هاوبەشی چەندان سەدە کۆیان دەکاتەوە نەك هاوخوێنی .

عەباس ئەلعزاوی لەکتێبی عشایرالعراق دا لەساڵی ١٩٤٧، ئامارژە بە براگەورەی تیرەکان دەکات و بەم شێوەیە ناویان دەهێنێت :

١- ئاغاکان: سەرۆکی گشتین گەورەیان(تۆفیق ئاغای عباس ئاغا، محەمەد ئاغای ڕەزا ئاغا، مستەفا ئاغا، ئەحمەد ئاغای ڕەشید ئاغا) کە زۆرێك لەبەگزادەکانی گەلاڵی تائێستا لەئێران نیشتەجێن، کەجێی خۆیان لەدڵی ئێرانیەکان کردۆتەوە.

٢- خدر وەیسی: سەرۆکی ئەم تیرەیە (حاجی کەریم وەیس) بوو .

٣- سیازدە: سەرۆکەکەیان (حاجی قادر نەورەس) بوو .

٤- پشدەری ڕیش سپی ئەم تیرەیە (محەمەدکەریم قوباد، ئیبراهیم کەریم قوباد)بووە.

٥- کەرەم وانی: سەرۆکی ئەم تیرەیە (ڕەحیم ئەحمەد، محەمەد ڕەحیم ئەحمەد) بوو .

٦- بۆرە: سەرۆکی ئەم تیرەیە (مەحمود مرادخان) بوو .

٧- سەرکەچ: ڕیش سپیان (حوسێن حەسەن) بوو .

٨- لۆرتەیی: پیاو ماقوڵیان (کەریم محەمەد) بوو

٩- تیرەی سەرکەوە و کانی کەوە براگەورەیان (یەعقوب خەسرەو، خوامراد یەعقوب خەسرەو)[٢٧] . وێنەی چەند کەسایەتیەکی دیار و ناسرا و ڕیشسپیانی هۆزی گەلاڵی لەگەرمیان .



حاجی حوسێن عەبدولکەریم – حاجی فایەق حەمەساڵح– عەلی محەمەد ڕەحیم– خەلیفە عەزیز محەمەد

[٢٧] هیوا مەلا حەسەن: چەردەیەك لەمێژووی هۆزی گەلاڵی، چ١، چاپخانەی چوارچرا– سلێمانی ٢٠١٧.

*سنە: یەکێکە لەشارەگەورەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان و ناوەندی پارێزگای کوردستانی ئێرانە، سنە لەباری ژمارەی دانیشتوانەوە لەدوای کرماشان و ورمێ سێیەمین شاری گەورەی ڕۆژهەلاتی کوردستانە،بەپێی ئاماری ساڵی ٢٠٠٦ ژمارەی دانیشتوانی چوارسەد هەزار کەسە. خەڵکی ناوچە بەزاراوەی ئەردەلانی قسەدەکەن کەلقێکە لەسۆران . لەویکپیدیاوە وەرگیراوە .

## هۆزی زەنگنە :

هۆزی زەنگنە یەکێکە لەهۆزە کۆنەکانی کورد و ناوچەکە، لەکۆنەوە لەڕۆژئاوای ئێران و ڕۆژهەلاتی عێراق ژیاون، لەماهی دەشت زەنگنە زۆربووەبە کشتوکاڵەوە خەریك بوونە، لەکرماشانیش دووهەزار ماڵیان هەبووە، هەندێکیان لەبلوجستانن، لەتورکیا لەشارەکانی (ئەفیون، ئەرزنجان) نیشتەجێن بوون، لەسەردەمی سەفەویەکان میرنیشینێکیان پێك هێناوە[٢٨] . زەنگنە لەباشوری کوردستان کەوتۆتە ناوەندی چەقی گەرمیانەوە، لەپانتاییەکی فروانی گەرمیاندا بلاوەیانکردوە، هاوسنورن لەگەڵ هۆزەکانی گل، شێخەکان، جەباری، جاف، هەمەوەند، دەلۆ، داودە، زەند، دێهاتەکانی ئەم هۆزە بەزۆری کەوتوونەتە شیوو و هەردە و هەڵەتەکانی قادرکەرەم، سەنگاو، کفری، کەرکوك و دەوربەریانەوە،خورماتوو، زۆربەی هەردە و هەڵەتەکانی سەخت و دژوارن، دوو ڕوبارى بچووك بەناوچەکانی زەنگنە تێپەر دەبێت ئەویش ڕووباری (ڕۆخانە، ئاوەسپی)ە، لەڕۆژهەلاتی هۆزی زەنگنە کۆمەڵە چیایەك هەیە لەوانە زنجیرە چیای سەگرمە* ، چیای ئاژداخ، چیای ئیمام زەنوور، چیای شیرداغە، لەچیای ڕۆژئاوایەوە چیای سەڵباتوو، جەوەڵ ناساز، جەوەڵ مازوغ، هاوینەواری خۆرنەوەزان، لەباشوری قەزای کەلار لەباکوریەوە قەزای چەمچەماڵ، قەلای سپی، حەسار، گوندی چەرموو[٢٩] . زەنگنە پێش ئەوەی کۆچ بکەن بۆباشوری کوردستان لەناوچەی (ماهی دەشت)ی کرماشان لەڕۆژهەلاتی کوردستان نیشتەجێ بوون، نەوشێروان بەگ لەگەڵ بەشێکی زۆری هۆزەکەی کۆچیان کرد، قۆناغ بە قۆناغ هاتن بۆ گەرمیان سەرەتا لەگوندی گەڕاوی نیشتەجێ دەبن، دواتر توانیان میرنیشنێك دروست بکەن لەگوندی قەیتول لەشارەدێ قادرکەرەم دواتر میر سمایل چل ساڵ فەرمانڕەوایی کرد[٣٠]. باوکی

[٢٨] محەمەدعبدولڕەحمان زەنگنە: مێژووی هۆزی زەنگنە ، چ١، ١٩٨٠،ل ٤٢ — ٤٣.

[٢٩] گۆران زەنگنە : تۆڕی کۆمەلآیەتی فەیس بووك، ٢٠١٧ .

[٣٠] حەسەن مەلا: کوردستانی نوێ،هۆزەکانی گەرمیان لەگێژاوی ئەنفالی سێیەم دا پەرتەوازە بوون، سلێمانی، ٢٠١٨/٤/٢٠ .

میر سمایل لەکرماشان نیشتەجێ بوو، بەلاّم بەهۆی ململانێی و ستەمی سەفەویەکان بەرامبەر کوردەکان لەسەردەمی شاعەباسی دووەم ناچار ناوچەی کرماشان لەساڵی (١٦١٥)ز جێ دەهێڵن و ڕوودەکەنە ناوچەی قەفقاسی ژێر دەسەلاّتی سەفەوی.دواتر نەوشێروان بەگ باوکی میر سمایل پەنا دەبات بۆ هۆزی زەنگنە ئەوبەشەی کەوا لەباشوری کوردستانن، لەو کاتەدا (حاجی عەلی بەگ) سەرۆك هۆزی زەنگنەی باشوری کوردستان بووە، نەوشێروان بەگ لەگوندی گەراوی سەر بەناحیەی قادرکەرەم نیشتەجێ بوو، پاش ئەوەی پیر دەبێت و توانای نامێنێت دەسەلاّت دەبەخشێت بەمیر سمایلی کوڕی، میر سمایل شەش کوڕ و دووکچی لەدوای خۆی جێهێشتووەبەناوەکانی (ئەلقاس، محەمەد، عەلی، ئەحمەد، مستەفا، عەبدولڕەحمان) کچەکانی بەناوی (شاخاتوون، زاراخاتوون) میر سمایل لەساڵی (١٦٦٨ز) کۆچی دوای کردووە[٣١] . شەرەف خانی بەدلیسی لەپەرتووکەکەی خۆیدا لەشەرەف نامە وا دەنوسێت: لەڕۆژگاری دەسەلاّتداری شا ئیسماعیلی سەفەویدا (زەنگنە) زۆر گەشەیان کردو پلەو پایەوسایەومایەی زۆریان دەست کەوت، لەوانە بوون کە نزیکیان ئیرەیان پێ دەبردن، بەلاّم کە میرەکانیان لەناوچوون ئەوانیش بلاّوبوونەوە لەعێراق، خۆراسان دامەزران، هەندێك یان لەگەلّ پاسدارانی پایەبەرزی شا ڕێکخران[٣٢] . لەهۆزەکانی هەرێمی چیاکانی کوردستانی ڕۆژهەلاّتن، لەماوەی سەردەمی عەباسی بەو ناوە نەناسرابوون، یەکەم ناوهێنانی زەنگنە بۆ سەدەی حەوتەمی کۆچی وسێزدەی زاینی دەگەڕێتەوە، ئەو کاتەی دەسەلاّتێکی هۆزەکیان دروستکردو ولاّتی کنگاور و ناوچەکانی دەوروبەریان خستە ژێر دەسەلاّتی خۆیانەوە، ئەو ڕۆژە هەزار پیاو لەخزمەتی میری ئەو هۆزە دابوون، کەناوی (جەمالەدین بالان) بوو کەبەئازایەتی و زیرەکی وەسفکراوە. گێرانەوەیەك هەیە دەلێت: هەرسێ هۆزی (سیامەنسوری، چنکنی، زەنگنە) لەسێ

---

*سەگرمە: لەوە هاتووە هاوارێك بکەی سێ جار دەنگ دەداتەوە. فریاد زەنگنە ٢٠١٨/١١/٢٧ .

[٣١] حەسەن مەلا: هەواڵ نیوز، سەنگینی میرسامیلی زەنگنە لەگۆشەنیگای مێژوودا.

[٣٢] میر شەرەف خانی بەدلیسی: شەرەفنامە، و مامۆستا هەژار، چاپی سێ یەم، ٢٠٠٦ ،ل٤٣٥ .

برایانەوەسەرچاوەیان گرتووە لەزێدی خۆیان کەلوڕستانە، یا وڵاتی گۆران و ئەردەڵانە دەرچونە، هەندێ کۆمەڵی زەنگنە هاتوونەتە نێو سنوورەکانی عوسمانی و لەهەندێ گوندی سەربە ویلایەتی کەرکوك–گەرمیان جێگربوونە[٣٣]. لەسەدەی حەڤدەهەمی زایینی لەچوار چێوەی دەوڵەتی سەفەویدا زەنگنە پلەی گرنگ و بەرچاویان هەبووە، لەوانە(عەلی خانی زەنگنە) لەساڵانی (١٦٦٩–١٦٨٩) توانی بگاتە پلەی وەزیری مەزن، هەروەها کەسانی تر لەهۆزەکە چەندین پلەی کارگێڕی و سەربازیان بەدەست هێناوە، زەنگنە لەناوەڕاستی سەدەی شانزەهەم لەچوارچێوەی ویلایەتی لوڕستان (سەنجەق) لیوا بووە، دواتریش وەك لیوایەك کە بەشێوازی (میرایەتی هۆزەکی) بەڕێوەدەبرا لەچوارچێوەی ئەیالاتی شارەزووردا دانراوە. بەپێی دەفتەر دامەزراندنەکانی دەوڵەتی عوسمانی ژمارە (٢٦٦ و ٦٠٩٥) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نێوان ساڵانی (١٦٣١–١٦٤٢) زەنگنە سەنجەق لیوایەك بووە سەربە ئایالەتی بەغداد، بەڵام جارێکی تر نێوی لەدەفتەری دامەزراندنەکانی ساڵانی دواتردا لەچوارچێوەی ویلایەتی شارەزوردا هاتووە، کەوەك هۆزێك بەشێوازی میرایەتی هۆزەکی لەلایەن میرەکانیانەوە بەڕێوە دەبرا، لەماوەیەی سەرەوەشدا بە (ئیسماعیل بەگ) ڕاسپێردراوە، شوێنی میرایەتیەکەش کەوتوو بووە نێوان هەردوو ڕووباری (ئاوەسپی، ڕوخانە) بنکەکەی قەیتول بووەهەندێك جار بخۆرنەوەزان بووە لەناوچەی بە(گیل) یان بناری گل ناسراوە، (قەیتوول) پاش لەناوچوونی ئەم میرایەتیە بەشێك لەهۆزەکە کۆچ دەکەن بۆ دەوروبەری خانەقین و کفری[٣٤]. ئەو سەنجقەی لەچوارچێوەی ولایەتی لوڕستان بووە جیایە کەدواتر لەچوارچێوەی ولایەتی شارەزوردا بەڕێوەدەبرا، ئەم سەنجقە کەسەربە

---

[٣٣] زرار سدیق تۆفیق: هۆزو دەسەلآتە هۆزەکیە کوردەکانی چاغی ناوەڕاست، س ،پ، ل١٥٤–١٥٥.

*ئێستا ئەم هۆزە ژمارەیەکی بەرچاو لەگەرمیان لەقەزای کفری و ناحیەی ڕزگاری سەربە قەزای (کەلار) نیشتەجێن .

[٣٤] خالد مەحمود کەریم: دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لە کوردستانی باشور ١٨٦٩–١٩١٤ ،س ، پ ، ل١١٤ .

ولایــەتی بەغـداد بــووە لەگــەرمیان لەناوچــەکانی (ئاوەســپی، قــەیتول، خۆنــەوەزان) دامەزراوە لەژێر فەرمانڕەوای میر سمایلی زەنگنە بـووە کـە کـەپێچ سـەد و پـەنجا دوو ساڵ پێش ئێستا نەوشێراوان بەگ لەئێرانەوە هـاتوون، کـە ئـەوکات میرسمـایلی کـوڕی لەسەردەمی عوسمانیەکان کەسێکی ناسراو بووەو ڕۆڵی خۆی هـەبووە، ڕەنگـە لـەدوای کۆتای هاتنی سەنجەقی زەنگنە لەلوڕستان ڕویان کردبێتە ئەم ناوچـەیە ودەسـەڵاتێکی هۆزەکیان دامەزراندبێت .

لەدوای ڕووخاندنی میرنیشنی زەنگنە نەوەکانی سەید بابەکر ئاغای گەورە کاروباری هۆزی زەنگنە دەگرنە دەست. گوندەکانی ژێردەسەڵاتیان لەسـنوری سـەنگاو و بەشـێك لەقــەیتوول بــووە، ســەید بابــەکر ئاغـا کاتێـك دەوڵـەتی عوسمـانی بانگهێشـتنامە بـۆ خانەوادەی میرانی زەنگنـەی نـاردووە بـۆ ئـەوەی سـەردانی تورکیـا بکـەن، تـەنها ئـەم نەڕۆیشتووە بۆیە خۆی و کوڕەکانی پـێش ڕۆیشـتنی بنەماڵـەی مـیر خۆیـان گەیاندۆتـە ئەوبەری ڕووباری سـیروان، زۆر هـەوڵی داوە لەگـەڵ مـیر ئەحمـەدی بـرازای بـۆ ئـەوەی نەڕوات بۆ تورکیا چونکە گومـانی هـەبووە لـەم بانگهێشـتە بەمەبەسـتی لـەناو بردنیـان بێت، دواتریش هەروا دەرچوو، هەموو بنەماڵەی میر نەگەڕانەوە، تاکـە خانـەوادەی مـیر لەم قڕکردنەی تورك ڕزگاریان دەبێت ئەم خانەوادەیـە، دوای چـەندین سـاڵ مانـەوەیان لەوبەری سیروان نەوەکانی سەی بابـەکر بەسـەرکردایەتی کوڕەزاکـانی ئەحمـەد ئاغـا و محەمەد خان دەگەڕێنەوە قەیتول و ئەڕوانن پایتەخی میرنیشینەکە وێرانکراوە[٣٥] .

---

[٣٥] ئامـادەکردنی فریـاد زەنگنـە: دەستوسـی مـەلا عـەلی زالـواوی تایبـەت بەمێـژووی بنەماڵەکـەیان لەسەنگاو، ناحیەی ڕزگاری،٢٠/٣/٢٠١٩.

*سـەید بابـەکر کـوڕی نەوشـێروان بـەگی زەنگنەیـە دایکـی لەشـێخەکانی سـەرگەڵوو بـووە نازنـاوی سەیدەکەی لەدایکیەوە وەرگرتووە، ئێستایش لەگوندی قەیتول زەویەك هەیە بەناوی زەویەکی سـەی بابەکر، حەوت کوڕی هـەبووە بـە ناوەکانی(عومـەر بـەگ، مـونزر بـەگ، سـەدرەدین بـەگ، بـەدرەدین بەگ، ڕەشید بەگ، عیزەدین بەگ).

دەستەواژەی زەنگنە لەگەڵێك سەرچاوەدا بەچەند شێویەكوو لێك دراوەتەوە:

هەندێ دەڵێن لەناوچەیەکەوە سەریان هەڵداوەپێ وتراوە (زەنگ) وەکو چۆن لەئێران شاری زەنگان هەیە ڕەنگە سەرەتای ژیانی ئەم هۆزە لەم ناوچەیەوە سەری هەڵدابێ. بۆچونێکی تریش هەیە گوایە لەشکرێك بوونە (تەور) بەدەست بووە لەزمانی کۆندا بە(تەور) وتراوە: زەنگن، هەندێکی تریش دەڵێن لەناوچەی کرمانشان شیوو دۆڵێك هەیە بەناوی (زەنگە) ڕەنگە سەرەتای پێك هاتنی ئەم هۆزە لەو ناوچەوە سەریان هەڵدابێ [٣٦] .چۆنێیەتی هاتنیان بۆباشوری کوردستان ئەوە بوو ئەم هۆزە لەگەڵ فەرمانڕەوایانی ئێران تێکچوون، بۆیە لەئێرانەوە بەسەرۆکایەتی (نەوشیروان بەگ) هاتنە باشوری کوردستان. زمانەکەیان تائێستا کۆنترین شێوەی (گۆران)ی کوردیە[٣٧] .نزیکەی چوارسەدو پەنجا بنەماڵەیانیش لەپارێزگای (کەرکوك) قەزای (خانەقین) نیشتەجێن، لەکەنارەکانی کفری و ئیبراهیم خانچی و ناوچەکانی سوماك دەژین، دەستەیەکیان لەکرماشان و هەلیلانن، سەر بەعشیرەتی لوڕن، عەشیرەتی زەنگنە لەئەفغانستانیش بونیان هەیە، گومان دەکرێت لەبەلوجستانەوە روویان لەو سەرزەمینە کردبێت[٣٨] . ژمارەیەکی زۆریان لەشاری بەغداو پارێزگای دیالە نیشتەجێن[٣٩] . زەنگنەکانی عێراق سوننەن و لەشوێنێك دەژین کە بەولاتی ئەسڵی خۆیانی دەزانن مەبەست لەبەشی سەرووی (ئاوەسپی) و بەشێك لەگوندەکانی نزیك کفری لەباشوری ڕۆژهەلاتەوەیەوە نیشتەجێن، شێوەی ئاخافتی ئەم هۆزە لەشێوە زاراوەی کوردی ئاسایی ناچێ بەڵکو بەیەكێك لەزارەکانی گروپی (ماچۆماچۆ) واتە

---

*عەبدولڕەحمان ئاغا لەنەوەی مونزر بەگی کوڕی سەید بابەکری ئاغای گەورەیە، لەدەوربەری ساڵی(١٨٣٠)زاینی ژیاوە، شەش کوڕی بووە بەناوەکانی (ئەحمەد، مارف، شاسوار، عەزیز، محەمەد، فەتاح) یەك کچی هەبووە بەناوی (ئاڵتون)، ساڵی کۆچی دیارنیە. فریاد زەنگنە .

[٣٦] ساڵح هەلاج: چەردەیەکی مێژووی دەڤەری گەرمیان، چ١، ٢٠١١، ل٢٤–٢٥ .

[٣٧] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ: ناوچەی کفری لەنێوان سالانی ( ١٩١٤– ١٩٤٥)، چ١،٢٠١٠ ،ل١٨٧.

[٣٨] محەمەد مەردۆخی: س ، پ ، ل١٠٢ .

[٣٩] عەباس سلێمان سمایل: لورستان لەمێژودا ،چ١ ، ٢٠١١ ، ل٢٦ .

زاراوەی گورانییە[٤٠]. هۆزی زەنگنە لەئێران بەسەر پێنج بەشی گەورەدا دابەش بوونە وەکو تیرەی: چۆپی، کەندۆڵە، عوسمان وەند، نامبۆوەند، چەهرە. هەروەها لەناوچەی خۆراسان ژمارەیەکی زۆر زەنگنە نیشتەجێن[٤١].



نامیق ئاغای زەنگنە - عەبدالعەزیزئاغای زەنگنە -ڕۆستەم ئاغای زەنگنە-عەبدولڕەحمان ئاغا

[٤٠] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ: ناوچەی کفری لە نێوان سالانی (١٩١٤– ١٩٤٥)،س ،پ ،ل١٨٩.

[٤١] ساڵەح هەلاج: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووک، ٢٠١٦ .

## هۆزی تاڵەبانی:

تاڵەبانی لەکۆندا نزیکەی هەزار و پەنجا ماڵ بوون، لەناوچەکانی پارێزگاری کەرکوک و خانەقین بلاّو بوونەتەوە، باپیرە گەورەی تاڵەبانیەکان (مەلا مەحمود)ە کەلەناوچەی بۆکانەوە هاتۆتە باشوری کوردستان و لای مەلاکان خوێندویەتی و لەناوی هۆزی زەنگنە ژیاوە، میر سمایلی زەنگنە کچێکی خۆی داوە بەمەلا مەحمود، ئیتر بەمەلا مەحمود زەنگنە دەناسرێت، سەبارەت بەشێخایەتیان دەگێڕنەوە کاتێك شێخ محەمەدی هیندی لاهوری دەبێتە میوانی مەلا مەحمود لەگوندی (قرخ) لەوێ ماف ئیرشادی دەداتێ ، پاش کۆچ کردنی شیخ ئەحمەدی کوڕی دەبێتە مورشید(ڕێنیشان دەر)ی خەڵك دواتر دەچێتە گوندی تاڵەبان و تێیدا نیشتەجێ دەبێت و نەوەیەکی زۆر دەخاتەوە لێرەوە ناوی ئەم گوندە بەسەر ئەم هۆزەدا دادەبرێت، ئەم هۆزە لەدواتر تەکیە درووست دەکەن و بەناوچە جیاجیاکانی باشوری کوردستان بلاّو دەبنەوە، لەتەکیە بەناو بانگەکانیان تەکیەی کەرکوك، تەکیەی تاڵەبان، تەکیەی بەغداد لەلایەن شێخ عەبدولڕەحمان بەڕێوە دەبرا[٤٢].

[٤٢] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل١١٣.

## هۆزی سیامەنسور :

یەکێکە لەهۆزە کوردەکانی ناوچەی گەڕووس، ئەم هۆزە لەسەدەی دەیەمی کۆچی لەسەردەمی سەفەویەکان زۆرترین دەسەلاتی هەبووە، لەهۆزە گرنگەکانی سەردەمی سەفەویەکان بوو لەسەرەتای حوکمی سەفەوی ناوچەی گەرووس و ئازەربایجان و هەندێك ناوچەی ولاتی عەجمیان بەدەستەوە بوو، سیامەنسور واتا ڕەشمەنسور، مینوڕسکی ناوی هۆزی سیامەنسور لەگەڵ فەیلیەکان، بەختیاری، ئەردەلان، چنگنی، گەرووس، زەنگنە، هتد... وەك هۆزی کورد دەهێنێ .

لەشەرەفنامە سەبارەت بەمیرانی کوردانی ئێران هاتووە: بەگشتی میرانی کوردی ئێران سێ دەستەن، سیامەنسور، چنگنی، زەنگنە، ئەوەی لەسەر زارانە و دەڵێن ئەوان لەبنەڕەتدا سێ برابوون، کە لەولاتی لوڕ هاتوون هەرسێ گەیشتوونەتە پلەی میرایەتی و خەڵکانێ وەك ڕەعیەت لەدەوریان کۆبوونەتەوە بەناوی ئەوان ناسراون و ناوبانگیان دەرکردووە . ئەم هۆزە لەباکوری ڕووباری قەزلێ ئوزون لەناوچەی گەرووس * نیشتەجێ بوون و تانزیکی ئەنگورانی زەنجان دەچوون و ناوەندی سەرەکیان جافرئاوا ناوەندی ناحیەی سیامەنسوری ئێستا بوو، کە بەشێکە لەقەزای بیجاری پارێزگای سنە، لە سەردەمی سەفەویەکان (دەوڵەتیار خان)ی سیامەنسور لەئازەربایجان و گەرووس حکومەتێکی پێکهێناو توانی بۆ چەندجارێك سوپای شاعەباس تێك بشکێنی، بەلام پاشان بەدیل گیراو شا بەمەبەستی پێشگرتن لەئەگەری شوڕشێکی تر لەلایەن ئەوانەوە بەشێکی زۆر کەمیان نەبێت لەزێدی خۆیان گەروس هێشتەوە، زۆریان گواستەوە بۆ خۆراسان یەکێك لەوشوێنانە سیامەنسور لەخۆراسان تێدا نیشتەجێ بووە ناسراوە بەچەشمەی کانی، کەسیامەنسوریەکان ئاژەڵداریان تێداکردووە .

### میرانی سیامەنسوور :

١- خەلیل حانی سیامەنسور: میری نجاس و سیورلق .

٢- ئیمام قولی سیامەنسور: میری ئێسفەراین .

٣- ڕەزا قولی سیامەنسور: میری قەلای بست و زەمین داود لەکەندەهار .

٤- میرزا قولی سوڵتان: میری کەرەشك .

٥- دەوڵەتیار خـانی سیامەنسـور: مـیری ئازەربایجـان و گـەس و هەنـدێك ناوچـەی تر[٤٣] .

## هۆزی باجەڵان :

مەیجەرسۆن لەسـاڵی ١٩١٠ی زایـنی دەڵـێ: ئێسـتا باجـەڵان نیشـتەجێی ناوچـەیەکن بەدرێژی کەناری چـەپی ڕووبـاری دیالـەدا، پێشـتر بـۆ ماوەیـەکی دوور و درێـژ لـەنێوان باشور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان لەمبـەر و ئەوبـەری کرنـدا بـوو، باجـەلان ئێسـتا دابـەش بوون بەناو بەشەکانی خـاکی ئێـران دا، لەلایـەن چـاودێری حکومـەتی ئێـران چـاودێری هەڵسـوکەوتیان دەکـرێ ،چـونکە بەهێرشـەکانیان کێشـەیەکی گـەورەیان بـۆ تورکیـا سازاندووە کاتێ بەسنورەکانیان دا تێدەپەڕن، ئەم خێڵە لەبەر ئەوەی خەڵکی سـەرەڕۆ و لاساریان زۆرە، زۆرجار دەبنە هۆی بەرپاکردنی ناکۆکی لەگەڵ خێڵی گۆران دا[٤٤] .

---

٤٣ ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد،٢٠/٦/٢٠١٨ .

*گەڕووس: ناوچەیەکە لەڕۆژهەڵاتی کوردستان، ئەم ناوچەیە لەکۆندا زۆربـەی کوردسـتان، هەمـەدان، زنجان، قەزوینی دەگرتەوە، ناوەندی ناوچەی گەڕووس شـاری بیجـار بـوو، ئێسـتا بیجـار یەکێکـە لـە شارستانەکانی کوردنیشنی ڕۆژهەڵاتی کوردستان .

٤٤ مەیجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ ، ل ٨٩ .

مەیجەرسۆن: ناوی تەواوی (ئیلی بانیستەر سـۆن)ە لـە١٦ی ئـابی سـاڵی ١٨٨١ لـە(کنزنگتن) لـەدایك بـووە، سـۆن لەناوبنەماڵەیەکەیـدا پیاوەکـانی بـەدانایی و کەشـخە و قـۆزی بـەناوبانگ بـوون، سـۆن بەرلەوەی خوێندن تەواو بکات لەساڵی (١٨٩٨)ەوە نیـازی سـەفەری ڕۆژهـەڵاتی لەسـەردا بـوو بـەڵام تاسـاڵی (١٩٠٢) بـۆی نەڕەخسـا، سـاڵی (١٩٠٢) دەچـێتە ئێـران، دوای یـەك سـاڵ مانـەوە لـە(تاران) دەچێتە (یەزد) دەست دەکات بە وەرگێرانی چوارینەکانی عومەر خەیام، دواتـر دەچـێتە (بوشـەهر) و پاشان لە (شیراز) دەبێتـە ژمێریـاری بـانکی شاهەنشـانی ئێـران، لەوسـاتەوە خولیـای ئـاینی ئیسـلام

لەکتێبی لورستان ئـەلکبری نوسـینی د.ڕەمـەزان شـەریف: ئامـاژە بـەوەکراوە هـۆزی باجەلأن لەناوچـەی لوڕسـتان لەشـەش تـیرە پێکهـاتووە بـەناوەکانی (بـاجوو، باجلنـد، بجوران، باج الان، باجلان، باجلوند)، لەسـەردەمی کـەریم خـانی زەنـد دەورێکـی بـالأی گێراوە لەپاراستنی فەرمانڕەوای کەریم خانی زەند لەشیراز، لەدوای ڕووخاندنی حوکمی زەندیەکان لەسەر دەستی قاجاریەکان توشی ڕاوەدوونان و قات و قڕو کۆچ هاتوون[٤٥] .

هۆزێکن بەدرێژی کەناری چەپی ڕووباری دیالەن، هـۆزی باجـەلأن لەئێسـتادا دابـەش بوون، ئەم هۆزە لەدوو لقـی سـەرەکی پێکدێت وەك (جومـور، قـازانلوو)، هـەر کامیـان کۆمەڵە تیرەیەکی لەخۆگرتووە، تایفەی جمور ئـەم تیرانـە لـەخۆدەگرێت. وەك (ژوولـە، عەبدوولی، کۆمەئی، شاوەیسی، چرغی). دانیشتوانی ئەم تیرەیـە لەسـەردەمی ڕابـردوو پێنج سەد تا نۆسەد خێزان بوونـە. دیـارە ئێسـتا ژمارەیـان زیـادکردووە، ژمارەیـەکیان لەقەزای کەلار لەگەڕەکی(حەمەی کەریم) نیشتەجێن جمورەکـان سـەرەتا لـەپارێزەرانی سنورو پاشـایانی باجـەلأن بـوون، ئـەرکی پاراسـتنی سـنوریان لەئەسـتۆدا بـووە، پـاش هێرشی (نادرشـای ئەفشـار) بۆسـەر زەهـاو و تێکشـاندنی (ئەحمـەد خـان)ی باجـەلأن، لەعەشـیرەت هاتنـە دەرەوە بـەهۆی ئـەوەی زەوی کشـتوکاڵیان نـەبوو، ڕوویـان کـردە ژیانی کۆچەری و ئێستاش ژیانی بەشێکیان بەئاژەڵداریەوە گرێدراوە .

---

دەبێـت لـەژێر کاریگـەری ئاخونـدەکانی شـیعە سـاڵی (١٩٠٥) دەبێتـە ئیسـلام، سـاڵی (١٩٠٧) بـۆ ماوەیەکی کورت دەگەڕێتەوە بـۆ بـەریتانیا، لـەدوای ئـەوە بـەناوی خـوازراوی (مـیرزا غـولام حوسـێن شیرازی) گەشتێکی دوور و درێژ بـەناو (میزۆپۆتامیـا، کوردسـتان) دەکـات، سـاڵی (١٩١٩) کاروبـاری ناوچـەی سـلێمانی پێدەسـپێرن و زۆر نابـات پەیوەنـدی سـۆن و شـێخ مـەحمود تێکدەچـێت، دواتـر ئینگلیز بەئاگر وئاسان دەکەونە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینـە چـەکداریەکەی شـێخ مـەحمود، سـۆن کـەم دەرکەوت بۆ ئەوەی دەیویست سامێك بۆ خۆی پەیدا بکات، کە دەریش کەوت یا بـەبازاڕدا دەڕۆیشـت دەبوو خەڵکەکە بەجارێ هەستنە سەر پێ و هەموو کڕنوشی بـۆ ببـات، سـۆن یەکـەم کەسـە فرمـانی دەرکرد لەسلێمانی بەکوردی ڕۆژنامە دەربچێت، بەناوی ڕۆژنامەی پێشکەوتن، لـەڕۆژی ٢٤ی شـوباتی ١٩٢٣ کۆچی دوای دەکات .

[٤٥] ئا ڕێبوار حاجی نامیق: تۆڕی کۆمەلأیەتی فەیس بووك، هۆزی گەورەی لەك .

شوێنی (جمور)ەکان ئەو پێدەشتەیە کە بەباجەلان ناسراوەو سنورەکەی بەم شێوەیە: لەباکورەوە جۆباری (جدول)عەباسان، لەباشورەوە ڕێگەی قەسری شیرین_کرماشان*، لەرۆژهەلاتەوە گردۆلگەی داری دیوان و بێشکان، لەرۆژئاوەشەوە ڕوباری سیروان و بەرزایەکانی ئاغ داغ[٤٦]. لەچوارچێوەی ویلایەتی بەغداد لیوای باجانلو کە (دومنزبەگ) میرێتی کردووە، پاش مردنی والی بەغداد لەسەر پێشنیاری سەرۆکەکانی باجەلان ڕەزامەندی دەردەبڕێ لەسەر دانانی (دلاوەر پاشا)ی ئامۆزای میر دومنزبەگ بەمیری نوێ لیوای باجەلان، لەسالی ١٦٢٣ بەغداد لەلایەن دەسەلاتی سەفەویەکانەوە داگیر دەکرێت و باجەلانەکان دەبنە بەشێك لەدەولەتی سەفەوی، پاش گرتنەوەی لەلایەن عوسمانیەکان لیوای باجەلان دەگەڕێتەوە ژێر دەسەلاتی عوسمانیەکان لەوکاتەدا (عوسمان بەگ) سەرۆکایەتی باجەلانی کردووە، لەدوای پەیمانی زەهاو لەسالی ١٦٣٩ز سولتان موڕادی چوارەم ناوچەی درنە کەخاکی هۆزی کەلهۆڕ بووە پێشکەشی هۆزی باجەلانی کردووە، لەسالی ١٧٠٠زاینی کەلهوڕەکان بەچاوپۆشی فەرمانڕەوای کرماشان باجەلانەکان لەو ناوچەیە دوور دەخەنەوە تا پێدەشتەکانی زەهاو، پادشاکانی باجەلان شاری زەهاویان دروستکردووە، باجەلانەکان پاش سەدەی هەژدە (ئەرقود بەگ) سەرۆکیان بووە، لەدابەشکردنە کارگێڕیەکانی دەولەتی عوسمانی ناوی هاتووە، پاشان (محەمەد بەگ)ی ئامۆزای دەبێتە سەرۆکیان، لەقۆناغی (عوسمان بەگ)ی سەرۆکی باجەلان هەردوو سەنجەقی (درنە و دەرەتەنگ) دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی ئەم هۆزە ڕۆلیان دەبێت تاسالی ١٧٣٠زاینی، بۆیەکەم جار عوسمانیەکان نازناوی پادشا دەدەنە

---

[٤٦] مەزاهر باجەلان: ئێلی باجەلان لەسەفەوییەکانەوە تاکۆتای قاجارەکان، و جەلیل مورادی، کاروان عوسمان خەیان ،چ١ ،٢٠١٤ ،ل٢٦– ٣٠ .خالد مەحمود کریم: دەولەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لەکوردستانی باشور ١٨٦٩–١٩١٤ ،چ١ ، ٢٠١٢ ،ل١٠٤–١٠٦ .

ئەحمەد پاشای باجەڵان، ئەم سەرۆکەیان لەبەرامبەر نادرشای ئەفشار جەنگاوە لەو پێناوە ئەشکەنجەی زۆری چەشتووە، ناوچەی زەهاو دەکەوێتە بەر شالاوی هێرشی پەلامارەکانی کەریم خانی زەند، خەڵکەکەی ئاوارە دەبن و ڕوودەکەنە ناوچەکانی موسڵ، جیمس بیکنگهام لەساڵی ١٨١٦ دێتە ناوچەی باجەڵان و زەهاو دەڵێت نزیکەی سێ سەد گوندیان هەبووەلەزەهاو لەوکاتەدا (عەبدولفەتاح) سەرۆکایەتی باجەلانی کردووە، لەساڵی ١٨٢٠ کلۆدیۆس جیمس ڕیچ لەبنکورە دەبێتە میوانی حەسەن ئاغای باجەڵان و میواندارییەکی شایستەی دەکات، پاش هاتنە سەرکاری (محەمەد عەلی) شای قاجار لەسالانی (١٧٩٧–١٨٣٤) زاینی پەلهاویشتنی بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی میرنیشنی بابان ناوچەی زەهاو دەکەوێتە دەستی شای قاجار و باجەلانەکان ناچار دەبن لەزەهاوە بێنە بنکورە[٤٧]. مەردۆخی دەڵێت: باجەڵان بەشێکن لەهۆزی لەك، نزیکی هەزار و سێ سەد خێزانن، لەناوچەکانی قورەتوو و هۆرێن و شێخان و قەسری شیرین و قازانیەی مەندەلی نیشتەجێن، لەناوچەکانی دەرگەزێن و دەوروبەری قەزوین نزیکی حەفتا خێزان دەبن[٤٨] . تایفەی جمورییەکان بریتین لە(سەگەوەند، حاجیلەر،

---

[٤٧] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل١٠٧–١٠٨.

[٤٨] شێخ محەمەدی مەردۆخ : مێژووی کورد و کوردستان ،و زانەر محەمەد ،چ١ ،٢٠٠١ ،ل٨٥ .

*کرماشان: لەوشەی کرمانجان وەرگیراوە، کرمانجان یان کرمانجان ناوی هۆزێك بوو پێش هاتنی مادەکان، مانج هۆزێکی زەردەشتی بوولەم ناوچەیە ژیاوە، کرماشان یەکێکە لەپاریزگاکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان، بەنۆیەمین شاری گەورەی ئێران و گەورەترین شاری کوردنیشین لەئێران و گرنگترین شار لەناوچەی ناوەندی ڕۆژئاوای ئێران، لەسەدەی چوارەمی زاینی تاسەردەمی هێرشی عەرەبە موسڵمانەکان وەك دووەمین پایتەختی ئێمراتۆری ساسانیەکان بوو، لەسەردەمی سەلجوقی گەورەترین شاری کوردستان بوو بەناوی قەرمیسین .

غەریبەوەند، شێرەوەند، چوارکلاو، مەمەوەند، داودە وەند، جـەلیل ئاغـا)[٤٩]. هەرچـی تایفەی (قازانلوو)ەپێك هاتووە لەلقەکانی (قازانلوو، قەریبەوەند، فلەوەند، خدرەوەنـد، زووزەوەنـد، قەسرەوەند(غەریبوەند)،سـەیگەوەند، حاجیلـەر، سـارووجە، جوبـورلی، هیوانای گراوەند، چوگرلوو، شێرەوەند، چـوارکلاو،مەمەوەند، داودەوەنـد). نـاوی ئـەم تیرانەش هاتووە: (حاجی خەلیل، والی ئاغا، عەبدولرەحمان ئاغا، جەلیل ئاغا) دوولقـی تـری (قـازانلوو) هـەن یەکـەمیان لەناوچـەی (بـاییوخ–بـابوك)ی نێـوان زێ و موسـڵ دا دەژین، دووەمیشیان لەنزیك کەرکوك . هەرچی شـوێنی (قازانلوو)ەکانیشـە سـنورەکەی بەم شێوەیە، لەباکورو ڕۆژئاواوە (ڕوباری سـیروان) لەباشـورەوە بـاوەپلاوی و جـەوەڵ مرواری، لەڕۆژئاواوە ئاغ داغ[٥٠]. عباس ئەلعزاوی دەڵێ: شـوێنی سـەرەکی باجەلانـەکان دەگەڕێنێتـەوە بـۆ ناوچـەی ئامـەد (دیاربـەکر) لەکوردسـتانی تورکیـاو لای چـەپی کەنارەکانی دیجلە لەبەشی باکوری ڕۆژهەلاتی موسڵ، کەپەیتا پەیتا بـەرەو ناوچـەکانی بـاکوری خانـەقین و بنکـورە و دەوروبـەری سـنوری زەهـاو درنـە و دەرەتـەنگ ڕاگوێزراون[٥١]. مینۆرسکی* کەڕۆژهـەلات ناسـێکی ڕوسـیەو زمـانی کـوردی زانیـووە، بـە

---

[٤٩] مێجـەرئی. بـی. سـۆن: چـەند سـەرنجێك دەربـارەی هۆزەکـانی کوردسـتانی خـوارو، و نـەجاتی عەبدوڵلا، چ١ ،چاپخانەی شڤان– سلێمانی ،٢٠٠٧ ،ل٣٥ .

[٥٠] مەزاهر باجەلان: ئێلی باجەلان لەسەفەوییەکانەوە تاکۆتای قاجارەکـان،و جـەلیل مـورادی، کـاروان عوسمان خەیان، چا ،٢٠١٤ ، ل٢٦– ٣٠ و خالـد مـەحمود کـریم : دەوڵـەتی عوسمـانی و عەشـیرەتە کوردەکان لەکوردستانی باشور ١٨٦٩–١٩١٤ ، چ١ ، ٢٠١٢ ، لل١٠٤–١٠٦ .

[٥١] **عباس العزاوي المحامي: موسوعة عشائرالعراق ، ط١ ، ١٩٤٧ . ل١٨٢- ١٨٤ .**

* مینۆرسـکی: کوردناسـێکی ڕوسـیە نـاوی تـەواویی ڤلادیمیرڤیـودور ڤـیچ مینۆرسـکیە لەسـاڵی ١٨٧٧/٢/٥ز لەشارۆچکەی کورجیڤای سەر ڕووباری ڤۆلگا لەباکوری ڕۆژئاوای مۆسکۆ لەدایك بووە، لەسـاڵی ١٩٦٦ لــە لەنــدەن کۆچــی دوای کــردووە، لەسـاڵی ١٩١٥دەڵــێ کوردەکـان نــەوەی

گێڕانـەوە لەڕاولینسـۆن دەڵـێ: باجەڵانـەکان لـەڕۆژگارانی کـۆن دا لەدەوربـەری موسـڵ ژیاون، لەلایەن سـوڵتان (مـورادی چـوارەم)ی عوسمانیـەوە لەسـاڵی (١٦٣٠یـان١٦٣٩)ز بەسـەرکردایەتی عەبـدوڵڵا بـەگی باجـەڵان، هێنـراون بۆناوچـە سـنوریەکانی (ئێـران، عوسمانی) بەتایبەت زەهاو، دواتر هـۆزی کـەڵهوڕ لـەزەهاو دوردەخرێتـەوە و پاراسـتنی ئاسایشی ناوچەکە دەرێتە ئەوان، لەوێدا لەگەڵ خـەڵکانی گـۆران تێکـەڵ بـوون، لێـرەدا دەبن بەشیعەو لەناوگۆرانەکان ئەتوێنەوە[٥٢]. سەبارەت بەناوی باجەڵان هەندێك دەڵـێن ڕەنگە لەوشەی (باجنـاق)ەوە هاتبێـت، کـە وشـەیەکی تورکیـە بـەمانای وەرگـیری بـاج دێت[٥٣]. مامۆستا ئیبراهیم باجەڵان پێی وایە ناوی باجەڵان لەواجەوانـەوە هـاتووە، کـە پیاوی ئـاینی زەردەشـتی بـوون و لەئاتشـگاکاندا خزمـەتیان کـردوو[٥٤].نـاوی باجـەڵان بۆیەکەم جـار لەنوسـراوە مێژووییـەکانی سـەردەمی سـەفەوی، یـەك سـاڵ دوای مردنـی شاعەباس هاتووە: نـاوی باجـەڵان لەسەرچـاوە مێژوویـەکان بەچـەندین شـێوە هـاتووە وەك: (باجــەوان، باجەڵەنــد، بــاج ئــالان، بــاجیلان، باجەلوەنــد، باجلاوەنــد). لــە بەڵگەنامەکانی عوسمـانی ئـەم هـۆزە بـەم شـیوەیە نـاوی هـاتووە (بـاجوانلو، بـاجوان، باجەڵان). کەلەڕاستیدا هەر هەمان باجەڵانە، بەهۆی شێوەزاری لـوڕی و تێکـدانی نـاوی عەشـیرەتەکان لەنوسـراوە فەرمیـەکانی (سـەفەوی، عوسمـانی) جابـەهۆی نـەزانینی زمانیان بێت یان بەئەنقەست. باجەڵانیەکان بەگشتی موسڵمانن و دابەش بوونـە بەسـەر

---

کاردۆخیەکانن، بـەڵام دواتـر پـاش گەزدەبێتـەوە لەسـاڵی ١٩٣٨ لـەکۆنگرەی بیسـتەمی ڕۆژهـەڵات ناسی کوردەکان دەباتەوەسەر میدیەکان .

[٥٢] مەزاهر باجەڵان: ئێلی باجەڵان لەسەفەوییەکانەوە تاکۆتای قاجارەکان س ، پ ،ل١٦ .

[٥٣] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل٨٠–٨٧.

[٥٤] گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ نەجم باڵان: کەلار، ٢٠١٩/٣/١٨ .

هەردوو مەزهەبی (شیعە، سونە) مەزهەبی باجالأنـەکانی لوڕستان* و قـەزوین** و ئـەو بەشەی لەکرنـد و کرماشـان نیشـتەجێن شـیعەی دوانـزە ئیمـامن. باجەلأنـەکانی زەهـاو سونەی شافیعین گروپێکیان شیعەن، بەلأم زۆربەی باجەلأنـەکانی دانیشـتووی باشـوری کوردسـتان سـونەی شـافیعین. هـەروەها لـەنێو باجەلأنەکانـدا خـەڵکانێکی زۆر هەیـە پـەیڕەوی ئـاینی یارسـانن(کاکەیی)، بەشـی زۆریـان دەکەوێتـە نێـوانی کرماشـان و هەمـەدان. مینۆرسـکی دەنووسـێ: باجەلأنـەکان پـاش کۆچـکردنیان لەموسـڵ لەگـەڵ خەڵکی گـۆران تێکـەڵ بـوون، زمانیـان کـە کرمـانجی بـوو، تووشـی گۆڕانکـاری هـاتوو، شێوەزاری باجەلأنی پێك هـات. ئامـارێکی تـەواو لەبەردەسـتە نیـە ڕێـژەی دانیشـتوانی هۆزی باجەلأن و تایفەو تیرەکانی لەڕابردوو ئێستا دیاری بکات، بۆ دەرکەوتنی ژمـارەی مەزندەیی باجەلأنەکان تیشکێك دەخەینە سەر هەندێك نوسراوە: محەمەد زەکـی بـەگ: ڕێژەی باجەلأنەکانی نیشتەجێی پارێزگای کەرکوك و خانەقین بەهەردوو تیرەی (جمور، قـازانلوو) بەهـەزارو سـێ سـەد بنەماڵـەی نیشـتەجێ و کشـتوکاڵ کـار ئـەژمار دەکـات. مەردۆخی کوردستانی باجەلأنەکانی زەهاو بەلقێك لەعەشیرەتی لەك دەزانـێ و بـەنزیکی بەهەزارو سێ سـەد بنەماڵـە ئـەژماریان دەکـات لەناوچـەی قۆرەتـوو، هـۆرێن، شـێخان، قەسری شیرین، قازانییەی مەندەلی. ڕابینۆ ڕێژەی تەقربی باجەلأنەکانی بەشەش سـەد

---

** *پارێزگای لوڕستان: یەکێکە لەپارێزگاکانی ئێران، لەساڵی ٢٠٠٦ ژمارەی دانیشـتوانی یـەك ملیـۆن و شەش سەد و هەشتا و نۆهـەزار و شـەش سـەد و پـەنجا کـەس بوونـە، ناوەنـدی پارێزگاکـە شـاری خوڕەم ئاباده .

*پارێزگای قەزوین: یەکێکە لەپارێزگاکانی ئێران ناوەندی ئـەم پارێزگایـە شـاری قەزوینـە، لـەباکوردا لەگەڵ پارێزگای گەیلان، لەڕۆژهەلأتدا لەگەڵ پارێزگای تـاران، لـەباکوری ڕۆژهـەلأت لەگـەڵ پارێزگـای مازندەران، لەباشوری لەگەڵ پارێزگای مەرکەزی، لەڕۆژئاوای دا لەگەڵ پارێزگای زەنگان و لەباشـوری ڕۆژئاوای لەگەڵ پارێزگای هەمەدان هاوسنورە .

بنەماڵە زانیوە. هێنری ڕاولینسۆن ڕێژەی باجەلانەکانی دەوروبەری (بروجەرد)*[56] بەدوو هەزار بنەماڵە زانیوە. مامۆستا سوڵتانی ڕێژەی دانیشتوانی باجەلانەکانی لەناوچەی زەهاو خانەقین بەدوو هەزار بنەماڵەی نیشتەجێ زانیوە ...هتر[57]. ئەمڕۆ باجەلان پەرت و بلاون لەدەیان ناوچە جگەلەباشوری کوردستان نیشتەجێن لەقەزای وارمین لای تاران دوو هەزار و حەوت سەد ماڵ باجەلان لەوێ نیشتەجێن، لەکامیران لەنێوانی کرماشان و سنە٤٠/ خەڵکەکەی لەهۆزی باجەلانن، ٤٠/خەڵکەکەی هەورامین و ٢٠/ خەڵکەکەی لەکەڵهوڕ و سۆران تێکەڵن، لەکوردستانی غەریب(خۆراسان) زیاتر لەچوار ملیۆین و نیو کورد هەن،لەدوای سەردەمی کەریم خانی زەند بەشێکی زۆر لەباجەلانەکان کۆچیان کرد بۆ خۆراسان ئێستا ژمارەیان دەهەزار خێزان دەبن، لەئەفغانستان لەبەینی قوندوز و کابول ناوچەیەك هەیە بەناوی باجەلان زۆرینەی خەڵکەکەی لەهۆزی باجەلانن، هەروەها لەغازی عەنتاب لەنێوان تورکیا و سوریا ژمارەیەکی باجەلان هەیە[58].

---

*بروجەرد لەشارەکانی ڕۆژئاوای ئێرانە و دەکەوێتە باکووری دەشتی بە پیتی سیلاخۆر لەپارێزگای لوڕستان، نزیکە لەشارەکانی نەهاوەند و هەمەدان و شازەند و ئەرك و خوڕەم ئاواو ئەلشتەر .

[57] مەزاهر باجەلان: ئێلی باجەلان لەسەفەوییەکانەوە تاکۆتای قاجارەکان ،س ،ل٢٦ –٣٢ .

[58] گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ نەجم بالان: کەلار، ٢٠١٩/٣/١٨ .









وەلی ئاغای باجەلأن – ڕەشید ئاغای باجەلأن –مستەفا پاشای باجەلأن –چەند ژنێکی ناوچەی بنکورەی کون

## هۆزی چنگنی:

ئەم هۆزە یەکێکن لەهۆزە گەورەکانی کورد و لەدێر زەمانەوە دەسەلأت وجێگەو شوێنی خۆیان هەبووە. لەڕووداوە مێژوویەکاندا حیسابی تایبەتیان بۆکراوەو ڕۆڵی تایبەتیان نواندووە، ناوی ئەم عەشیرەتە دێرینە وەك زۆربەی ناوی عەشیرەت و هۆزەکانی دیکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە وەك (چەکەنی، چوکنی، شاجەنگیزی ، چنگی) تەواوی ئەو ناوانە بەم عەشیرەتە وتراوە، هۆی گۆڕنکاری ناوی زۆربەی عەشیرەتە کوردەکان دەگەڕێتەوە بۆ هۆی زمانەوانی، وەك زانراوە بە درێژایی هەشت سەد بۆ هەزارساڵ هۆزە کوردەکان لەژێر فەرمانی دەسەلأتدارانی گەورەی تورك و عەجەم و عارەب دا بوونە، کاربەدەستانی ئەو دەسەلأتانە لەنامەکانیاندا، لە پەیوەندییەکاندا و ڕووداوەکان بەگوێرەی زمانی خۆیان وشەو واژە و ناوی کوردیان

بەزماندا هاتووەو ئەو بەهەڵە زمان بەکارهێنانە بووەتە هۆی گۆرانکاری زۆری ناوەکان وەك (تاوگۆزی بووەتە تاوجوزی، سەدانی بووە بەزیائودینی، گەلاڵی—جەلالی. هتر)[٥٩] .

شەرەفخانی بەدلیس لەکتێبەکەی خۆی لەشەرەفنامە دەڵێت :

ئەم هۆزە لەناوکوردی ئێراندا لەهەموو ئازاتر وبەسام هەیبەت و سەربەرزی دا لە گشتیان دەست بالآتربوو، بەلاّم لەپاش ئەوەی بێ سەردارو سەرۆك مانەوە لەمیرو میرزادەکانیان سەرۆکێکی بەکاریان نەما، وەك گەلەمەڕی دوور لەشوان پەرش و بلاّبوونەوەو هەرپارچەی لەشوێنێکدا گیرسانەوەهەندێکیان چوونە (باشوری کوردستان) هەندێکیان چوونە (ئازربایجان) لەوێ ڕێگریان کرد لەبازرگان وکاسبگەرو کاروانی ئێرانی، ئەوانیش هاواریان بۆ شاتەماسب نارد دادیان لەدەست چنگیان کرد، شاش فەرمانێکی دەرکرد کە لەشکری و خەڵکی تریش لەهەر جێیەك (چنگنی) ببینێ بیکوژێ و ماڵی بەرێ وئەبێ لەهەموو لایەکەوە لەئێران بچنەدەرەوە بۆ کوێ دەچن بچن، پێنج سەد کەسێك لەو چنگنیانە بەنیازی چوونی هندستان ڕووبە خۆراسان بەڕێکەوتن[٦٠] .

سەرەتای دەرکەوتن و بەهێزبوونی ئەم تیرەیە هۆزە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٩٥٥ك — ١٥٤٩ز) ،عەلی سوڵتانی چنگنی کە میری ئەم هۆزە بووە، قەلاّی وان و سنورەکەی دژ بەعوسمانیەکان پاراستووە و تەنانەت کە سوڵتان سلێمان هاتووە خۆی لەبەر ئەم میرە کوردە ڕانەگرتووە و پاشەکشەی کردووە ،دوای ئەوەی بێ میر و سەردار مانەوە پەرتەوازە و بلاّو بوونەوە هەریەك لەشوێنێك بەشێکیان لەعێراق هەندێکی کەیانی لە ئازەربایجان، سەردەمێك وای لێهات ڕێگریان لەخەڵك کرد هاوار و بێ دادی بەرزبوویەوە بۆ (شاتەهماسب) ئەویش فەرمانی دەرکرد بۆ سوارەی حوکمی لەکوێ هەر چگنیەکتان بەرچاو کەوت بیکوژن[٦١] .

---

[٥٩] خسرەوجاف : س ، پ ،ل١٥٤— ١٥٦ .

[٦٠] میر شەرەف خانی بەدلیسی: س ، پ ، ،ل٤٣٣ .

[٦١] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ل٢٧٩.

ئەم عەشیرەتە دەکەونە بەر شالأوی ئەم شا خوێنڕێـژە، لەبەرئـەوەی ئـەم عەشـیرەتە کوردە لەکوردەکانی خۆرەسان بوونە زۆرتر لەسنوری ڕژهەلأتـەوە نـزیکتر بوونـە پـەنا دەبەنە (هەرات) کە ئەو کات فەرمانڕەوای ئەو دەڤەرە (قوزاق خانی تەکولو) بووەو لـە شاتەهماسب نیگـەران و نارەحـەت بـووە، پـەنایان دەداو و ڕێـزو حورمـەتێکی زۆریـان لێدەگرێت و لەدەڤەری (غەجەرستان)دا کەوتوونەتە نێـوان هـەرات و کـابولی ئێسـتاوە، لەوێدا نیشتەجێیان دەکاو ماڵ و موڵکی ئەوناوچەیان پێ دەسپێرێت. شاتەهماسب کـە دی هۆزی (چکنی) وا ڕێزلێگیراوە لەولأتەکەیدا نیشتەجێ بوونە، کەوتە دڵدانەوەیان وبە پێی فەرمانێکی شاهی فەرمانڕەوای بـۆ گێڕانـەوە بـەناوی ئـەمیرێکیان کـەناوی (بـۆداق بەگی چگنی) بوو بۆداق بەگ کەوتە تەقەلای گەڕانـەوەی عەشـیرەتەکەی بۆخۆراسـان و نێوان دەرباری سەفەوی عەشیرەتی چگنی هەتاکو دوای نەمانی (شاتەهماسب)یش هەر لەپتەویدا بووە[٦٢] . نزیکەی سـێ هـەزار بنەماڵـەیان، لەسـپی روود و دۆڵـی گاوشمـار و ڕوباری کەشکان و ڕوباری خوڕەم ئاباد و چیای ملە شوانان نیشتەجێن .

هەزارو پێنسەد بنەماڵەیان لە کەنارەکانی قـەزوێن دەژیـن، سـێ سـەد بنەماڵـەیان لـە پارێزگـای (کـەرکوك، سـلێمانی) گـەرۆك بـوون، سـێ سـەد بنەماڵـەیان تێکـەڵ بـە قەشقانیەکان بوون و لەناوچەکانی سەیمەرەم نیشتەجێ بوون[٦٣] .

لەناو ئەم هۆزەدا پیاوانی ناودارو گەورەیان زۆرتێدابووە وەك :

١- عاشور خانی چگنی کە کراوەتە حاکمی (مەرو) و (شهیجان) .

٢- عەلی سوڵتان خانی چگنی کە قەلأداری (وان) .

٣- محەمەد سوڵتان چنگنی حاکمی قەرەباغ بووە .

کاتێـك عـەلی سـوڵتان خـانی چـنگی دەکرێتـە فەرمانـدەی (قـەلأی وان) زۆر لـە عەشیرەتەکەی لەگەڵ خۆیدا دەگەڕێنێتەوە بۆ کوردستان بەگوێرەی زەمـان بەشـێکیان

---

[٦٢] خسرەوجاف : مێژووی هۆزی جاف ، چ١ ، ٢٠١٣ ،ل١٥٤- ١٥٦ .

[٦٣] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل٩٤ .

تێکەڵ بەئێلی جاف دەبن، بەتایبەت لەگەڵ تیرەی رۆغزایدا، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٦٦٢) واتە بە ٣٥٦ لەمەوبەر، ئەمڕۆ براگەورە قسە بیسراوی ئەم هۆزە لەناو جاف (عومەر حاجی محەمەد) لەدێی دەمرکان نیشتەجێیە[٦٤]. میجەر سۆن دەڵێت : چگنی هۆزێکی تەواو کۆچەرین، سێ سەد بنەماڵەن دووسەد ئەسپ و سێ سەد سوارەیان هەیە، لەزستانان لەبناری چیایەکانی (پیرەمەگروون) لەباکوری ڕۆژئاوای (سلێمانی) لەداوێنی چیادا بەئاراستەی قەڵاچۆلان نیشتەجێ بوون، هاوینانیش لە(مەرگە) دەژیان ،لەناو ئێران دا ڕێگری دەکەن و زۆر دژە ئێرانین، هۆزێکی سوونی شافیعین ،تورکەکان هیچ کات نەیانتوایوە باجیان لێبسەنن یان سزایان بدەن[٦٥] .

ئێستا بەتەواوی نازانرێت ئەم هۆزەی گەورەی کورد لەکوێ نیشتەجێن، بەلام سێ هەزار ماڵێکی ڕەوەندیان زستانان لای هەڵەبجە و هاوین لە(ڕاغە) دەژین، ڕەنگە ئەوانی لەئەفغانستان بن، هەندێکیایشیان لەناوچەی دەمەدکان و عارف ئاوا و فەرەج ئاوان[٦٦] .

---

[٦٤] خسرەوجاف : س ، پ ،ل١٥٤– ١٥٦ .

[٦٥] مێجەرئی .بی . سۆن : چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خوارو ، و نەجاتی عەبدوڵلا، چ١ ،چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ،ل٣٥ .

[٦٦] مەلا سۆران گەرمیانی : مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ل١٨١.

## هۆزی هەمەوەند:

مارك سایکس دەڵێت: هەمەوەند هەزار و دووسەد خێزانن، ئازاترین و زیرەکترین خێڵن لەناو خێڵەکانی کوردی بابانیدا. سوارچاك و نیشان شکێنی باشن و لەئاسنگەری و کشتوکاڵدا شارەزان[٦٧] . مامۆستا علائەدین سەجادی لەکتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی دەربارەی هۆزی هەمەوەند بەم شێوە نووسیویەتی:

لەدەوروبەری ساڵانی (١٧٠٠)ی زاینی (خوداده شەل) ناوێك لەهۆزی هەمەوەندی دەوربەری کرماشان، بەناوبانگی (شێخ ڕەزای هەنگەژاڵە)وە لەهەوارگەی خۆی ئەپەڕێ و بەناو بانی زەهاودا دێ بۆ بناری (پێنجوێن) و ئەچێتە دێی (هەنگەژاڵە) بۆ لای شێخ و ئەبێ بەدەروێشی شێخ ڕەزا و ماوەیەکی پێ ناچێ شێخ لەهۆزی تیلەکۆ کچێکی بۆ دێنێت ،خوداداد لەم ژنە چوار کوڕی ئەبێ (یادگار– پێیان ووتوە چەلەبی، ڕەمەزان، ڕەشید، سەفەر) زۆری پێ نەچووە ئەم بەرەبابە لەگوندی هەنگاڵەوە بار ئەکەن ئەچنە دەشتی (بازیان) و شاری (چەمچەماڵ) بەناوی چەمچەماڵی کۆنە شوێنی خۆیان لەدەوربەری کرماشان و بێستوون کە (سوڵتاناوا) شیان پێ ووتوە ئاوەدان دەکەنەوە و تیایدا نیشتەجێ دەبن، وردە وردە پەرە ئەسێنن و هەر چوار تیرەکەی هەمەوەند (بەگزادە، ڕەمەوەند، ڕەشەوەند، سەفرە وەند) دروست دەکەن و ناو ناوبانگی باش لە دەشتی بازیان پەیدا دەکەن[٦٨] .

١–یادگار: نەوەکەی بەگزادە ناسراوە، دایکی لەبەگەکانی بابان بووە.

٢–ڕەمەزان: نەوەکەی نازناوی تیرەی ڕەمەوەند وەردەگرێت .

٣– ڕەشید: نەوەکەی بە نازناوی تیرەی ڕەشەوەند ناسراون، نەوەی ئەم تیرەیە بوون بەچەند بەشەوە بەزۆری بەشێکیان لەقەزوین و بەشێکیشیان لە(وان)ی باکوری کوردستان نیشتەجێن .

---

[٦٧] سایتی خەندان :مارك سایکس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،٢٠١٦/٥/١٦ .

[٦٨] مامۆستا علائەدین سەجادی: مێژووی ئەدەبی کورد ،چ١، ل٥٦٨

٤–سەفەر: هەژدە کوڕی بووە نەوەکەی نازناوی تیرەی سەفەروەندیان وەرگرت[٦٩] .

یەکێ لەئامۆزاکانی خودادادکە (چەم سورخاو)ی ناو ئەبێ خۆی و هەرسێ کوڕەکەی (شاوەیس، کاکەوەیس، بارام) ئەمانیش لەچەمچەماڵی کرماشانەوە بار ئەکەن و دێن بۆ لای ئـەمان . ماوەیـەکی زۆری پـێ ناچـێ بارامیـان کچـێکی چـەلەبی هێنـاوە کـەناوی (خاتوون) و خوشـکی شـەریف هەمـەوەن بـووە، بـارام لـەم خاتوونـە دوو کـوڕی بـووە (عەلی گوڵخاتوون–هەیەر گوڵخـاتوون) هەیـەر لەشـەڕی بـەینی تـورك وهەمەوەنـدا هـەر بەگەنجی ئەکوژرێ، عەلی (نۆ) کوڕی بووە، بەشێوەیەکی گشتی کوڕەکـانی خـودادادو چەم سوورخاوە هۆزی هەمەوەندی دەشتی بازیـانی ئێسـتایان لێکەوتۆتـەوە، بەبـەرەی چەم سورخاو دەلێن(سێتەبەسەر)[٧٠] .

بنەڕەتی هۆزی هەمەوەند :

ئەم هۆزە لەسەرەتاوەنیشتەجێی خۆرئاوای کوردستانی تورکیا بوون لەشـاری وان و باشقلاو دەوربەری بنگردی ئاوای وان، بە هۆکاری شەڕو ئـالۆزی و هـەراو هۆریـاوە ئـەو ناوچـەنەیان بەجێهێشـتووە، نـەك هـەر ئـەوان بـەڵکو زۆر هـۆزی کـوردی ناوچـەکە وەك هۆزی ئەردەلان و گەلاڵی یەکان، کە هەربەشێکیان ڕوویـان لەلایـەکی کوردسـتان کـرد، هەمەوەندیـەکان ڕووەو ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان ڕۆیشـتن، کـە نیشـتەجێ بـوون خـەڵکی ناوچەکە لەیەکتریان دەپرسی ئەو خێڵە لەدەوروبەری ئێوە چ کەسن؟

دەیانگوت هەموو وانین، واتا هەموو خەڵکی (وانن) وردە وردەگۆڕانی بەسەردا هاتوو بـووە بە(هەمـەوانی)[٧١] . هەمەوەنـدەکان بـۆ ماوەیـەکی زۆر لەناوچـەی (وان) ژیـاون خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕوماڵات بوون، بەهۆی ناکۆکی نێـوان هەمەوەنـد و دەسەلاتی ئەوکاتی ناوچەی وانەوە لەباکوری کوردستانەوە کۆچ دەکەن بـۆ ڕۆژهـەلاتی

---

[٦٩] کەریم ئاغایی هەمەوەندی: س ، پ ، ل ٤٧ .

[٧٠] مامۆستا علائەدین سەجادی: مێژووی ئەدەبی کورد ،چ١، ل٥٦٨ .

[٧١] کەریم ئاغایی هەمەوەندی: هۆزی هەمەوەند و بزوتنـەوەی ڕزگـاری خـوازی کوردایـەتی لـە١٧٨٧–١٩١٨ ،چ١ ، ٢٠١٠ ،ل٤٧ .

کوردستان و پاشان لەساڵی (١٦٠٠–١٦٥٠) کۆچیان کرد بۆ باشوری کوردستان و لە ناوچەی سوردا و دۆڵەڕووت جێگردەبن، پاش چەند ساڵ لەو ناوچەیە لەسەر داوای هۆزی (زەنگنە) هەمەوەندەکان کۆچ دەکەن بو ناوچەی کرماشان، کە ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەت بووە بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری، دواتر چوونە ناوچەی قەرەداخ و بازیان بوون بە بەشێك لەبەڕێوەبەرایەتی ئیماراتی بابان[٧٢]. یان بۆ چونێکی تر هەیە دەڵێن پێش سپیەکەیان بە (حەمە) ناسراوە و بەهەموو خێڵەکەیان گوتووە (حەمەوانیەکان) پاشان بووە بە هەمەوانی .

یان دەڵێن باپیری ئەم هۆزە ناوی (هوما) بووە بەناوی ئەو ناوچەی لێووەیی هاتووە بە (هوماوانی) ناوبانگی دەرکردووە، بەتێپەر بوونی کات بووە بە (هەمەوەنی) ئیتر ئەم ناوە بووبە ناونیشانی هۆزێکی گەورەی کورد، هەندێکیشیان چوونەتە کفری بە (وەنداوی) ناسران[٧٣] . یان هەندێك دەڵێن ڕەچەڵەکی هەمەوەند دەگەڕێتەوە بۆ (هوما بەگی کوڕی وان بەگ کوڕی شەهباز بەگ کوڕی زاڵ بەگی کوڕی هەلۆ بەگی لەکی)ە، هەلۆخان کەسایەتیەکی بەهێزی ناوچەی (لەکستان) بووە، باپیرە گەورەی هۆزی (هەمەوەند) بووە، هوما بەگ کوڕی وان بەگ بووە بە هوماوەند دواتر بۆ هەمەوەند کورت کراوەتەوە[٧٤].هەمەوەند یەکێکە لەهۆزە ناودارەکانی کورد لەچەندین ناوچە جێگیر بوون ،لەسەرەتادا لەکوردستانی تورکیا هاتوونە ڕۆژهەلاتی کوردستان و لەناوچەکانی (سنە، کرماشان، زەهاو) شیرازی سەنتەری هەرێمی فارس لەباشوری ئێران نیشتەجێ بووببون، هەندێکیان لەدەوربەری ساڵی (١٧٠٠) ز هاتوونەتە باشوری کوردستان، لەسەردەمی عوسمانیەکان چەندەها جار دوای نەمانی میرنیشینی بابان

---

[٧٢] مەریوان حاجی ئەحمەد واله هەمەوەندی: میژووی ڕەچەڵەك و ناودارانی هۆزی گەورەی هەمەوەند ، بەشی یەکەم ،چ١ ، ٢٠١٢ ، ل٢٠ .

[٧٣] کەریم ئاغایی هەمەوەندی: هۆزی هەمەوەند و بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردایەتی لە١٧٨٧–١٩١٨ ، چ١ ، ٢٠١٠ ، ل ٤٧ .

[٧٤] مەریوان حاجی ئەحمەد واله هەمەوەندی: میژووی ڕەچەڵەك و ناودارانی هۆزی گەورەی هەمەوەند ،س ، پ ، ل١٩ .

بوونەتە کۆسپ و تەگەرە لەڕێی تورکەکانـدا نـەیان هێشـتووە دەسـتیان بگاتـە هـەموو ناوچەکان و بەربەرەکانیان کردوون[٧٥] . ئەحمەوەنـد تیرەیـەکی هەمەوەنـدە ئـەوانیش وەکو باقی تیرەکانی تری هەمەوەند نازناوی وایان هەڵگرتووە، ئـەم تیرەیـە بەشـێکیان لەسـەردەمی (نادرشـای ئەفشـار) گوێزرانـەوە بـۆ (شـیراز، مازنـدەران) ئـەو بەشـەی (مازنـدەران) دێنـەوە ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی لەباشـوری کوردسـتانەوە دەچـن بـۆ ڕۆژئاوای کوردستان پاشان دەڕۆن بـۆ (لوبنـان) لەناوچـەی (سـەهل بیقـا) جێگـردەبن، ئەوەی (شیراز)یش پاش چەند ساڵ دەگەڕێنەوە (کرماشان) بـە ئەحمەوەنـدی شـیرازی ناسراون، ئەو تیرانەی نازناوی وەندیان هەڵگرتوو زۆریان تێکەڵ بـەهۆزەکانی کرماشـان بوون، زۆریان هـەر بـەناوی خۆیانـەوە وەکـو عەشـیرەت لەقەڵـەم دران[٧٦] . هەمەوەنـد هـۆزێکی ئـازاو جەربـەزە بـوون وخـاوەن لەشـکرێکی زۆر بـوون و دەسـەڵاتی زۆریـان هەبووە، یەکێك بوون لەو هۆزانەی کە(ئینگلیز) گیری خوارد بوو بە دەستیانەوە (کەریم بەگی فەتاح بەگ)، سەرۆك هۆزی هەمەوەند بـوو هەمیشـە لایـەنگیری (شـێخ مـەحمود) بووە[٧٧] .

---

[٧٥] گۆگڵ: هۆزی هەمەوەند ٢٠١٤/٨/٢٥. و محەمەد مەردۆخی: س ،پ ،ل٩٠ .

[٧٦] مەریوان حاجی ئەحمەد واله هەمەوەندی : میژووی ڕەچەڵەك و ناودارانی هۆزی گەورەی هەمەوەنـد ، س ، پ ، ل٢١ .

[٧٧] ئارام عەبدولواحێد ، مێژووی گوندی یالأنقۆز و نەوەکانی ،چ١، ٢٠١٠ ، ل١٠٦ .

* مارك سـایکس: لـە١٦ی ئـازاری سـاڵی ١٨٧٩ لەشـاری لەنـدەنی پایتـەختی بـەریتانیا، یەکێکـە لـە پێکهێنــەرانی ڕێککەوتنامــەی ســایکس—بیکــۆ، ســاڵی ١٩٠٨ کەهەشــت ســاڵ پــێش واژۆکردنــی ڕێکەوتنامەکە لەگەشتێکدا بەدووری (٧٠٠٠) میل بۆ کوردستان ئـەنجام دەدات، تێیـدا چـاوپێکەوتن و گفتوگۆ لەگەڵ، سەرۆك هۆز و خێڵە کوردیەکان و پیاوانی ئـاینی و خـەڵکی زەحمـەت کـێش کـردووە، بەرهەمی گەشتەکەی نامیلـەکی (٣٧) لاپـەڕە بـووە، بەناونیشـانی هـۆزە کوردەکـان لەئیمپراتۆریـەتی عوسمانی دا، ئەم نامیلکەیە وەکو دۆکۆمێنتێك لـەژمارە(٣٨)ی گۆڤـاری پـەیمانگای ئەنسرۆپۆلۆجی بەریتانیای مەزن و ئێرلەندە بلأوکراوەتەوە، مارك سـایکس لـە١٦ی شـوباتی ١٩١٩ لەشـاری پاریسـی پایتەختی فەرنسا کۆچی دوایی کردووە .

بەنێوبانگترین هۆزی جەنگاوەری کوردستانن، بەگوێرەی خەملاندنی مارك سایکس* لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا پێکهاتبوون لە هەزار و دووسەد خێزان لەباشوری کوردستان [٧٨]. بەگوێرەی تێبینیەکانی (مێجەرئی بی سۆن)، پێش جەنگی (١٨٧٧–١٨٧٨) لەنێوان ڕوس و عوسمانی،هەمەوەندیەکان تەنها (دەمانچە، ڕمیان) هەبوو، بەڵام دوای بەشداریکردن لەجەنگەکە کە هەمەوەندەکان چوون بۆ (قەفقاسیا) بۆ شەڕی ڕووس ، لەو شەڕەدا ئازایەتی خۆیان سەلماند کە گەڕانەوە بۆ بازیان بە چەکی (ڕووسی)یەوە گەڕانەوەو دوای ئەوە ڕمەکانیان فرێدا[٧٩]. بەدەست هێنانی چەکی نوێ وێڕای ئەوەی متمانەی زیاتری پێبەخشین بەرامبەر بە عوسمانیەکان ،توانای جەنگیانی بەهێز کرد و سنووری پەلامارەکانیانی فراوانتر کرد ،هەردوابە دوای بەدەست هێنانی چەك لەئاکامی قولبوونەوەی کێشەیەك لەنێوان خۆیان و زەنگنەدا، لەگەڵ سوپایەکی گەورەی عوسمانی پاڵپشت بە هۆزەکانی (زەند، پالانی، باجەلان، تالەبانی) کە بۆ پشتیوانیکردن لە(زەنگنە) کەوتبوونە جەنگەوە، هەمەوەند بالادەستانە سەرکەوتن[٨٠].
عوسمانیەکان ساڵی (١٨٨٩) زاینی بەربوونە گیانی ئەم هۆزە،بەشێکیان لێ ناردن بۆ تەرابلوس و بەشێکی تریان بۆ (ئەدەنە) لەئەنادۆڵ، لەدەوروبەری ساڵی (١٨٩٦) زاینی پاش حەوت ساڵ بەزەحمەتێکی زۆر حەوت مانگ بەڕێگەوە بوون تا توانیان خۆیان بگەینەوە (بازیان) دوای ئەوەی هەزاران کیلۆمەتریان بەپێ بەبیابانەکاندا بری، کاتێك هەمەوەندەکان گەیشتنەوە بازیان ، ئەو هەمەوەندانەی لەزەهاو بوون، هاتن بە پیریانەوە و تێکەڵ بەیەکتر بوونەوە و تێکڕا کەوتنە کارکردن بۆ گەڕانەوەی ئەو بەشەیان کە دوور خرابوونەوە بۆ ئەدەنە .
لەسەرەتاوە (١٥٠) سوارەی هەمەوەند لەدوورخراوەکان توانیان لەئەدەنە هەڵبێن، بەڵام عوسمانیەکان دوایان کەوتن و ڕێیان پێگرتن و پێشنیازیان کرد، لە(حەلەب) یان

---

[٧٨] خالد مەحمود کریم: س ، پ ، ل١١١ .

[٧٩] مێجەرئی . بی . سۆن: س، پ ،ل٥٤ .

[٨٠] خالد مەحمود کریم: س ،پ ،ل١٧٦–١٧٧ .

لە(دێرەزوور) بمێننەوە و نیشتەجێ بىن، هەمەوەندەکان ئەمەیان ڕەتکردەوە و ڕازی نەبوون و لەسەر ڕۆیشتنەکەیان بەردەوام بوون، هەتا گەیشتنەوە بازیان، لەبازیانەوە هەمەوەندەکان چوارسەد سواری ئازایان نارد بۆ (موسڵ) و داوایان لەوالی (موسڵ) کرد هەمەوەندەکان لەئەدنە ئازاد بکرێت، هەتا بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان هەڕەشەیان لەوالی کرد، ئەگەر بێت و ئەمە نەکا، ناچار دەبن بەچەك تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، لەئەنجام دا عوسمانیەکان سەریان بۆ داخوازی هەمەوەندەکان دانەواند و، دوورخراوەکانیان لەسەر حسابی تایبەتی خۆیان گەڕاندەوە بۆ بازیان. ئا بەم جۆرە خێڵەکە لەبازیان یەکی گرتەوە [(٨١)]. مەیجەرسۆن لەساڵی ١٩١٠ی زاینی دەڵێت : هەمەوەند خێڵێکی بچوکە و سەرجەمی هێزەکەیان بەدووسەد و پەنجا سوار دادەنرێت، بەچەکی ماوزەڕ دەگولە چەکدارن، لەڕووی ئازایەتیەوە هاوشێوەیان نیە لەکوردستان، ئەگەر فشار زیاتر بخرێتە سەریان ئەوا ژنەکانیشیان زۆر ئازایانە دەجەنگن و تفەنگیش بەباشی بەکاردەهێنن[(٨٢)]. تیرەکانی هەمەوەند: ئەو تیرانەی ئەمڕۆ بەهەمەوەند ناسراون لەدیوی باشوری کوردستان خۆیان دەدەن لەنۆزدە تیرە وەك (بەگزادە، ڕەشەوەند،ڕەمەوەند،سەفەروەند، میتەوەند، قورکەوەند، سۆفی وەند، خێڵی حەمەڕەش، کاوانی، هەمەیل، بابلەوەند، سێتەبەسەر، بەختیاروەند،ئەحمەد لاوەند، بێتیارەوەند، مەنسورەوەند، سمایلەوەند، قایتەوەند) جوامێر ئاغای ڕەنگینە بەشێکن لەهەمەوەندەکانی بەهتۆیی، وەهەروەها بنەماڵەی محەمەد ئیمام وال حەمیە کە ئێستا نیشتەجێی لوبنان وچەند بەشی تر[(٨٣)].

سنوری جوگرافیای هۆزی هەمەوەند :

لەباکورەوە شوان و بازیان و شاخی تۆکمە، لەباشوورەوەتاوغ، لەخۆرئاواوە قەرەحەسەن و شوانی خاسە، لەڕۆژهەڵاتەوە تاسلۆجە و بن زەردە .بەشێکی زۆری

---

[٨١] د. فواد حەمە خورشید: کۆڤاری ڕەنگین ،ژ٨٤ ، ١٩٩٥ ، زانکۆی ئەنبار .

[٨٢] مەیجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ ، ٦٩ .

[٨٣] کەریم ئاغایی هەمەوەندی: س ، پ ،ل٥٢ –٥٣ .

هەمەوەندیـــەکان لەناوچـــەکانی چەمچـــەماڵ و دەوربـــەری دەژیـــن[٨٤]. لەڕۆژهـــەلأتی کوردستان نەخشەی ناوچەی هەمەوەند بەم جۆرەی خـوارەوە دەسـت نیشـان کـراوە : ناوچەی هەمەوەنـد دەکەوێتـە بـاکوری کرماشـان، لەناوچـەی کـەمانگر لـەلای بـاکوری، لەباشوری ناوچـەی کلیـاتی، لەڕۆژهـەلأتی کوەشـاوە، ناوچـەی ڕوانسـەر و ئـەلهیارخاە لەڕۆژئاوا، هەروەها بەشێکیان لەناوچەی شیراز و قەزوین و وەلأتی لوبنان دەژین..

## مەزهەبی هەمەوەند :

هەمەوەندیەکان بەگشتی موسڵمانن و دابەش بوونە بەسەر هەردوو مەزهەبی (شیعە، سونە) مەزهەبی هەمەوەندیـەکانی کرمانشـان و ناوچـەکانی شـیرازو قـەزوین و قەسـری شـیرن و خانـەقین بەشـی زۆری هەمەوەنـد شـیعەی دوانـزە ئیمـامن و ئـەم کۆمەڵـە هەمەوەندە بەشێوازی زاراوەی لـوڕ قسـە دەکـەن، ئەمانـە وەخـتی خـۆی هـەر شـافعی مەزهـەب بـوون بـەلأم لـەژێر فشـاری سـەفەویەکاندا ئـەوان بـوون بـە شـیعە بـەلأم، هەمەوەندیـەکانی باشـوری کوردسـتان هـەموویان سـونەن لەسـەر مەزهـەبی ئیمـامی شافیعین[٨٥].

---

[٨٤] مەریوان حاجی ئەحمەد والە هەمەوەندی: مێژووی ڕەچەڵەك و ناودارانی هۆزی گەورەی هەمەوەنـد ، س ، پ ، ل٢١ .

[٨٥] کەریم ئاغایی هەمەوەندی : س ، پ ،ل ٣١ –٣٤ .

## سۆفیوەن :

هۆزێکی سەربەخۆیە و لەتیرەکانی جاف نیە، بەڵام چەندساڵێك لەگەڵ جاف دا گەرمیان و کوێستانی کردووە و لەکۆندا لە(قەڵغانلو) و (هوانە)ی نزیك سلێمانی چەند ماڵێکیان هەبووە ولەگەرمیان لەگوندەکانی (وڕێڵە، ڕۆسەی شامار) و چەند شوێنێکی تریان بە دەستەوە بووە، بەڵام لەساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا لەگەڵ تیرەیەکی جاڤی ناوچەکەدا ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوەو بە هۆیەوە ناوچەکە بەجێدەهێڵن و بەرەو (چەمچەماڵ، باینجان) گوندی موان لەشارەزوور کۆچ دەکەن و چەند خێزانێکیان لەناوچەی گەرمیان دان[٨٦] .

## هۆزی شکاك :

شکاك هۆزێکی گەورەی نەتەوەی کوردە لەڕۆژهەڵاتی کوردستانن، ئازا و بوێرن، هەرلەناوچەکانی گۆلی ورمێ تا ناوچەکانی گەڤەر، گۆمی وان، ناوچەی هەکاری بڵاوبوونەتەوە، لەم ناوچەیە بەکشتوکاڵ و ئاژەڵداریەوە خەریکن .

شوێنی ئەسڵی و بنەڕەتیان ئەنادۆڵ بووە، دواتر بۆ ئازەربایجانی ئەمڕۆ هاتوون، تیرە جیاوازەکانی ئەم هۆزە کوردی ڕەسەنی سوونی مەزهەبن، ئەحمەد شەریفی دەڵێت : شکاکەکان بەشێکن لەکورد، زمانەکەیان تێکەڵەیەکە لەدڕی و ئازەری، کوردەکانی موکریان بەتایبەتی مەنگوڕەکان لەگفتوگۆکانیاندا لەگەڵ شکاك بەئاسانی لەیەکتر نەدەگەیشتن. ئەم هۆزە لەدووبەش پێکهاتوون: عەبدۆیی، کاردار لەکۆنەوە سەرۆکی

---

٨٦ ساڵح هارونی: س ، پ ، ل١٦٧ .

هۆزەکە لەعەبدۆییەکان هەڵبژێردراوە، کەسانی ناودار لەناو ئەم هۆزە هەڵکەوتووە، ئیسماعیل خانی یەکەم لەتائیفەی عەبدۆیە لەسەرەتای دەسەڵاتی قاجاری ژیاوە، پیاوێکی بەتوانا بوو، بەهۆی درێژەکێشانی شەڕی نێوان ئێران و ڕوسیا لەسەردەمی قاجاریەکان، یەکەمین بزوتنەوەی هۆزی شکاك لەساڵی ١٨٠٧ دژبە قاجاریەکان هەڵگیرساند، دواتر تیرۆرکرا لەلایەن عسکەرخانی هەوشارەوە کە فەرماندەی ورمێ بوو لەساڵی ١٨١٦ بەمەش بزوتنەوەکە کۆتای هات، جازێ خانی خێزانی پاش تیرۆرکردنی مێردەکەی توانی سەرکردایەتی هۆزەکەی بگرێتە دەست بۆ ماوەی سیازدە ساڵ هەندێکی تر بەزیاتری دەزانن لەو ماوەیە توانی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتەکەی فراوانتر بکات،پاشان عەلی خانی ئیسماعیل خان دەسەڵاتی گرتەدەست، ماوەیەك دەستی بەسەر ورمێ، سەڵماس، بەشێك لەئازەربایجان دا ڕۆیشتووە .

بنەماڵەی ئیسماعیل خانی مەزن دەستاودەست براگەورەی هۆزی شکاکیان کردووە، هەر تیرەیەك سەرۆکی خۆی هەبووە، بەڵام هەموو هاوڕاو قایل بوون بەسەرکردایەتی ئەو بنەماڵەیە، لەهەموو سەرکەوتن و شکستەکان پشتیان تێنەکردوون، هەمیشە بەچاوی براگەورە سەیری ئەم بنەماڵەیە کراوە کە بە پس ئاغا ناسراون زنجیرەی خێزانی باب و باپیرانیان بەم شێوەیە لەسمکۆوە دەست پێدەکات (سمکۆ کوڕی محەمەد پاشا کوڕی کوڕی ئیسماعیل خانی مەزن کوڕی ئیبراهیم ئاغا کوڕی حاجی بەگ کوڕی ئیبراهیم کوڕی هەمزە عەبدۆیی، پشتاوپشت لەقەڵای چیهریق دا سەرکردایەتی هۆزی شکاکیان کردووە .

قەڵای چهریق هەردەم ئێلی شکاك بەکاریان هێناوە و شوێنی ژیانیان و ناوەندی هۆزەکە بووە، ئەحمەدی کسرەوی دەڵێت: دوای کوژرانی جەعفەر ئاغا سمکۆی برای ئیدارەکەی گواستەوە بۆ قەڵای چهریق، وەستای شارەزای هێنا و بینای زۆری دروستکرد، ئەمەش وای کرد ناوچەی قەلاکە ئاوەدانتربێت. لەجەنگی یەکەمی جیهانی دەستەیەك لەسەربازان و تۆپچیەکانی عوسمانی کەچەند سەد کەسێك دەبوون بۆولاتی خۆیان نەگەڕانەوە، تفەنگ و تۆپەکانی بردە قەڵای چهریق لەژێر دەسەڵاتی سمکۆ

مانــەوە، هــەروەها سمکــۆ کۆشــك و بــاخی زۆری لەگــەڵ بینــادا بــۆ خــۆی دروســتکرد .
هەروەها بەشێکی ئەم هۆزە لەسنوری ئازەبایجان و تورکیا نیشـتەجێن، لەدەشـتەکانی چــهریق، ســۆما، برادۆســت، ســەنجیداغ، هەنــدێکی تریــان لــەورمێ نیشــتەجێن. وەك ئاماژەمان پێی لەدووبەشی سەرەکی پێکهاتوون:

**تایفەی عەبدۆیی ئەمانە شازدە تیرەن وەك** :

پزئاغای عەبدۆیی: هەمیشە سەرۆك و گەورەی ئـەم تیرەیـە بنەماڵـەی سمکـۆ و بـاوك و باپیری بوون، شوێنی نیشتەجێ بوونیان جونی و گەنگەچین بووە .

کەچەلی: گەورەی ئەم تیرەیە قادری عومەر زادە دانیشـتووی گونـدەك مـالا لەناوچـەی برادۆستی ورمێ .

عەتمانی: سەرۆکی ئەم تیرەیـە فەیسـەڵ عـەتمانی دانیشـتووی گونـدی گەرماوەیـژە لـە ناوچەی سەلماس .

ئێوەری: گـەورەی ئـەم تیرەیـە جـەمال ئێوەریـە دانیشـتووی گونـدی کایـك لەناوچـەی سەڵماس .

شەکەری: سەرۆکی ئەم تیرەیە قوچـو شـەکەریە دانیشـتووی گونـدی شـیوەی ناوچـەی سەڵماس .

چەرکۆیی: سەرۆکی ئەم تیرەیە مامەد کوڕی قولی دانیشتووی گوندی ئەلواج لەناوچەی ورمێ .

نیعمــەتی: ســەرۆکی ئــەم تیرەیــە حــاجی محەمــەد پــور دانیشــتووی گونــدی دۆســتانی سۆمان.

کزنی: سەرۆکی ئەم تیرەیە گەنجۆ تەلعەت کوڕی محەمەد ئەمین لەگوندی گەنگەچین لە ناوچەی برادۆست نیشتەجێن .

مامەدی عەبدۆیی: سەرۆکی ئەم تیرەیە فەهمیە لەگوندی ئەسلامیك ناوچەی سەڵماس .

مەندولەکی: سەرۆکی ئەم تیرەیە جیهانگیرە دانیشتووی گوندی بەلەسور لەناوچەی خۆی .

شەوەلی: بەهۆی ژن و ژنخوازی لەنێو تیرەکانی تر تواونەتەوە .

شەکەفتی: سەرۆکی ئەم تیرەیە لەکۆندا ئیسماعیل ئاغای مەزن بووە .

موکری: ئەم تیرەیە لەناوچەی ئەنزل نیشتەجێن .

پاچك: لەناوچەی ئەنزل نیشتەجێن .

شپیران: تیرەیە لەناوچەی ئەنزل نیشتەجێن .

گەرگەری: تیرەیە لەناوچەی موسڵ، زوومار، عەیازییە نیشتەجێن .

**تایفەی کاردار ئەمانە لەدە تیرە پێکهاتوون وەك** :

پس ئاغای کاردار: هەمیشە بنەماڵەی سمایلی حەسی سەرکردایەتی ئەم تیرەی کردووە، لەگوندی هووەسن نیشتەجێن .

نیسانی: سەرۆکی ئەم تیرەیە (حاجی ئیرەج)ە دانیشتووی گوندی گومبەتن .

خدری: سەرۆکی ئەم تیرەیە عیسا بەشیریە دانیشتووی گوندی سیناوان .

خەلوفی: سەرۆکی ئەم تیرەیە (مرادی کوڕی محی)ە و دانیشتووی گوندی بێردوکن .

دەلان: سەرۆکی ئەم تیرەیە قادری کوڕی عومەر خانی شکاکە لەناوچەی ورمێ نیشتەجێن .

فەنەك: سەرۆکی ئەم تیرەیە عەباسی تەمەرە .

مامەدی کاردار: سەرۆکی ئەم تیرەیە حاجی قوتازە .

دڕی: سەرۆکی ئەم تیرەیە جیهانگیر حەسەن تیلۆ دانیشتووی گوندی سیرۆیە .

هەنارە: سەرۆکی ئەم تیرەیە حاجی سامی یە لەناوچەی ورمێ نیشتەجێیە .

گەورك: سەرۆکی ئەم تیرەیە یوسفە لەگوندی سپیدەرە .

هەموو تیرەیەك سەرۆکی خۆی هەبووە، سەرۆکی هەموو عەبدۆیی و سەرۆك هۆزی شکاك عەلی ئاغا و لەدوای ئەویش محەمەد ئاغای کوڕی بوو، دوای ئەویش سمکۆ بووبە سەرۆکی هەموو تیرەکانی شکاك، سەرۆکی تایفەی کارداریش عومەرخانی شەریفی بوو.

هۆزی شکاک یەکێکە لەو هۆزانە ماوەیەکی دورودرێژ هەندێك ڕاپـەڕین و یـاخی بـوون و مل نەدان بەدەسەلاتە یەك لەدوای یەکەکانی ناوچەکەی تۆمارکردووە، جێ دەستی ئەم هۆزە بەمێـژووی ڕاپەڕینـەکانی کـوردەوە دیـارە، مامۆسـتا حوسـێن حـوزنی موکریـانی دەڵێـت : ئـەم هـۆزە هەرچـەندە بـەژمارە کـەمن بـەلاّم ئـازا و ڕەشـید و جـەنگاوەرن، هەمیشە لەنێوان کێوەکانی خۆی، وان، ورمێ بەئازادی ژیاون، زۆر سەرکێش و ئازابوون لەمردن نەترساون . لەساڵی ١٧٣٢ لەگەڵ هۆزی مەحمودی شەرێك دەکەوێتە نێوانیـان، بەشێکیان سەد ماڵێك دەبوون چوون بۆ وان، بەدلیس، دیاربەکر، ئورفە، ئەو سەد ماڵـە پاشان چوونە چیای کرمـانج لـەوێ عـەلی ئاغایـەك کەحوکمـداری ناوچـەکەی کـردووە، شوێنێکی پێ بەخشیوون ئاوەدانیـان کردۆتـەوە ئێسـتا بەناحیـەی شـکاك بەناوبانگـە . بەشێکی دی لەهۆزی شکاك لەسەردەمی شاتەهماسب جیا بوونەوە و مەزهەبی شـیعەی جەعفەریان هەڵبژارد ئێستا بەشوقاقی دەناسرێن، بەلاّم بەرەکەی تریان هـەر لەشـوێنی خۆیـان مانـەوە. لـق و بەشـەکانی هـۆزی شـکاك بیسـت و شـەش تـیرەو تایفـەن، هـەر بەشێکیان سـەرۆکی خـۆی هـەبووە، مـەلا ئەحمـەد پێنجـوێنی لـەکتێبی مێـژووی کـورد لەسـەد و دوانـزە سـاڵدا دەنوسـێت هـۆزی شـکاك لەهـەرێمی خۆرئـاوای ئازەربایجـان نیشتەجێن لەسـنوری نێـوان ئێـران، تورکیـا، لەهـەردوو ناحیـەی (سـۆما، برادۆسـت)ی سـەربەپارێزگای ورمـێ لەناوچـەیەکی کوێسـتانی سـەخت دا نیشـتەجێن، ئـەم هـۆزە کۆچەری و خاوەن مەڕ و مـالاّت بـوون و گـەرمیان و کوێسـتانیان کـردووە، مـارتن ڤـان برونسن دەڵێ: شـکاك هـۆزێکی گەورەیـە بـەپێی سـەرژمێری سـاڵی ١٩٢٠ لـەدوو هـەزار خێـزان پێکهـاتوو بـوون، خـەریکی بـەخێوکردنی مـەڕ و مـالاّت بـوون، سـودیان لـەو لەوڕگایانە بینی کـە کـەوتوو بـووە ناوچـەکانی تەرگـەوەڕ و دەشـتی بێڵـەوە، هـەروەها دەڵێت شکاك لەناوچە شاخاویەکانی سۆما، برادۆسـت، شـیپرانن، هـەروەها لـەڕۆژئاوای سەلماس، ورمێ، تەرگەوەڕ، مەرگەوەڕ، دەشتی بێڵ کـە دەگاتـەوە بەسـنوری تورکیـا، عێراق نیشتەجێن، لەکۆنەوە شوێنی کۆبوونەوەیان بووە، تا ئێستاش شوێنی هۆزەکانی کوردن. ئەحمەد شەریفی دەڵێـت ئـەو ناوچـە شـاخاویانە بـەجێگای هۆزەکـانی شـکاك،

هـەرکی، گـەلاڵی نـاودەبرێ، ئـەو هۆزانـە هـەردەم خـەریکی کۆچـکردن و گـەرمیان و کوێستان بـوون و پیاوەکانیـان نیشـان شـکێنی چـاك بـوون .حەسـەن ئەرفـەع لەسـاڵی ١٩٦٦ دەڵێت: ئێستا هۆزی شکاك ژمارەیان چوارهەزار خێزان دەبێت . محەمەد ئـەمین زەگی بەگ دەڵێت : شکاك لەرۆژئاوای گۆمی ورمێ لەسـەر سـنور نیشـتەجێن، لەشـەش هەزار خێزان پێکهـاتوون، لەسـاڵێك دا سـێ مـانگ لـەرەشماڵ دەژیـن، ئیسـماعیل ئاغـا گـەورەی ئـەم هۆزەیـە. حەسـەن ئەرفـەع شـکاك دەکاتـە دوو بەشـی سـەرەکی یەکـەم عەبـدۆیی لەناوچـەکانی چـارێ، سـەلْماس، برادۆسـت دەژیـن، ئەمانـە بـاپیری سمکـۆ سەرکردایەتی کردوون، بەشی دووەم مام دۆیی ئەمانە عومەرخان سەرکردەیانە .

مامۆستا کەمال نوری لەکتێبی سـەدەیەك لەتێکۆشـانی کـوردی ئێـران دا و بزوتنـەوەی ئیسماعیل خانی شکاك دا نوسیویەتی شکاك دووەم هۆزی کوردی ئێرانە لـەدوای هـۆزی کەڵهۆر. بەلاّم نەوشێروان مستەفا دەڵێت : شکاك لەچاو هەندێك هۆزی کوردا زۆر گەورە نەبوون، سەرژمێریان بەم جۆرە بوو :

| | | |
|---|---|---|
| لۆرد کیرزن | ساڵی ١٨٩٢ | هەزار و پێنج سەد خێزان |
| مارتین دابرونە | ساڵی ١٩٢٠ | دوو هەزار خێزان |
| مسعود کیهان | ساڵی ١٩٣٢ | هەزار و پێنج سەد خێزان |
| هینری فیلد | ساڵی ١٩٣٨ | خ هەزار و پێنج سەد ێزان |

ئەم سەرژمێریە هەموو دانیشتوانی هۆزی شکاکی لەناوچـە جیاوازیـەکان نەگرتۆتـەوە، زیاتر ژمارەی هۆزی شکاکە لەرۆژهەلاّتی کوردستان و ناوچەکانی ورمێ و دەوربەری .

هـۆزی شـکاك بـەهۆی بـەخێوکردنی مەرومالاّتـەوە بەشـێکیان چـوونەتە بـاکوری کوردستان، پاشان زۆرێکیان چوون بۆ رۆژئاوای کوردستان، هۆزی شـکاك لەناوچـەکانی عـەفرین بـەزۆری لەگوندەکانـدا ناسـراون و کەسـایەتی گـەورەیان تێـدا هەڵکـەوتووە، بەتایبەتی لەچەمی دەریاچـەی قەرەسـوو کەیەکێکـە لەسەرچـاوەکانی ڕووبـاری فـورات لەوێـدا جێگربـوون، ناوچـەکەیان دەوڵەمەنـدە بەدارسـتان و داری بـەردار و زیتـوون، دراوسێی هۆزی ڕەشوان و حاجی ئۆمەرنن، لەسی و حـەوت گونـدی گـەورەدا بلاّوەیـان

کردووە، لەگەڵ دەوڵـەتی عوسمـانی هەمیشـە پەیوەنـدیان خـراپ بـووە، بـەلاَم لەگـەڵ هۆزی ڕەشوان پەیوەندیەکی بەهێزیان هەبووە بەهۆی ژن و ژنخوازیەوە، سەرۆکی ئـەم هۆزە لەڕۆژئاوا لەسەدەی نۆزدەوە بۆ بنەماڵەی جالوسیە کـە گـەورەترین بـازاڕ لەسـەر دەسـتی سـەرۆك هـۆزی شـکاك جـەمیل ئاغـا دروسـتکراوە، لـەنیوەی یەکـەمی سـاڵانی سیەکان جەمیل ئاغا سەرۆك شارەوانی بووە[٨٧] .

## هۆزی گەرکەری :

هـۆزێکی دیـار و ناسـراوی ناوچـەکانی دەوروبـەری موصـڵن، شـێوازی قسـەکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ قامیشلۆ و جـەزیرە، بەکرمانجیـەکی ڕەوان قسـەدەکەن، شـێوازی جلـو بەرگیان جیاوازە زۆربەیان دشداشەی سور لەبەردەکەن و عیگالی عـەرەبی ڕەنـگ سـور لەسـەردەکەن، بەخـەڵکی ئـازاو چـاونەترس ناسـراون، ئـەم هـۆزە دەکەوێتـە هـەردوو شارۆچکەی زومار و ئاب گەنی، یەکەم گونـدیان بـە گرڤـر لەشارۆچـکەی زومـار دەسـت پێدەکات و بە گونـدی گـول محەمـەد لەشارۆچـکەی ئـاب گـەنی کۆتـایی دێـت، گونـدی حوگنە پایتـەخی گەرگەریەکانـە، تـەنها لەگونـدی گرڤـر ژمـارەی نزیکـەی هـەزار ماڵێـك نیشتەجێن، (نایف جـەلود ئاغـای کـوڕی سـلێمان ئەحمـەد) سـەرۆك هـۆزی گەرگەریـە، دانیشتووی شاری موسڵە .

گەرگەری خوێندەواریان زۆرە، خاوەن بڕوانامە و خـەڵکی دیاریـان زۆرە لە(موصـڵ، بادینان) سی و هەشت پزیشك و هەشت مامۆستای زانکۆ و دەیان مامۆستای ئامـادەیی و سەرەتایی و دەرچووی زانکۆ و پسپۆڕی جیاوازیان هەیە .

هەر لەوناوچەیە چەندین عەشیرەت و هۆزی کورد و عەرەب هەن، لەکوردەکان هۆزەکانی موساڕەش و میران و هەسەنیان نیشتەجێن، هۆزە عەرەبەکانیش بریتین لە

---

[٨٧] عەبدولقادر شکاك : پوختەك لەکتێبی جوگرافیای مێژووی عەشیرەتی شکاك وەرگیراوە ،چ١، ٢٠١٥.

جبور، لهێب، معامره، جحێش، زۆربەی هۆزە عەرەبەکان هاوکاری داعشیان کرد لەکاتی هاتنیان بۆ ناوچەکە، بەشی هەرزۆریان ڕایانکردووە، تەنها هۆزی معامره کەمینەیەکیان هاوکاری داعش بوون، لەشوێن و گوندەکانی خۆیان ماونەتەوە[٨٨]. هەندێك لەهۆزەکانی کورد هۆزی گەرگەریان بەشێك لەخۆیان زانیوە وەك هۆزی شکاك و گەردی بەلآم بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە لەبەردەستا نیە ئەمە پشت ڕاستبکاتەوە. هەندێك دەڵێن گەرگەری لقێکە لەعەبدۆیەکانی هۆزی شکاك .

مێژووی هۆزی گەرگـەری لەناوچـەکەدا کۆنـە، زۆر جـار تووشـی شـەڕ و شـۆڕ بوونـە لەگەڵ هۆزەکانی تر، لەسەردەمی عوسمانیەکان لەگەڵ هـۆزی شـەمەر شـەڕ دەکەوێتـە نێوانیان، نوح ئاغا سەرکردایەتی گەرگەریەکانی کردووە، کەپیاوێکی ئازاو بەتوانا بووە، شەمەرەکان هەوڵ ئەدەن بەهەر شێوەیەك بووە نوح ئاغا بکوژن، جارێـك نـوح ئاغـا لـە نێوان شەنگال و تەلغەفـەر لەسـەر گردێـك دائەنیشـێ و چـل چـەکداری لەگـەڵ دەبێـت، هەواڵ بە شەمەرەکان دەگات و بەفرسەتی دەزانن هێزێکـی زۆر دەهێـنن و چـواردەوری دەگرن، دوای شەڕێکی زۆر نوح ئاغا و پاشمـاوەی جـەنگاوەرەکانی ئابلوقـە دەدرێـن و دەگیرێن، شەمەرەکان هەواڵی نوح ئاغا دەپرسن یەکێك لەهاوڕێکانی نـوح ئاغـا دەڵێـت منم نوح ئاغا، بەلآم یەکێك لەشەمەرەکان دەڵێت ئەوە ئەو نیە مـن نـوح ئاغـا دەناسـم، نوح ئاغا دەست نیشان دەکـات، پاشـان سـەری دەبـڕن و جـەرگ و دڵـی دەردەکـەن و دەرۆن هەریەکـەیان تـۆزێکی لـێ دەبنـەوە بـۆ ژنـەکانیان تـابیخۆن، بـەبڕوای ئـەوان تاژنەکانیان منداڵیان بێت وەك نوح ئاغا ئازا و بەتوانا بێت .

هۆزی گەرگەری دابـەش بوونـە بەسـەر بیسـت و پێـنج گونـد، جگـە لـەوە لـەزوومار دووسەد خێزانیان نیشتەجێن، هەروەها نزیکەی دووسەد خێزانیان لەکۆمەڵگەی دومیز و عەین زاله نیشتەجێن، ژمارەیەکی زۆریشیان لەناو شاری موسڵ دان، لەقەزای تەلعەفـەر گەڕەکێکی گەورە هەیە بەناوی گەڕەکی گەرگەری[٨٩] .

---

[٨٨] ماڵپەڕی میلەت: سەفەرێك بۆ ئێزدخان ،٢٠١٦/٩/١٠ .

[٨٩] عەبدولقادر شکاك : جوگرافیای مێژووی عەشیرەتی شکاك،چ١، ٢٠١٥، ل٥٢-٥٧ .

## هۆزی خۆشناو :

خۆشناو یەکێکە لەهۆزە گەورە و ناودارەکانی کورد لەباشوری کوردستان و هەولێر، بەپێی ووتەی هەندێك لەئەندامانی هۆزی خۆشناو مێژووەکەیان بۆچەند سەدەیەك لەو پێش دەگەڕێتەوە، هەندێکیش ڕایان وایە مێژوویان بۆ زیاتر لەهەزار ساڵ دەگەڕێتەوە، بۆچوونی تریش هەیە مێژوویان بۆ هەشت سەد ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، بەلاَم زیاتر بەلای ئەوەدا دەچن ئەم هۆزە لەدوای ڕووخاندنی میرنیشنی ئەردەلاَن لەباشوری کوردستان جێگر بوونە و پێگەیان بەهێز بووە .

سەبارەت بەناوی هۆزی خۆشناو محەمەد جەمال توتمەیی شارەزا لەمێژووی هۆزی خۆشناو دەڵێت: خۆشناو لەدوو ووشە پێکهاتووە (خۆش) و (ناو) واتا ناوی خۆش، سەدرەدین عومەر خۆشناو نوسەر و چیرۆك نووس دەڵێت: ووشەکە لەخۆش و ناو هاتووە واتا ناوچەیەکی خۆش کەئەوەش بەهۆی دڵڕفێنی شوێنی جوگرافیای ناوچەی خۆشناوەتیە کە لەچەندین شاخ و دۆڵ و دەشت و ڕووبار و کانیاوی جوان پێك دێت .

یەکێك لەپیاوە ئاینی و ناودارەکانی هۆزی خۆشناو (مەلا محەمەد خەتیّ)یە کەبە مەلای خەتیّ ناسراوە، بەهۆی شارەزاییەکی زۆر لەشەریعەتی ئیسلام پاشای گەورەی ڕەواندز دەیکات بەموفتی میرنیشنی سۆران، بەووتەی (مەسعود محەمەد) ی نوسەری گەورەی کورد، ستەمێکی گەورە لەمەلای خەتیّ دەکرێت کە دەوترێت بەهۆی فتوای ئەو خەڵکی میرنیشنەکە لەبەرامبەر سوپای عوسمانی شەڕیان نەکردووە میرنیشنەکەیان ڕووخاوە.

ناوچەی خۆشناوەتی چەندین قوتابخانەی ئاینی گرنگی تێدا بووە و دەیان زانای گەورەی میلەتی کورد تێیدا خوێندوویەتی لەوانە قوتابخانە ئاینیەکانی گوندی هەرتل، بالیسان، خەتیّ، چیوە، چەندین کەسی تر لەولاَتی تر ڕوویان تێکردووە .

محەمەد جەمال توتمەیی دەڵێت بەپێی پەرتوکی (مەسالك ئەبصار)ی (ئەبو فەزڵ عومەر) کە هەشت سەدە لەوبەر هاتۆتە کوردستان و دەڵێت لەناوچەی خۆشناوەتی هۆزێك هەبووە بەناوی (حەسنانی) بەپێی بۆچوونی هەندێك لەخۆشناوەکان (حەسنانیەکان) هەر خۆشناوەکانی ئێستا بوونە، ئەو ناوەیان بەدرێژایی مێژوو گۆڕاوە

دواتر بووەتە خۆشناو، بەڵام بەشێك لەئەندامانی ئەم هۆزە ئەم بۆچوونە بەناڕاست دەزانن. ئەندامانی هۆزی خۆشناو بریتین لەدوو چین کەیەکێکیان چنی بەگ و میرانەکان بوون کە خاوەن زەوی یەکی زۆری کشتوکاڵی بوون، لەبەرامبەریشدا چینی جوتیارانیان لەسەردەمێکی زوو تا ئێستاش خەریکی کاری جوتیاری و ئاژەڵداری بوونە .



میران ڕەشید بەگ      مەلیك فەیسەڵ      میران قادر بەگ

خۆشناوەکان دوای چەندین سەدە لەجێگربوونیان لەناوچەکەدا دواتر هەندێکیان بە چەند قۆناغێك لەناوچەکەیانەوە بەرە و شاری هەولێر کۆچیان کرد، قۆناغی یەکەم لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی بووە لەکاتی هێرشی سوپای ڕوسیا بۆسەر کوردستان، قۆناغی دووەم لەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول بووە لەساڵی ١٩٧٥ کەخۆشناوەکان بەلێشاو ڕوویان لەشاری هەولێر کرد، دوای جێگربوونیان لەشاری هەولێر زۆربەیان لەقەڵای هەولێر نیشتەجێ بوون، لەساڵی ٢٠٠٧ حکومەتی هەرێم بڕیاری لەسەر چۆڵکردنی قەڵاکە لەدانیشتوانی دەردەکات، خۆشناوەکان لەنێوان هەردوو شارۆچکەی بنەسڵاوە و کەسنەزان زەوی وەردەگرن و خانووی لەسەر دروست دەکەن و ئێستا لەوێ نیشتەجێن، بەڵام بەشێکی زۆریان هەر لەناوچەی خۆشناوەتی ماونەتەوە و لەوێ ژیان بەسەر دەبەن[٩٠] . ناوچەی خۆشناوەتی شوێنی ژیان و نیشتەجێ بوونی هۆزی خۆشناو بووە، بەمیرو بەگ و کوێخاو کرمانجەوە، خۆشناوەتی کەوتۆتە ناوچەکانی نێوان ڕانیە، ڕەواندز، شەقڵاوە، کۆیە. هاوسنور بووە

[٩٠] ئامادەکردنی ڕەوەست نەوزاد : سایتی puk media ،٢٠١٥/٢/١٢ .

لەڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ هۆزەكانی ئاكۆ و بڵباس، لەڕۆژئاواوە لەگەڵ هۆزەكانی هەروتی و سورچـی، لـەباكورەوە لەگـەڵ باڵـەك، لەباشـورەوە لەگـەڵ گـەردی. خۆشـناو ڕەوەنـد نەبوون، گەرمیان و كوێستانیان نەكردووە، لەئاوایی ژیـاون، خانویـان هـەبووە، هـەموو خێزانێ بەگوێرەی توانای دارایی و كۆمەڵایـەتی خـۆی، خانووەكـەی گـەورە یـان بچـوك بووە، پێك هاتووە لەژورێك یان زیاتر. گوندی خۆشـناوەتی نمونەیـەك بـووە لەشـێوەی ئەندازیاری گوندی كوردی ناوچە شاخاویەكان، گوند لـەبناری چـیادا لـەنزیكی كانیـاودا ئاوا كراوەتەوە، تۆپۆگرافیای ناوچەكە و زۆریی و كەمیی ئاوی كـانی وكـارێز، فاكتـەری سەرەكی بووە لەدیاری كردنی زۆری و كەمی ژمارەی خێزان و خانوەكانی دا، هەر ئەمە بۆتە هۆی بچـوكی گونـدەكان و دوریـی و دابڕانیـان لەیـەكتری، گونـدەكان لەسـەركانی بنیات نراون، نەك لەسەرچەمی گەورەو ڕوباری گەورە. بۆیـە هـیچ گونـدێ نـەیتوانیووە گەشە بكا ببێ بە شار یا بە شارەدێ ،دێ یەك كە ژمـارەی خێزانـەكانی زیـادی كردبـێ، هەندێ لەدانیشتووەكانی، بەناچاری گوندەكەیان بەجێ هێشتووە، ئەكـەر لـەو نزیكانـە كانیاو ئەرزی كوشتوكاڵی تر هەبوبێ بە هـەمان نـاوەوە، بـەزیادكردنی وشـەی سـەرو و خوارو، كۆن و تـازە گۆنـدێكی نوێیـان ئـاوەدان كردۆتـەوە، یـا بـە یـەكجاری لەگونـدی دایكانە دوركەوتوونەتەوە و ڕویان كردۆتە گوند یان ناوچـەیەكی تـر. خانوەكـانی گونـد بـەریز لەتەنیشـت یەكتریـەوە بنیـات نـراون، ڕیـزی یەكـەمی لـەلێواری دۆڵـەدا لـەبناری شـاخەكاندا دروسـت كـراوە و، لەسـەرو ئـەوەوە ڕیـزی دووەم و سـێیەم و چـوارەم هەڵكشاوە بەرەو لوتكەی كێوەكە، لەدورەوە كە بۆی بڕوانـی وەكـو هـەرەمێ كـە ڕیـزە خـانوی ژێـرەوە درێـژو دواڕیـزە خـانوی سـەرەوەی كـورت بۆتـەوە[٩١]. بنەماڵـەی فەرمانڕەوای هۆزی خۆشناو، وەكو خۆیان ئەڵێن پێك هاتوون لەنەوەی كابرایەك بەناوی (ئینـز)، كـە ئەبێتـە بـاپیرە گـەورەی سـێ بـەرەباب بـەناوەكانی: مـیر یوسـفی، مـیر مەحمەلی، پشتگەلی .

---

[٩١] نەوشیروان مستەفا ئەمین : بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین

خۆشناو باسی لەشەرەفنامەدا (١٥٩٦ ز)نەهاتووە، بەلأم ڕیچ لەسەردانەکەی دا (١٨٢٠ ز) باسی کردوون، کلۆدیس چیمس ریچ لەگەشتەکەی کوردستانی دا لەمیانەی گفتوگۆیەکی دا لەگەلێ هەندێ لەپیاوە ناسراوەکانی ئەو کاتەی سلێمانی کەجۆری سیستەمی کۆماری ئەمەریکا ی بۆ ڕوونکردونەتەوە، یەکێ لەئامادەبوانی دانیشتنەکە وتویەتی : ئەمایەن لەخێڵەکانی خۆشناو دەچیێ، کە هەر گوندێکیان سەرۆکی خۆی هەیەو هەمویشیان بۆ بەرژەوەندی تێکڕایی هۆزەکە کۆدەبنەوە و ڕاوێژ دەکەن ئەگەرچی ئەو پیاوە واتێگەیشتووە، بێگومان بەراوردی سیتەمی فیدراڵی ولایەتەکانی ئەمریکا زۆر جیاواز بووە لەگەلێ سیتەمی فیۆدالی هۆزەکانی خۆشناوەتی .

بەم بۆنەیەوە ڕیچ لەپەراوێزی یاداشتی ئەو ڕۆژەی دا باسی خۆشناوی نوسیوە دەڵێت: هۆزەکانی خۆشناو سیانن: میر مەحمەلی، میر یوسفی، پشدەری (ڕاستیەکەی پشتگەلی). دوانەکەی یەکەمیان هەمیشە لەشەڕدان کە لەبەرژوەندی میری بابانە و ئەگەر بەهۆی وریای خۆیەوە نەبوایە، نەیدەتوانی دەسەلأتی بەسەریان دا بسەپێنێ و کەڵك لەو دوبەرەکیەی ناوخۆیان وەربگرێ، وەك تورك و ئێرانیەکان بەهەمان هۆ دەسەلأتی خۆیانیان بەسەردا سەپاندوە، چەمێکی بچکۆلە لەنێوان ئەم دوو هۆزەدا هەیە مزگەوتێکی هاوبەشیان هەبوو، ڕۆژانی هەینی بۆ نوێژکردن تێدا کۆدەبنەوە و پاش ئەوەی بلأوەی لێ دەکەن و بۆشوێنی خۆیان دەگەڕێنەوە، لای چەمەکە دیسان دەست بە تەقەکردن لەیەکتری دەکەنەوە، جارێکیان لەمزگەوتەکە دا بووە شەڕیان بیست یان سی کەسیان لەیەکتری کوشتوو بوو .

ناوەندی فەرمانڕەوایی میر مەحمەلی شاری شەقلأوەیە، ناوەندی فەرمانڕەوایی میر یوسفی گوندی بالیسان و ناوەندی فەرمانڕەوایی پشتگەلی گوندی بێتواتە بووە، هەر یەکی لەم ناوەندانە گەورەیەکی هەبووە کە خۆیان پێیان وتووە میر، هەر میرێکیان زیاتر لە(١٠) گوندی گەورەو بچوکی لەژێر دەست دا بووە، گوندەکان لەنزیك کانی و ئاو بنیات نراون، میر لەشەڕو ئاشتی دا، گەورەی هەموو پیاوەکانی بنەماڵەکەی خۆی و کرمانجەکانی گوندەکانی ژێر دەستی بووە .بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی مەلاو میرزا و

سەرکار و خزمەتکارو نۆکـەر (پیـاو)ی چـەکداری هـەبووە. دانیشـتوانی هـەر دێ یـەکی پێکهاتووە لەچەندین خێزان، کە ناوەکی پێکهێنانی چەندین خێزانی فـراوان و بـەرەباب بوون، لەڕێگەی کوێخایەکەوە بەڕێوە بـراوە، کوێخـای دێ بـە زۆری گـەورەی بـەرەبابی دانیشتوانی دێیەکەی خۆی بووە. ئەگەر دێ یەك دوو بەرەباب یان زیاتری تێـدا بـووبێ، دوو کوێخا یا زیاتر سەرپەرشتی کردووە، هەر بەرە بابێ بۆ ئەوەی لەبەرە بابـەکانی تـر جیـا بکەرێتـەوە نـاوی تایبـەتی خـۆی هـەبووە، دیواخـانی مـیر جێگـەی کۆبوونـەوەی کوێخاکان و دەمڕاستەکانی گوندەکە بووە، میر لەدیواخانە کـەی دا بڕیـارە گرنگـەکانی داوە دەربارەی سەندنی باج و سەرانەکانی خۆی .

بنەماڵەی فەرمانڕەوا کە بەمیرانی خۆشناو ناسراون، دەوڵەمەند و هەژارو دەسـەڵاتدار و بێدەسـەڵاتیان، هـەڵگری نازنـاوی بـەگن، گوندنیشـینەکان بـە گشـتی سـەرەڕایی پلـەی دەوڵەمەندی و هەژاریان پێیان وتراوە کرمانج، کرمانج نەیتوانیووە ببێ بـە بـەگ یـان بـە یەکێ لەبنەماڵەی فەرمانڕەوا، تەنیا ڕێگەیەك بۆ گۆڕانی پێگەی کۆمەڵایەتی—چـینایەتی کرمـاجێ تـەواوکردنی خوێنـدنی دیـنی و وەرگـرتنی ئیجـازەی مەلایـەتی بـووە، کـوڕە کرمانجێ کە بووەتە فەقێ و سەرنجام بۆتە مەلا پایەی کۆمەڵایەتی بەرز بۆتەوە .

خزمایـەتی هـاوخوێنی لـەنێوان بنەماڵـەی بەگـەکانی خۆشـناو و گوندنیشـینەکانی ناوچەکەیان نەبووە، هاوسەرگیری لەنێوان بەگ و کرمانج دا نەکراوە، بنەماڵەی مـیر لـە ناو چینەکەی خۆی و هاوشانەکانی دا هاوسەرگیری کردووە، بەگ لەپایەی کۆمەڵایـەتی دا خۆی بە گەورەتر زانیوە لەکرمانج .

خۆشناو پێکهاتەیەکی دەربەگی بـووە، خـاوەنی ڕێکخـراوەی کۆمەڵایـەتی، سیاسـی، ئابووری، کارگێڕی، فەرهەنگی، چەکداری خۆی بووە، پەیوەندی نێوان بەگەکان و گوند نیشینەکان لەبنچینەی زەویداری بووە، کابرایەکی خۆشناو لەژێر چـەتری خێڵەکـەی دا، لەبەرامبەر دەستدرێژی و تەماحی هۆزەکانی دەوربەری دا خۆی پاراستووە، مـیر خـۆی لێ کردۆتە خاوەن و داکۆکی لێ کردووە، ئەویش پەنای بۆ میر بردووە. هـۆزێکی تـەواو نیشتەجێ بوون، بەپێی خەملاندنی (مـارك سـایکس) ژمارەیـان بەنزیکـەی (دوو هـەزار)

خێزان مەزندەکراوە، بەپێی سەرچاوەیەك لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا تێکڕا لەناوچەکانی (شەقلاوە، ڕانیە، کۆیە) بوون، (٩٣) گوندیان ئاوەدان کردۆتەوە[٩٢].

## هۆزی مەنمی :

مەنمی هۆزێکی دیاری کوردستانن و لەچوارپارچەی کوردستان بوونیان هەیە، بەڵام بەشی زۆریان لەباشور و ڕۆژهەلاتی کوردستانن، دەڵێن هۆزی مەنمی لەمادەوە هاتووە پاشان بووە بەمەندوومی و پاشان مەنمی، لەباشوری کوردستان هۆزی مەنمی بەزۆری لەم ناوچانە نیشتەجێن (سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، کۆستنجق(کۆیە) و گوندەکانی دەوروبەری، گوندەکانی دارەتووی حاجی حارس، دارەتووی نەزەر، کانی منم، کەندە کەوەی شەهیدان، کانی جنە(وارماوە)، تاسوجە، شێخ ڕەش، کێلەسپی، بارۆیی گەورە، بارۆیی بچووك، داری کەلی، وەرمزیار، تەپەشوانکارە، لەنجاوە، هەزار مێرد، گۆبتەپە، گۆملە، شیوەکەل، زرکویزە، لەونەوتی، والیاوە، عەربەتی کۆن، یەخی مالی، قرالی، باریکە، بوشین، ویلەیەر، مایاوا، خدران، تۆپزاوە، داقوق، عەبدولا غانم، پەنجا عەلی، تەکێ، بەغداد)، مراد خان و ستارخان دوو باپیرە گەورەی هۆزی مەنمی بوون، جلی بەرگی کورتەکو شەرواڵی و مرادخانی و ستارخانی لەو دوو سەرۆکەوە هاتووە و جێگەی کەواو سەڵتەیان گرتۆتەوە، مەنمیەکان بەخۆیان پێیان وایە لەنەوە و نەتیجەی مادەکانن. لەجەنگی یەکەمی جیهانی ڕووسەکان تەواو دەسەلاتیان لەئێران زیادی کردبوو، لەساڵی ١٩١٧ ڕووسەکان هاوکاری ئێرانیان دەکرد بۆ لێدانی عوسمانیەکان، بەگشتی هۆزەکان داگیرکاری ڕووسیان ڕەتدەکردەوە لەشاخی تەورێزخاتوون و شاخی هەوازوو. شەریف دەولە داوا لەسەرانی هۆزی گەڵباخی، مەنمی، شێخ سمایلی دەکات

[٩٢] خالد مەحمود کریم : س، پ ،ل١٥٠ .

بۆ ئەوەی مفەوزاتیان لەگەڵ بکات، هۆزەکانیش کۆبوونەوە لەنێوان خۆیان ئەنجام دەدەن بۆ ئەوەی شەڕکۆتایی بێت، داواکەی شەریف دەولە قبوڵ دەکەن کاتێك نوێنەری هۆزەکان دەگەنە حەوشەی سەرای نیزامی ناو شاری سنە، شەریف دەولە ئەمر دەکات بیانگرن، پاش ئابلوقەدان و گرتنیان بیست و یەك سەرۆك هۆزی ئەو سێ هۆزەی لەسێدارە دەدات لە١٩١٩/٤/١٩.

هەشت پیاو سەرۆك هۆزی مەنمی و شەش پیاو و سەرۆك هۆزی گەڵباخی و حەوت پیاو و سەرۆك هۆزی شێخ سمایلی، چەندەهای تریش خرانە بەندیخانە ئازاد نەکران تامردن، دوای ئەوەی چەندان سەردار و سەرۆك شەهید کران هۆز بێسەرپەرشت مایەوە، شاهی ئێران فەرمانی دەرکرد سوپا هێرش بکاتە سەر (عەزیز خان، تەکش خان)، بەڵام ئەمان و چەند شەڕکەری تر لەچیای (زیراوە) خۆیان قایم کرد بوو، شەڕ لەوناوچەیە بۆ ماوەیی سێ مانگ بەردەوامی هەبوو، لەئەنجام دا بێ فیشەك و بێ خۆراك مانەوە، لەدوای ئەمە بە خەنجەر و کوتەك شەڕیان کردووە، بۆیە تەکش خان بە عەزیز خانی برای دەڵێت :

گیان بۆ گیان بازی باشە
تەکش خان ووتی کاکی عەزیز خان
قەسەم بەخوێنی پاکی شەهیدان
تاسەر هەزاران نەبێت قەڵاچۆ
ناچێتە تاران سەری من و تۆ
کاکە تۆ بچی سەنگەر ڕۆژئاوا
زیانی زۆری لەئێمە داوە
لەگشت قۆرخانە دەستم براوە
تەنها چوار سندوق فیشەکم ماوە
ئەوا من دەچم بۆسەر فەرمان دار
هەتا دوا نەفەس دەست ئەخەمە کار

پاش ئەم شەڕە بەشێکی زۆر ڕایانکرد و ئەوەی تریان وەك دیل و دەست بەسەری لەدێهاتە سوتاوەکانیان بەچەرمەسەری ژیانیان دەگوزەراند[٩٣]. ئەیوب عەلی میرانی کەخۆی لەمەنمیەکانە لەساڵی ١٩٧٤ دەڵێت: ئەم هۆزە لەبنچەدا لەمادەکان بووە، شاعیری فارسی لیقاق لەچەند دێڕە شعرێکدا وەسفی کۆشکێك لەشیراز دەکات دەڵێت شوێنی میرانی مەنمیە بووە دەڵێت:

لەدووری تۆ هیچ نیە ئەعتادو هاش

قەسرێکم دیووە کەبەهەشتە

ئەوەندە کەجێگایەکی بەرز بوو

لەگەڵ ئاسمانی بەرز هاوزمان بوو

جیهان بەدیتنی ئەو شاد بوو

سەرچاوەی مەنمی ماد بوو .

باپیرە گەورەی مەنمیەکان ناوی وەیس بەگ بووە، وەیس بەگ شەش کوڕی لەپاش بەجێماوە بەناوەکانی (ئەلاّ مرادی، تاری مرادی، میران، قوباد، زەینەڵ، ئیناخ) لەم شەش کوڕە چەند تیرەیەك کەوتۆتەوە وەك جەناخی، میرانی، جەمشیری، مەلاوەیسی، کەریم وەیس، ئیناخی، میروەیسی، ئەلاّمرادی، بورەکەیی هتد...) جگە لەم تیرانە تیرەی تریشی لێ جیابووەتەوە، لەگەرمیانی عێراق ئەو کوڕانەش لەکاتی خۆیدا گەرمیان و کوێستانیان کردووە، ئەو تیرانەی لەباشوری کوردستانن بریتین لە (گاخۆری، ڕەماشەیی، گوێکوڕەژەیی، چەقەڵی، پیرەجانی)ە، ئیناخیەکان زیاتر لەهەزار ماڵ دەبن لەناوچەکانی جوانڕۆ و دەوربەری شمشێر نیشتەجێن، ئەلاّمورادیەکان لەنەوەی ئەلاّمورادی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەلی مورادە، تاڵی مورادی، ئیناخی،

---

[٩٣] دەستنوسی کەمال حمەشەریف حارس محەمەد مەنمی: سلێمانی، ٢٠١٩/١/١ .

جەناخ ، بورەکەیی نزیکەی دووهەزار بنەماڵـە دەبـن لـەولاتی کوێت نیشـتەجێن، پێـنج سەد بنەماڵەی مەنمی لەولاتی ڕووسیا نیشتەجێیە[٩٤] .

میرزا شکرولاّ سنندجی لەنێوان سالآنی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵێت: هۆزی مەنمی ئێستا لە کوردستانی ئێران دا بوون بەدوو تیرە: یەکەمیان بە(محەمەد مرادی) نـاوی دەرکـردووە کە دەگەڕێتەوە بۆ نـاوی (محەمـەد مـراد)ی باوەگـەورەیان. دووەمیـان (تـاری مـرادی) کەمەزن و کوێخایان (گەنج محەمەد) ناوێکە. نزیکەی پێنج سەد خێزان دەبـن، بـەهار و هاوین لەئێلاّخاتی کوردستانی ئێران ڕەشماڵیان هەڵداوە و ئاژەڵیان لەوەڕاندووە، پایز و زستانیش لەگەرمیانی (زەهاو، شارەزوور) زسـتانە هـەواریان خسـتووە، بـەلاّم نزیکـەی بیست وسێ ساڵێك لەمەوبەر لەگەڵ هۆزی جاف کە بۆ مەڕو مـالأت لەوەڕانـدن دەهاتنـە کوردسـتانی کوردسـتانی ئێـران و لەگـەڵ هـۆزی (گـەلاڵی) کەبەشـێکن لـەجاف شـەڕ و کوشتارێکیان کرد و گەلاڵیەکان حەوت

کەسیان لەمەنمیەکان کوشت کە یەکێکیان برای (گەنج محەمەد) بوو .



پاشـــان هـــۆزی مـــەنمیش هێزێکیان کۆکردەوەو ڕژانـە سـەر گەلاڵیـەکان و چـەند کەسێکیان کوشت و بریندار کـرد، ئـەم مەسـەلەیە بـوو بـــەهۆی دوژمنایەتیـــەکی

**سوارەی مەنمی لەساڵی ١٩٣٦ لەناوچەی حوسێن ئاوا** . زۆر لەنێوان هەردوو هۆز، هـۆزی مەنمی کەجیرانی عێڵی جاف بوون، وایان بە بـاش زانـی چـوونە گـەرمیان بـە یـەکجاری

---

[٩٤] کەناڵی ڕەسەن: ئیبراهیم مهندس بیکەس مەنمی، گوندی پونگینە، سنوری پارێزگاری هەولێر، ٢٠١٨/٨/٩.

وەلابنێن و کوێخاکانیان چەند گوندێکیان لەناوچەی (حوسێن ئاوا)ی کوردستانی ئێران کڕی و خۆیان و هۆزەکەیان لەوێ مانەوە و خەریکی کشتوکاڵ بوون، پایز و زستان بەشێوەی هەوارچیەتی دەچوون بۆ کوێستانی ناسراو بەپیر (مەحمود) کە کەوتۆتە نێوان سنەو گەڕووس. ئێستا ئەوە دە دوانزە ساڵێکە لەنێوان تیرەی(محەمەد مرادی) و (تاری مرادی)دا دووبەرەکی سەری هەڵداوە و(تاری مرادیەکان) لەوانی تر جیا بوونەتەوە[٩٥]. بەشێوەیەکی تێکڕایی هەوارگەی سەرەکی مەنمیەکان حوسەین ئابادەو زۆرتر لەسی هەزار خێزانی مەنمی لەدەورو بەریدان کە لەدێهاتەکانی (سیاسەرانی سەروو و خواروو، کێلەسپی، گژی گەران، سادق ئاباد، پشت تەنگ، کانی چەمك، موبارەك ئاباد، برگشاد، خوراسان ،شیکوژی سەروو هتر..) دەژین، هەزار خێزانیان لەناوشاری سنەدا نیشتەجێن[٩٦] .

مەردۆخی ئاماژەی بەم چوار تیرەی هۆزی مەنمی داوە وەك :

١- محەمەد مورادی: کەدەکاتە باپیرە گەورەیان، لەشارەزوورو زەهاو نیشتەجێن.

٢- ئاخە سوری: لەگەرمەسێری کوردستان (سنە) نیشتەجێن، مەردۆخی دەڵێت نزیکەی پەنجا ماڵ ئەبوون .

٣- عەلی مورادی لۆلدەرزی: لەناوچەکانی حەسەن ئاوا نیشتەجێن [٩٧].

٤-تاری مورادی: ئەم تیرەیان بەژمارە زۆرن و کۆچەری بوون گەرمیان و کوێستان کردووە، زستانانیش دەچوونە دەڤەری زەهاو و شارەزوور[٩٨] .

---

[٩٥] میرزا شکرولا سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلان ،و ئەنوەر سولتانی ، چاپخانەی ژین–سلێمانی، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل ١١٦–١١٧ .

[٩٦] خسرەوجاف: س ، پ ، ل٢٦٤ .

[٩٧] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل١٢٠ .

[٩٨] خسرەوجاف : س ، پ ، ل٦٨ .



کۆبوونەوەی هۆزی مەنمی و گەڵباخی و زەند لە
گوندی ئاڵی پینەك لەیلاخ ناوچەی لەساڵی ١٩٥٦



کۆبوونەوەی گەورە پیاوانی مەنمی لەشاری بیجار
لەساڵی ١٩٦٥



حوسێن خان و فەتحولڵاخان ڕەشیدی لەسەرۆکەکانی
مەنمی لەگەڵ میرزا حەبیوولڵای پیروەیسی



عەزیز خان و تەکش خان لەگەڵ پۆلێك
لەپێشمەرگەکانیان

## هۆزی بۆرەکەیی :

هۆزێکی کوردن نزیکەی چوارسەدو پەنجا خێزانن، لەزەهاو و عێراقی عـەرەبی و لـەیلاق و ئیسـفەندئاباد و ناوچـەکانی حوسـێن ئـاوای سـنە نیشـتەجێن، باوەگـەورەیان نـاوی بۆرەکەیی بووە[٩٩] . ئێستاش هەندێکیان لەولاّتی کویت .

مـیرزا شـکرولاّ سـنندجی لـەنێوان سـالاّنی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵـێ: هـۆزی (بۆرەکـەیی) ژمارەیان سەد و پەنجا خێزانێکن و بەمەزندە شەش سەد کەسێك دەبن بـەژن و پیـاو و گەورەو بچووك، زستانان لەگـەرمیان زەهـاو و هاوینـان لەمـەحاڵی ئیسـفەند ئاباد مـەڕ دەلـەوەڕێنن، ئـەم هـۆزەلقی هـۆزی (مـەنمی)ن، نزیکـەی سـەد سـالّێك دەبـێ بـەهۆی ناخۆشیەوە لێیان جیا بوونتەوە[١٠٠] .ئەم هۆزە زوو وازیـان لـەژیانی کۆچـەرێتی هێنـاوە زۆرێکیان لەسنە نیشتەجێ بوون[١٠١]

## هۆزی گەڵباخی :

گەڵباخی هۆزێکی گەورە و ئازا و قارەمانن، بناغەی ئەم هـۆزە لەسـەر پارێزگـاری و گیـانی مقاومـەت و خـەبات دژی دوژمنـانی کوردسـتان دامـەزراوە، هـۆزێکی گـەورەی کـوردە، بەشـێوەیەکی گشـتی لەشـەش تـیرەی سـەرەکی پێکهاتووە کە بریتین لە(مورادگۆرانی، گـاملّی، قەمـەری، کـاك



[٩٩] شێخ محمەدی مەردۆخ: مێژووی کورد و کوردستان ،و زانەر محەمەد ،چ١

[١٠٠] میرزا شکرولاّ سنندجی: هۆزو تـیرەو تایفـەی کـورد لەکوردسـتانی ئـەردە

چاپخانەی ژین –سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،٧٩.

[١٠١] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل١٣٤

سەوەندی، چۆخەرەشی، وەرمزیار) هەروەها چەندین بەرەباب و بنەماڵـەی تریـان لێـی پێکهاتووە وەك (پیتوەسەری، هـەمزەیی، کـوڵکنی، نـەورۆزی، خانـەیی، غـەزائی) واتـا سـەرجەم ئـەم هـۆزە لـەدوازدە تـیرە پێکهـاتووە و هـەموویان نـەوەی عـەباس ئاغـای گەڵباخین، عەباس ئاغا بەبابە گەورە و دامەزرێنەری سەرەتای ئەم هۆزە دادەنرێت .

هۆزی گەڵباخی کێن و لەکوێ وە هاتوون :

مێژووی دروست بوونیان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی ١٤٩٠زایـنی واتـا ٥٢٩ سـاڵ پـێش ئێستا، هەموویان نەوەی عـەباس ئاغـان ئـەم پیـاوە لـەکوردەکانی خێڵـی ئیسـتاجلوە، خاوەنی گوندی گێڵەباخی ناوچەی شلێر بووە، بەهۆی ڕووداوێکـی کۆمەڵایـەتی عـەباس ئاغا و یارولاًخانی خوشـکەزای دەچـێت بـۆلای بێگەبـەگی ئـەردەلان، لـەماوەی سـالآنی ١٤٨٠–١٥٢١ بێگـە بـەگ ناوچـەی هەڵەبجـە و قـەلآی زەڵـم و ناوچـەی هـەورامانی پـێ بەخشیووە، بێگە پلەی مۆرداری ئەردەلانی دەداتە عەباس ئاغا لەبەردڵسۆزی و دەست پاکی و دەیکاتە میری ناوچەکانی ژێـر دەسـەلآتی خـۆی، دوای دروسـت بـوونی کێشـەو لەیەکتێنەگەیشتن که هەندێك لەناحەزانی نـاو میرنیشـینەکە دەکەونـە مقۆمقـۆ و پـلان گێڕان لەدژی عەباس ئاغا دەچـنە لای بێگـە بـەگ پێـی دەڵـێن عـەباس ئاغـا دەیـەوێت لەناوت بەرێت و پلانی لـەدژی تـۆ داڕشـتووە، بێگـە بـەگیش قسـەی ناحـەزانی بەهەنـد وەردەگرت، عەباس ئاغا زوو هەواڵی ناحەزانی دەزانێ و لەگەڵ هێزەکەی و یارولاًخان و ماڵ و منداڵی لەشاری زەڵم دەردەچن و بەرە و ناوچەی (بێڵـەوار)ی کرماشـان ڕێگـەیان کرتەبـەر . کاتێـك بێگەبـەگ بەڕۆیشـتنی عـەباس ئاغـا و یارولاًخـان دەزانێـت بێتاقـەت دەبێت و دەزانێ دوو سەرکردەی چەند ئـازاو بـەتوانان بۆیـە کـەس بەدوایانـدا نانێرێـت لەبەرئەوەی نەك شەڕ ڕووبدات، کاتێك عەباس ئاغا دەگات بەناوچەکانی بێڵەوار و لەوێ جێگـردەبن هـەرزوو لەگـەڵ هۆزەکـانی لـەك، هورمزیـار، مـادەکی، سـلێمانی، کـەڵهوڕ پەیوەندی و خزمایەتیان لەگەڵ پێـك دەهێنێـت، لـەو کاتـەدا (شاتهماسـب)ی سـەفەوی بەرەو ئۆزبەکستان هێرشی دەکرد، لەوکاتـەدا عـەباس ئاغـا و یارولاًخـانی خوشـکەزای بەهەلی دەزانن خۆیان دەگەیەننـە لای شاتەهماسـبی سـەفەوی و بەشـداری ئـەو شـەڕە

دەکەن، لەئەنجامی ئازایەتی و گیانفیدایی لەشەڕی دژی ئۆزبەگ بەگ دوژمنی شا و شکاندنی، شاتەهماسب حکومەتی (بێڵەواریان) پێدەبەخشێ و بۆ چەندین نەوە میرایەتی ئەم حکومەتە دەکەن، سنوری میرایەتیان لەکرماشان تا ناوچەکانی بێڵەواری کەوتە دەست، ماوەی سەد ساڵ میرایەتی سەربەخۆی خۆیان هەبووە، لەلایەن حکومەت ناوەندی ئێرانەوە بەمیرایەتی ناسراون، تاسەرەتای ساڵەکانی دەست بەکاربوونی حەمەڕەزا شا ئیدارەی سەربەخۆیان هەبوو .پاش کۆچی دوای عەباس ئاغا دەسەڵاتی میرایەتی دەکەوێتە دەست یارولآخان، بەلآم یارولآخان داوا لەعەلی ئاغای کوڕی عەباس ئاغا دەکات بەبیانووی ئەوەی هیلاك و ماندوو و خێزان دارە، ئیتر عەلی ئاغا دەسەڵات دەگرێتە دەست، عەلی ئاغا هەوڵی پەیوەندی دەدات لەگەڵ دەوروبەری سنوری حکومڕانیەکەی، پەیوەندیەکانی لەگەڵ بێگەبەگی ئەردەڵانی ئاسایی دەکاتەوە، لەسەردەمی عەلی ئاغا خەڵکی خاوەنی مەڕ و مالآتێکی زۆر بوون لەژیانێکی خۆشی و بەختەواریدا بوون، لەساڵی (٩٦٨) کۆچی عەلی ئاغا کۆچی دوای کرد، پاش عەلی ئاغا (حەیدەر بەگ)ی کوڕی فەرمان ڕەوای ناوچەکەی گرتە دەست، لەسەردەمی حەیدەربەگ کێشەو ئاژاوە کەوتۆتە نێوان فەرمانڕەواکەی و شەڕی براکوژی سەری هەڵدا لەنێوان بنەماڵەی حەیدەربەگ و بنەماڵەی خێزانەکەی، کە کێشەیەك لەنێوان سورخاب بەگ کوڕی حەیدەر بەگ و خاڵوانی ڕویدا، ئەمەش بووە هۆی لاواز بوونی ئیدارەی گەڵباخی، حەسەن بەگ ناوێك ئەمە بەفرسەت دەزانێت خۆی دەگەیەنێت لای سوڵتانی عوسمانی لەئەستەمبوڵ توانی دەسەلآت بگرێتە دەست، هەر لەو کاتەدا هۆزی کەڵهوڕ ئەو لاوازیەی بەفرسەت دەزانن هێرش دەکەنە سەر هۆزی گەڵباخی بەرەی ئاوی سیروان ڕاوی دەنێن، بەلآم لەکۆتایدا حوسێن بەگ توانی دەسەلآت وەربگرێتەوە و لەساڵی (١٠٠٣ کۆچی بۆ ١٠١٤ کۆچی)، پاش ئەوەی لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی ڕێك دەکەوێت، گەڵباخیەکان لەسەردەمی میر هەڵۆخانی ئەردەڵان خاوەن پێگەو دەسەلآت بوون، میرهەلۆخان لەناوچەکانی سنە، خورخورەی سەقز، سارالی دیواندەرە، قەرەتەوە نیشتەجێی کردن تا تیلەکۆی سەقز و کەناری شاری سنە هەروەها کۆماسی

و کەلاّتەرزای دەگرتــەوە، کــە ناوچــەیەکی زۆر بــەپیت و بەرەکــەت بــوو لــەو ناوچــەیەدا هەندێك هۆزی تری تێدا بـوو وەك شـێخ سمـایلی، قالّقـالّی، چوچـانی، بـەرازی، هـۆزی جافیش لەوەرزی هاوین ڕویان دەکردە ناوچە کوێستانیەکان .

لەکۆتای سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم قۆناغێکی نوێ هاتــە ئـاراوە، ئەویش هاتنی ئینگلیزەکـان بـوو بـۆ قـولاّیی خـاکی ئێـران، پاشـان لەجـەنگی یەکـەمی جیهانی ڕووسەکانیش هاتنە ڕۆژئاوایی خـاکی ئێـران، سیاسـەتی ئینگلیـز وابـوو لەگـەڵ قاجاریــەکان ڕێککــەوتبوو کــەدەبێت هەرچــی دەســەلاّتی هــۆزە کوردیەکانــە لــەژێر دەسەلاّتی مەرکەزیدا بێت، لەم کاتەدا هێـز و ئیـدارەی گـەڵباخی بـەزۆری لەناوچـەکانی سـاراڵ کۆبوونــەوە ئــەم داگیرکاریــەی ڕووس و داواکـاری ئینگلیزەکانیــان پێــی قبــوڵ نەدەکرا .

لەجەنگی یەکەمی جیهانی ڕووسەکان تەواو دەسەلاّتیان لەئێران زیادی کردبوو، لەساڵی ١٩١٧ ڕووسەکان هاوکاری ئێرانیان دەکرد بۆ لێدانی عوسمانیەکان، بەگشـتی هۆزەکـان داگیرکاری ڕووسیان ڕەتدەکردەوە کاتێك کەڕووسەکان هێزەکانیـان بـەرە و ناوچـەکەی گــەڵباخی دەبــەن هــەرزوو دەکەونــە خۆیــان پــەلاماری ڕووســەکان دەدەن لەشــاخی تەورێزخاتوون و شاخی هەوازوو، لەو شەڕەدا گەڵباخی، مەنمی، شێخ سمایلی بەشداری شەڕەکە دەکـەن لەسـاڵی ١٩١٧ لەوشـەڕەدا دوازدە تـۆپی ڕووسـی دەگـرن و هـەروەها چـەندین کـوژراو دیلیـان دەبێـت لەشـکری ڕووس بـەرەو بیجـار و هەمـەدان دەشـکێن .

هێزەکانی سەربەحکومەتی ناوەندی ئێران ئەوەندە هێزیان نابێت بەرنگاری گـەڵباخی و هۆزەکانی تـر ببنــەوە، لـەم کاتــەدا حکومــەت بــەفێڵ و تەڵەکـە ڕاوێـژکارێکی سـەربازی بەناوی (میرزا عەلی محەمەدخان) ناسراو بەشەریف ئەلدەولە دادەنێن بـەحاکمی شـاری سنە و کوردستان، ئەمیش بەفێڵ و تەڵەکە جاش و بـەکرێ گیراوێکـی زۆر کۆدەکاتــەوە لەمەریوان، بەشێك لەهەورامان، کۆماسی، هێزێکی سەردار ڕەشید جـوانڕۆیی . شـەریف دەولــە داوا لەســەرانی هــۆزی گــەڵباخی، مــەنمی، شــێخ سمـایلی دەکـات بـۆ ئــەوەی مفەوزاتیان لەگەڵ بکـات، هۆزەکـانیش کۆبوونـەوە لـەنێوان خۆیـان ئـەنجام دەدەن بـۆ

ئەوەی ئەو شەڕە کۆتایی بێت، داواکەی شەریف دەولە قبولّ دەکەن کاتێك نوێنەری هۆزەکان دەگەنە حەوشەی سەرای نیزامی ناو شاری سنە، شەریف دەولە ئەمر دەکات بیانگرن، پاش ئابلوقەدان و گرتنیان بیست و یەك سەرۆك هۆزی ئەو سێ هۆزەی لەسێدارە دەدات لە١٩/٤/١٩١٩.

پاش لەناو بردنی سەرۆك هۆزەکان دۆخی ناوچەکانی سارالّی گەلّباخی ڕۆژ بەڕۆژ بەرەوخراپی و هەراو شەڕی داسەپێنراوی حکومەت دەچوو، حکومەت نیازی وابوو هیچ ناوچەیەکی خۆجێی نەمێنێت ناوەند دەسەلاّتی بەسەریدا نەبێت، لەمەشدا هەندێك بەرپرسی کورد هاوکاری حکومەتی ناوەندی بوون، لەسالّی ١٩٢٧ زاینی جارێکی تر هێرش دەکرێتە سەرناوچەکانی گەلّباخی لەناوچەی ئالۆلاخ بەسەرکردایەتی (سالار فەتاح، ئەکبەر میرزا) و بەسەرپەرشتی شەریف ئەلدەولە پاش ئەوەی هێزەکانی دوژمن نزیك دەبنەوە لەقەلاّی ئالۆلاخ هێزەکانی گەلّباخی، مەنمی، شێخ سمایل لێیان ڕادەپەڕن و زەبرێکی کوشندەیان لێدەدەن کەچەندین کوژرا و بریندار لێدەکەوێتەوە.

هێزەکانی حکومەتی ئێران هەر بەردەوام دەبن لەهێرش کردن، لەهێرشێکی دیکەدا بۆ سەر گەلّباخیەکان بەسەرکردایەتی سەرگورد هەیبەت بۆ سەر گوندەکانی گیزملی خوار و سەروو و تیرەکانی گاملی و مورادگۆرانی گەلّباخی بەرپەرچیان دەدەنەوە بەهێز [١٠٢]. لەسالّی ١٩٣٦زاینی لەسەردەمی ڕەزا شای بەهلەوی لەئەنجامی ململانێ ملنەدانی**١٩٣٧** گەلّباخیەکان تووشی کۆمەلّکوژی و کۆچپێکردنی زۆرەملێ و پەرتەوازە و ئاوارەبوون بوونەتەوە، دەست بەسەر سەروەت و سامانیان گیرا، بەشێك لەگەلّباخی ڕوویان لەباشوری کوردستان کرد، **کۆمەلّەیەك منداڵ و خێزانی گەلّباخی لەکاتی**



[١٠٢] خالید ئەحمەدی: فەرمانڕەوای گەلّواخیەکان، ئامادەکردنی عەلی عەبدولاّ شەریف گەلّباخی: دەستنوس، سلێمانی، ١٨/٩/٢٠١٨ .

**و کۆمەڵکوژی و ڕاگواستنیان لەساڵی**

کەژمارەیان هەزار و پێنج سەد خێزان بوو، لەناو تیرە و هۆزەکانی کورد گیرسانەوە و بەلاّم پارێزگاریان لەناو ناوبانگی هۆزەکەیان کردووە. ڕەزاشای پەهلەوی لەساڵانی (١٩٣٥–١٩٣٦) دەستی کرد بەهێرش کردن بۆ سەر ناوچەی گەڵباخیەکان، کۆچی بەکۆمەڵی پێکردن و دوری خستنەوەلەکوردستانەوە بەرە و هەمەدان، کرمان، یەزد، سیادەون، تاران، لەساڵی ١٩٤٢ لەدوای ڕەزا شا، محەمەد ڕەزا شای کوڕی جێگای گرتەوە لەوساڵەدا زۆربەی گیراو دورخراوەکان توانیان خۆیان ئازاد بکەن و بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان لەکوردستان، لەدوای هەندێك شەڕ و شۆڕش و پێدادان، لەساڵی ١٩٤٣ گەڵباخیەکان و حەمەڕەزا شا ڕێکەوتنی ئاشتیان مۆرکرد، ئیدی کۆتای بەقۆناغێکی سەخت و دژوار و لەناو بردن هات .

قانعی شاعیر لەشیعرێکیدا دەربارەی هۆزی گەڵباخی دەڵێت :

ئەی میلەتی گەڵباخی زەدەی دەستی نەدامەت
ئەی مەنشەئی ئیحسان و کەرەم، بەحری سەخاوەت
کوا ڕەونەقی دێرینە لەسەر بەزمی عەباست
کوا شۆڕشی مەیدانی عەلی شێری شەجاعەت
کوانێ قولی و کوا ئەسەد و کوانێ موحەمەد
هەرسێ خەلەڤ یاری خوان .کانی کەرامەت
تادوێنی بوو یەقین و مەسکەنی تۆ خاکی زەهاو بوو
بۆ ئێستا وەها ماتی لەژێر باری سیاسەت
کوا کەشمەکەشی دەشتی کرند و خوتەی شێخان
ئەفسوسە لەبۆ ئێوە هەتا ڕۆژی قیامەت
ئەو وەختە نەبوو توخمی نیفاق و شەڕ و شۆڕش
بۆیە کەهەموو دووژمنی خۆت هاتە ئیتاعەت
بۆ سەرکزی ئەم هۆزە دلێرە وەکو قانع

ڕوو زەرد و سەر ئەفکەندە لەژێر باری قەباحەت .

فـەخـرە بـۆ مـن ئـیفـتیخار و حورمەتی چوار تائیفە

زەند یەك، گەڵباخی دوو، شێروانی سێ، میدیا چوار

گەڵباخی بەشێوەزاری سۆرانی و بن لەهجەی ئەردەلانی قسـە دەکـەن[103] . بەشـێکی زۆری گەڵباخیـەکان کەوتوونەتـە سـنوری ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان، هەرلەبـەر ئەمـەش زۆرترین شۆڕش و ڕاپەڕین و ناڕەزایەتیەکانی گەڵباخی لەوبەشـەی کوردسـتان بـووە دژ بەدەوڵـەتی ناوەنـدی ئێـران و دەسـەلاتی یـەك لـەدوای یەکـەکانی لەوانـە حکومـەتی شاهەنشای ئێران[104]

سنوری جوگرافیا و هەڵکەوتەی ناوچەی گەڵباخی:

گەڵباخیەکان لەئێستادا لەلادێ و شارەکاندا ژیان بەسەر دەبەن و لەکاتی گەرمیان و کوێستان و گەڕان بەدوای لـەوەڕ بـۆ ئاژەڵـەکانیان لەگـەڵ هۆزەکـانی گـۆران، بـەرازی، قالقالی، چوچانی، سەیدەکانی باینچۆ زەلکەو کۆڵ و هانەگلان لەبەشی باشـورەوە، لـە بەشـی بـاکورەوە لەگـەڵ هـۆزی تیلـەکۆ، لەڕۆژهەلاتـەوە لەگـەڵ هـۆزی مـەنمی، لـە ڕۆژئاواشـەوە لەگـەڵ کۆماسـی یـەکان لەگـەڵ چـەم و شـیوی مـەریوان هاوسـنورن . مەردۆخی دەڵێت گەڵباخیەکان سێ هەزار و پێنج سەد بنەماڵە بوون، شوعەیب مـورادی لەگۆڤاری ژمارە ٢١ و ٢١ دەڵێـت: تیرەکـانی گـەڵباخی لەسـنوری سـاراڵ بـەم شـێوەیە دابـەش بـووە مرادگـۆرانی و چۆغەڕەشـی لەناوەڕاسـتی سـاراڵن، گامیلیـەکان باشـوری سـاراڵیان گرتـووە لەگـەڵ بەشـێك لەڕۆژهـەلاتی سـاراڵ، وە تیرەکـانی هـەمزەیی، پێناوەسەری، کولکن، نەورۆزی، لەڕۆژئاوای ساراڵ نیشتەجێ بوون، هەروەها تیرەکـانی کاك سەوەندی، قەمەری، وەرمەزیار، باکوری ساراڵیان گرتووە لەناوچەکانی خوڕخـوڕە و هەوەتوو . گەڵباخیەکان لەناوچـەی سـاراڵ لەنزیکـەی (٩٠تـا ١٠٠) گونـد نیشـتەجێن، بەهۆی ئەو کۆڕەو ڕاگواسـتنەی لەناوچـەکانی سـاراڵ و شـوێنەکانی تـری گـەڵباخی کـە

---

[103] **مێژووی هۆزی گەڵباخی لەسەرچاوەمێژوویەکاندا: نەوزادی موهەندیس ،سلێمانی ،٢٠١٢، ل٥٦–٥٨.**

[104] مێژووی هۆزی گەڵباخی لەسەرچاوەمێژوویەکاندا: نەوزادی موهەندیس، سلێمانی ،٢٠١٢ .

حکومـەتی مەرکـەزی ڕایگواسـتن، ئێسـتا گەڵباخیـەکان لەچـەندین شـار و شارۆچـکە نیشتەجێن وەك: (تاران، کەرەج، هەمەدان، سنە، سەقز، مەریوان، دیوانـدەرە، بیجـار، تەیکانتەپـەی هەوشـار هـەروەها لەچـەندین جێگـە و وڵاتـانی دەرەوە بڵاوبوونەتـەوە، هـەروەها بەشـێکیان بـەهۆی زرووف سیاسـی و ئـەو ڕووداوانـەی بەسـەر ئـەم هـۆزەدا هـاتووە، یـان بـەهۆی گـەرمیان و کوێسـتان ڕوویـان کردۆتـە باشـوری کوردسـتان لەپێنجوێن، ناوچەی شلێر، شارەزوور، سەیدسادق، هەڵەبجـە، گـردی گـۆ، قەدەفـەری، هۆڵەسمت، کەلار، پونگلـە، سـلێمانی، قـەرەداخ، کۆیـە، قـەلآدزێ، تاسـولّجە، کـەرکوك نیشتەجێن[105]. لەسەرناوی گەڵباخی چەند بۆچونێك هەیـە: هەنـدێك دەیگەڕێننـەوە بـۆ گوندی گەڵباخ کە کاتی خۆی عـەباس ئاغـا ئـاوەدانی کردۆتـەوە، هەنـدێکی تـر دەڵـێن عەباس ئاغا باخێکی گەورە و خۆشـی هـەبووە، هەرکـەس بـەلای باخەکەیـدا رۆشـتووە بانگی کـردووە بـەزمانی تـورکی گێـل باغـە واتـا وەرەبـاخ، بەتێپـەڕ بـوونی کـات بـووە بەگەڵباخ، یان ڕایەکی تر هەیە دەڵێن عەباس ئاغا بەهۆی بوونی گوڵی ڕەنگا و ڕەنـگ و جوان عەباس ئاغا خۆی ئەم ناوەی بەسـەر ئـەم هـۆزەدا بڕیـووە، یـان ڕایـەکی ترهەیـە دەڵێت ئەم باخە لەناو گەلیەکدا بووە، واتا دۆڵێك لەناو شاخێکی بەرزدا پێ دەڵێن گەلی وەك گەلی عەلی بەگ، بۆیە ناوەکـەی بووەتـە گـەل بـاخ بەتێپـەڕ بـوونی کـات بووەتـە گەڵباخی، یان ڕایەکی تریش هەیـە دەڵـێن ئەوکاتـەی پەیوەنـدی نێـوان عـەباس ئاغـا و بێگەبەگی ئـەردەلآنی تێـك دەچـێت، عـەباس ئاغـا بـەخزم کەسـەکانی ووتـووە نەیـەڵن بمانگرن یان بمانکوژن دەبێت وەك کەڵ بەرگری لەخۆمان بکەین دواتـر بـووە کـەڵ بـاخ[106]. میرزا شکرولآ سـنندجی دەڵـێ: بیسـت سـاڵێك لەمـەو پـێش کەدەکاتـە دەوربـەری ساڵی (١٨٦٠)زایینی گەڵباخیەکان لەگەڵ ئێلی جاف کەوتنە شـەڕێکی تونـدەوە و چـەند کەس لەهەردوو لایان کوژرا، لەوکاتە بە دواوە بـەهۆی دوژمنایـەتی ئێلـی جافـەوە ئـیتر نەچوونە شارەزوور و پایز و زستان لەهەندێك گوندی کوردستان خانوو بەرەیان دروست

---

[105] عەلی عەبدولآ شەریف گەڵباخی: دەستنوس، سلێمانی ،٢٠١٨/٩/١٨ .

[106] مێژووی هۆزی گەڵباخی لەسەرچاوەمێژوویەکاندا: نەوزادی موهەندیس ،سلێمانی ،٢٠١٢، ل٥٦–٥٨.

کردوو بەشێوەی نیشتەجێ دەژیان و لە ئێلاٌخاتی ئەو ناوچانە و شوێنی تر خەریکی ئاژەڵداری بوون .ئەوانەی ئێستاش کە لەشێوەی خێوەت نشینیدا ماوەنەتەوە نزیك بەپێنج سەد خێزانن، هەر چەند خێزان کوێخای خۆیان هەیە، بەلاٌم گەورەی هەموو کوێخاکان دوو کەسن کوێخا (حەسەن، خەسرەو)[١٠٧] .



لای ڕاستەوە عەباس خان ئەمیر حەسەنی و یەدولاٌخان مورادی و حەمەعەلی خان موراد گورانی و عەلی خان کوڕی ئیجلاله سولْتان عەبدولاٌن مورادی لەساڵی ١٩٣٥ .



لای ڕاستەوە میخان بەگ ئەحمەدی برا گەورەی گاملیەکان و حاجی مەجید خان سەلیمی برا گەورەی چۆخەڕەشی و ئیجلاله سولْتان برا گەورەی قەمەریەکان حەمەعەلی خان مورادی براگەورەی مورادە گۆرانی و یەحیا خانی ئەمینی براگەورەی کاك سەوەندی .



لەشکرێکی هۆزی گەڵباخی لەکاتی هێرشی قاجاریەکان



کۆمەڵەیەك منداڵ و خێزانی گەڵباخی لەکاتی کۆمەڵکوژی و ڕاگواستنیان لەسالاٌنی ١٩٣٥ – ١٩٣٦.

---

[١٠٧] میرزا شکرولاٌ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلاٌن، و ئەنوەر سولْتانی، چاپخانەی ژین –سلێمانی، چ١ ،٢٠٠٦،ل٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل ١٠٢–١٠٣ .

## هۆزی داودە :

داودە هۆزێکی کوردیە و پێشتر لەقەلأی داد لەڕۆژهەلأتی کوردستان نیشتەجیٚ بوون، دواتر بەشێکیان هاتوونەتە باشوری کوردستان لەناوچەکانی نێوان داقوق و خورماتوو و کفری و قادرکەرەم نیشتەجیٚ بوون، وەك دەردەکەوێت هاتنەکەیان بەهۆی هێرشی (هۆلاکۆ)وە بووە توانیویانە خۆیان ڕزگار بکەن و بەئاوارەیی گەیشتوونەتە دەوروبەری کفری و تێدا جێگر بوون[108].بنەماڵەی فەرمانڕەوایی ئەم هۆزە تۆرمەی دەگاتەوە سەر کەسێك بەناوی (حەقی بەگ) نەوەی پێنجەم لەحەقی بەگەوە لەناحیەکانی (تاوغ، دووزخورماتوو) موڵك و زەویەکی زۆریان هەبوو، توانایەکی باشیان هەبووە و گوندەکانیان زۆر بووە، حەقی بەگ خێزانەکەی ناوی شاخاتوون بووە کەخوشکی میر سمایلی زەنگنە بووە. سەرۆکی سەرەکیان(مەنسوور ئاغا) بووە، لەگەڵ (ڕەفعەت بەگ، ئیسماعیل بەگ، محەمەد خورشید ئاغا، ساڵەح کوڕی لوتفی ئاغا) شەش سەد ئەسپی چاك و حەوت سەد سواریان هەبووە، وێڕای ئەوەی (مەنسوور ئاغا) سەرۆکی لەهەمووان بەهێزتری هۆزەکە بووە، کەچی سەرۆك هۆزەکانی دیکە لەڕووی هێزەوە سەربەخۆن، هەریەکیان گروپ و لایەنگری خۆی هەبووە[109] .نامیق ئاغای کوڕی عەلی ئاغا کە ئەوکات سەرۆك هۆزی داودە بووە لەشەڕی (شعێبە)* بەدەستی ئینگلیزەکان کوژراوە[110].هۆزی داودە دەگەڕێتەوە سەر باپیرە گەورەیان (میر داود کوڕی مەلیکی کوڕی میر سلێمان)ە، ئەم هۆزە لەبەرەبابی دوو پیاون لەپشتی میر داود. یەکەمیان ناسر بەگی کوڕی شێر بەگی کوڕی شێخ حەسەن کوڕی مەلیك خەلیکی کوڕی سوڵتان

---

[108] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ: ناوچەی کفری لەنێوان سالانی (١٩١٤– ١٩٤٥)، چ١ ،٢٠١٠ ،ل١٢٩ .

[109] مێجەرئی .بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو ، و نەجاتی عەبدوڵلاٌ ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ل ٤٣–٤٤ .[109]

[110] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ: س، پ ،ل١٨٣ .

* لەساڵی ١٩١٥ لەسەر دوای تورکە عوسمانیەکان شێخ مەحمود بەسەرکردایەتی بە شێکی زۆر لە هۆزەکانی کورد چون بۆ بەصرە بۆجیهاد لەدژی ئینگلیز .

ئەحمەدی کوڕی میر داودە. دووەمیان لەشێخ حەسەن کوڕی مەلیك خەلیکن. قەلأیەکی ناوداریان هەبووە بەناوی باپیرەیانەوە ناونراوە قـەلأی داود، ئـەم بـەرەباب و کوڕانـەی میر داود زیادیان کردووە و هۆزی داودیـی لێکەوتۆتـەوە، مـیر و سـەردارانی قـەلأی مـیر داود پێدەچێت خەڵکی (موکریان، مەهاباد، شنۆ) بن، لەکاتی کارەسـاتی قـەلأی دم دم کە بەسەر(خانی لەپ زێڕین)ی سەرۆك هۆزی جەلالیەکان هـات، ئـەم هـۆزە هـاتوون بـۆ پشتگیری جەلالیەکان(گەلاڵیەکان)، پاش ئەو شکسـتە بەسـەر قـەلأی دم دم دا هـاتووە ئەوانیش گەڕاونەتەوە بۆ شوێنی خۆیان، پاش ئەوەی ناوچەکەیان بەر شالأوی هێرش و پەلاماری سـەفەویەکان دەکـەوێت هەنـدێکیان هەڵـدێن و لەسـنوری ناوچـەی خورمـاتوو دەگیرسێنەوە و نازناوی داودیی لەخۆیان دەنێن. هەندێك لەمێژوونووسـان هـۆزی داودە دەبنەوە سەر هۆزی کەڵهوڕ، عەباس عەزاوی دەڵێت: داودێ یەکێکە لەهۆزەکانی عێـراق ئاوایەکانیان زۆرە و گروپەکانیان گەورەیە لەلیوای کەرکوك نیشـتەجێن، بەشـێکیان لـە دەروبەری داقوقن، بەشێکی دیکـەیان لـەدووزخورماتوون، ئـەم هـۆزە خەریکـە هاوتـای هۆزە ڕەسەنەکەی ئـەبێت مەبەسـت لێـی هـۆزی کـەڵهوڕە. دەڵێـت ئەمانـە پەیوەنـدیان ناپچڕێنن بەهۆزی کەڵهوڕەوە، بەلأم کەس نازانێت چۆن ئەم پەیوەندیە هەبووە، ڕەنگە کەسانێك هەبن ئەم ڕاستیە بزانن، ئەوەی زانراوە باپیرە گەورەیان (ئیسماعیل حەقی)ە ، (١٨٠ساڵ)پێش ئێستا کەئەو کات ساڵی(١٩٤٧) بووە لەڕۆژهەلأتی کوردسـتان لەگـەڵ هەشتا خێزان کۆچیا ن کـردووە بـۆ ناوچـەی داودە کەبـەهۆی شـەڕێکەوە بـووە لەگـەڵ هۆزی کەڵهوڕ، لەڕاستیدا ئەوەی کۆچـی کـردووە بۆناوچـەی داودە حـەقی بـەگ بـووە، حەقی بەگ باپیرە گەورەی ئاغاکـانی داودیـە نـەك هـەموو خـەڵك و دانیشـتوانی هـۆزی داودە کەزۆرینەی هۆزەکە پێك دەهێنن، کاتێك هاتووە بـۆ ئـەو ناوچـەیە چـۆڵ نـەبووە بەڵکو ئاوەدان بووە و خەڵکی تێدا ژیاوە، زۆرێك لەنوسەران کەوتنە هەڵەوە کەوا حـەقی بەگ بەباپیرە گەورە هۆزی داودە دائـەنێن ڕەنگـە ئەمـەش بـەهۆی دەسـت ڕۆیشـتووی ئاغاکانی داودێ بووبیّ[111]. مارك سایکس دەڵـی: داودە چـوار هـەزار خێـزانن، خێڵێکـی

---

[111] بورهان عادل: دەستنوس، کەلار، ٢٠١٩/١/٣١ .

جـەنگاوەری نیمچـە کۆچـەرین، لەکـەنارەکانی زێـی خـواروو نیشـتـەجێن، لەمەلەوانیـدا زۆرباشن[١١٢] . لەسەردەمانی پێشـوودا داودە لەسـەر رۆخـەکانی زێـی بچـوك نیشـتـەجێ بوون، سوارەی هەژاریان زۆر بووە، بەکشـتوکاڵ و ئاژەڵداری خـەریك بـوون، ژمارەیـان لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەنێوان(سێ هەزار و پێنج سەد بۆ چوارهەزار) خێزان مەزندەکراوە [١١٣]. هەندێك پێیان وایە ئەم هۆزە بنەچـەیان دەگەڕێتـەوە بۆسـەر هـۆزی کەڵهوڕ[١١٤] .

**ناوچەی داودێ**: ناوچەیەکی فراوانی گەرمیانە کە لەسنوری باکور و خۆرئـاوای شـاری (کفری)ەوە دەست پێدەکات و بەشـاری (خورمـاتوو)دا تێپـەڕ دەبێـت کـە بەمەڵبەنـدی (داودێ) دەناسرێ، لای خۆرئاوایشـدا بەقـەد زنجـیرە شـاخی حـەمرین درێـژ دەبێتـەوە تادەگاتــە چــەمی ڕۆخانــە لــەخوارووی داقــووق، لەڕۆژهەڵاتــەوە کەوتۆتــە نێــوان (قادرکەرەم، ناوچەی زەنگنە). ڕووبەری ئەم ناوچەیە بەنزیکەی سێ ملیۆن (کم دووجا) دادەنرێت زیاتر لەدوو ملیۆن ئەو ڕووبەرە شیاوە بۆ کشتوکاڵ کردن. داودێ لەسنورێکی جوگرافیای گەورە نیشتەجێن، بەگشتی داودە لەخۆرنەوەزان تاوەکو زەرگـە و حـەمرین نیشــتەجێن، پێشــتریش حەویجــە مــوڵکی داودە و سمایــل عــوزێری بــوو. بەشــێکیان لەباکوری داقوق تاکو ڕۆژهەڵاتی گل و خۆرئاوای کفری نیشتەجێ بـوون، هەندێکیشـیان لەدەوروبـەری ئاوەسـپی و نزیـك خورماتوودەژیـان، بایـەخ بەکشـتوکاڵ و مـەرو مـاڵات بەخێوکردنیان دەدا پیشەیان وەرزێری و ئاژەڵداری بوو گەنمی بەناوبانگیان هەبووە[١١٥] .

داودە بەپێی شوێنی نیشتەجێیان ئەکرێت بەدوو بەشەوە:

---

[١١٢] سایتی خەندان: مارك سایكس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،٢٠١٦/٥/١٦ .

[١١٣] خالد مەحمود کریم: س ،پ ،ل١١٤ .

[١١٤] مستەفا نەریمان: شۆڕیی براهیم خانی دەلۆ لەبنج و بناوان و لق و پۆپەوە، چ١ ،١٩٨٥ ،ل٩٥.

[١١٥] بورهان عادل: دەستنوس، کەلار، ٢٠١٩/١/٣١ .

داوەی کوردستانی دێهاتەکانی بریتین لە: (قەوالی، قەلا چەرمەلە، عەزیزقادر، توکن، عەلیان، چوارشاخ، پیرەمەوەنی)، کە کەوتوونەتە دیوی ڕۆژهەلاتی هەردەی مازووغەوە .

داوەی گەرمیان وەك: (سەنگەسەر، بەلەگەی بچوك، بەلەگەی سەروو، قوریچایی ئەوبەر، زەرگە، جەرەس، هەیەرە سور، ئۆمەر سۆفی، خۆرنەوەزان، لتفی ئاغا، قەرەتامورر، قورپیچای نەهرەوان، گۆمەتە بۆر، شیخەمەوەندی، دووڕاجی، زینانەی گەورە، زینانەی بچووك، زەندبن عێز، چەوری، وارانی سەروو، وارانی خواروو، سالەیی مەحمودبەگ، تازەدێ، سەرشۆراو، قەلای مەتحەد، پەلکانەی سەیدەکان، پەلکانەی عەزیز ڕەشید، پەلکانەی سالم، گەرمك،جوامێر ئاغا، لەك، ئاوایی تۆفیق، دێی سەرخۆش، عەرەب ئاغا، باشتەپە، دێی چەچان، دێی نامیق، دێی ڕەزا، نەوجوول، قوشیلان، قەلخانلووی سەروو، میل ناسر، غەرە، ڕەحیم وەرقە، قەیتوون،تەپەسەوز ، شێخەوازی، گۆمەیی، تالاو، خدروەلی، کولی تەپە، سەنگور، قوم پەلك، دارابەگ، مەنسوربەگ، فەریق بەگ، شەشەکان،سماقە، عەلی ئاغا، ئەلبونەجم، ئەلبوسەراج، تبەبەسل،شلخە، قرەتامور، خشمە، جنگلاوە، پارەپارە، شا سەیوان،ئەلبوسەباح) [١١٦]. تێکڕای گوندەکانی هۆزی داوەدە هەشتا و چوار گوندن. لەناوچەی داوەدە جگە لەهۆزی داوەدە هەندێك هۆزی تریش لەوناوچەیە هەن وەك زەنگنە، شێخانی، بەرزنجی، سالەیی، لەك .

**هۆزی داوەدە سەرجەمیان لەبیست و یەك تیرەیەك پێکهاتوون وەك**: نەوجولی، زەینالی، چەوری، وارانی، تالاوی، قەوالی، وەسایەلی، کەرەمەونی، شێخەمەوەنی، پیرەمەوەنی، کەچەلەمەوەنی، بارنەوەری، موسایی، دیلانی، عەرەب ئاغای، لەك ناو داوێ بەموری زەمەن بوونەتە تیرەیەك لەداوێ، کاوڕەلەڕە، گەلەگوری، ئۆمەر سۆفی، سۆفی ڕەزایی، ئاغاکان، وەنداوی، هەیەرە سوری .

---

[١١٦] مصفی نەریمان: س ، پ ،ل٩٥ .

داوده لەموسڵ پێنج گوندیان هەیە وەك گوندی (باجربوغ، باریمە، فازیلیە، عمرقبجی، کانونە) بەمروری زەمەن کەوتوونەتە ئەو ناوچەیە، لەتیرەی بارنەوەری و عەرەب ئاغان، براگەورەیان محەمەد سەلیم داودە. لەناوچەی بادینان داودێ لەسێ گوند نیشتەجێن بەناوەکانی (هەنجیرۆك، تاق حەمە، جرفقیر) براگەورەیان عیسا عەزیز ئەحمەدە. بەشێکی تر لەهۆزی داودە لەهەولێر نیشتەجێن، هەروەها لەقەزای خانەقین لەگوندی شێرك بەشێکی زۆری دانیشتوانەکەی لەهۆزی داودەن لەتیرەی چەورین، هەروەها لەدەوربەری ناحیەی (قەرەتەپە) ژمارەیەك ماڵی داودە بوونی هەیە براگەورەیان ڕەمەزان عیسا ئاغایە لەتیرەی زەینالین، لەشاری جەلەولایش ژمارەیەکی زۆر داودی هەیە زۆربەیان لەتیرەی سۆفی ڕەزان، هەروەها لەگوندی خراپە و پوشێنی سەربەپارێزگای سلێمانی زۆربەی دانیشتوانەکەی داودەن و لەتیرەی (قەوالێن)، هەروەها لەڕۆژهەڵاتی کوردستانیش داودە بونیان هەیە بەتایبەتی شاری دیواندەرە براگەورەیان (سەلیم بەگە)[١١٧]. لەڕووی ئاینەوە داودە هەموویان موسڵمانن و سەربە مەزهەبی سونی شافیعین و بەزاراوەی کرمانجی خواروو قسە دەکەنە هۆزی داودە لەئێستادا لەسەر لێواری زێی بچوك دا نیشتەجێن، لەخواری رووباری (رۆخانە) لەنزیکی ناحیەی قادرکەرەم و دوزخورماتوو لەرۆژئاوایی قەزایی کفری و ئەو دەشتانەی درێژ ئەبێتەوە بۆ نزیك چیاکانی حەمرین[١١٨] .

**هەندێك لەکەسایەتیە دیارەکانیان**: خورشید عەلی محەمەد داودی ناسراوە بەخورشید ئەفەندی لەساڵی ١٩٠٠ زاینی هاتۆتە دونیاوە، لەساڵانی ١٩١٩–١٩٢٠ یەکەم قوتابخانە لەشاری دوزخورماتوو دەکرێتەوە و وەك یەکەم مامۆستا لەشاری خۆرماتوو دادەمەزرێت بەموچەی سێ دینار، دووساڵ مودیرناحیەی قورەتوو بووە، پاشان لەئەتروش و شێخان کراوە بەمودیر ناحیە، پاشان دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ سیلکی

---

[١١٧] کاروخ عوسمان داودی: دەستنوس، گردەگۆزینە، ٢٠١٩/١/٣١ .

[١١٨] هاشم عاسی کاکەیی: کوردو چەند بابەتێکی مێژوویی، چاپخانەی ئارابخا–کەرکوك ،چ١ ،٢٠٠٦ ، ل٢٥ .

پــەروەردە و لەسەردەسـتی سـەدان قوتـابی پێگەیشـتن بـوون بەسـەرەتایەکی گرنگـی پــەروەردەیی لــەخورماتوو، خورشـید ئەفەنـدی لەسـاڵی ١٩٥٥ کۆچـی دوای دەکـات، خاوەنی چـوار کوڕبـووە بـەناوەکانی چـیرۆك نـوس و ڕۆمـان نوسـی گـەورەی کـورد د. زوهدی داودی، عەباس ئەفەندی، د.بارام، د.سیروان

**ڕەفعەت سمایل بەگی داودە** سەرۆکایەتی شۆڕشـی ١٩٢٠ی کـردووە لەشـاری دووز خورمـاتوو، بەهاوپـەیمانی لەگـەڵ هۆزەکـانی تـری ناوچـەکە لـە٢٠/ئـابی/١٩٢٠ هێـرش دەکەنە سەر دووزخورمـاتوو و لەماوەیـەکی کورتـدا شـارەکە کۆنترۆڵ دەکـەن و ئـاڵای بــەریتانیا دەهێننــەخوارەوە، دوای ئــەوەی شــارەکە دەکەوێتــە دەســت جــەماوەری ڕاپەڕیو،هەڵدەسـتن بەدورسـتکردنی ئیداریـەکی خـۆجێی بـۆ بـەڕێوەبردنی ئیـدارەی شارەکە بە سـەرۆکایەتی ڕەفعـەت بـەگ، ئـەم شۆڕشـەی شـاری دووزخورمـاتوو هیچـی کەمتر نیە لەشۆڕشەکەی براهیم خان دەلۆ، ڕەفعەت بەگ لەسـاڵی ١٨٨٩زایـنی هاتۆتـە دونیاوە، سوارچاکێکی باش بووە و خاوەنی زەوی و زارێکی زۆر بوو، خاوەن دەسەڵات و هێزێکی زۆر بووە لەناو هۆزەکەی،سێ ژنی هێناوە پێنج کوڕ و یـازدە کچـی هـەبووە، لەساڵی ١٩٦١ کۆچی دوای کردووە .

**دارا بەگ کوڕی محەمەد باقر کوڕی ئیسماعیل کوری محەمەد کوڕی حەقی بەگە**: لەساڵی ١٨٩١ هاتۆتە دونیاوە، سەرۆك هـۆزی داودە بـوو، بـرا گـەورەی ڕەفعـەت بـەگ بووە کەسەرکردەی شۆڕشی سـاڵی ١٩٢٠ بـووە لەشـاری دوزخورمـاتوو، کەسـایەتیەکی ناودار بوو لەساڵی ١٩٢٤ ئەنـدامی ئەنجومـەنی دامـەزراوەی عێـراق بـووە، نوێنەرایـەتی کوردی لیوای کەرکوکی کردووە لەپەرلەمانی عێراق لـەخولی شەشـەم، نویـەم، دەیـەم، یازدەهەم، لەساڵی ١٩٥٦ کۆچی دوای کردووە .

**حەسەن ئەحمەد شەریف ڕەزا ناسراوە بەحەسەن چـەتە**: نازنـاوی چـەتە شـێخ مـەحمود داوێـتی پـاڵی بـەهۆی ئـەوەی لەشــەڕێکدا نەبردیـەکی بـێ وێنـە ئـەنوێنێ، هەڵدەکوتێتە سەر سەنگەری دوژمـن و هـەموو ئەسـکەر و چـەکەکانیان بـەدیل ئـەگرێ، ووشـەی چـەتە لەسـەردەمی شـەڕ و شـۆڕش و شـێخ مـەحمود بـەواتای پێشـمەرگە و گیانفیدایی هاتووە بۆئەو قۆناغە، حەسـەن لەسـاڵی ١٩١٢ لەگونـدی سـۆفی ڕەزا لـەدایك

بووە، قارەمانێکی شەڕی ئاوباریك و ناودارێکی شاری خورماتوو و هۆزی داودەیە، جارێك شێخ لەتیف کوڕی شێخ مەحمودی حەفید لەسەلمان پاك لەزیندان دەبێت حەسەن چەتە بەشێخ دەڵێت ئەگەر جەنابی شێخ ڕازی بێت شێخ لەتیف ئازاد دەکەم، ئەویش زۆری پێیخۆش دەبێت بۆیە لەسەر وەعد و قەولی خۆی بەرەو ئەو شارە ئەکەوێتە ڕێ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك چاودێری زیندانەکە دەکات، شەوێك هەڵدەکوتێتە سەر زیندانەکە و پاسەوانەکان دەست بەسەر دەکات و شێخ لەتیف ئازاد دەکات بەپێ دێ بەدێ و ناوچە بەناوچەدەگەڕێنەوە بۆ لای شێخ، کاتێك شێخ ئەمە دەبینێت زۆر سەرسام دەبێت دەڵێت بیست و پێنج گوند مولکی منە کامیان هەڵدەبژێریت بۆ خۆت،ئەویش دەڵێت جەنابی شێخ من بۆ ماڵ و موڵکی دونیا ئەو کارەم نەکردووە، دواتر شێخ گولەبەنیکی پێدەدات، پێشمەرگەی کۆماری کوردسانی بووە، هەروەها بەشداری شۆڕشی ئەیلولی کردووە، سێ جار پاداشتکراوە جارێکیان لەلایەن مەلا مستەفاوە بەدە دینار پاداشتکراوە، لە١٩٨٠/٣/٧ بەهەڵە لەلایەن مەفرەزیەکی پێشمەرگە شەهید ئەکرێ کە بۆسەیان دانابوو بۆدوژمن لەڕێگای قوڕیچای، پاشان مام جەلال نوێنەری تایبەتی خۆی دەنێری بۆ ماڵیان و داوای لێبوردنیان لێ دەکات[119] .








لای ڕاست ڕەفعەت سمایل بەگی داودە– دارا بەگ کوڕی محەمەد باقر و مستەفا عەبدولا ئاغای داودە و دانیشتووەکە شێخ مەحمودی حەفید

حەسەن ئەحمەد شەریف(حەسەن چەتە)

---

[119] بورهان عادل: دەستنوس، کەلار، ٢٠١٩/١/٣١ .

## هۆزی سالْحی :

هۆزێکی کوردن لەکەرکوك لەبەرزایەکانی قەرەحەسەن و بناری گل نیشتەجێ بوون، سەرۆکیان (عەبدولوەهاب) بوو، محەمەد ئاغا و سالْح ئاغا وەك جێگرانی سەرۆك هۆز دەوریان هەبوو، سەرۆك هۆزەکانیان لەکەرکوك دەژیان. مەیجەرسۆن دەڵێت سەد ساڵ لەمەوپێش کە ئەوکات ئەو قسەیە دەکات ساڵی (١٩١٧) بووە، هەندێکیان پەڕیونەتەوە بۆ دیمەشق لەگەڕەکێك بەناوی سالْحیە نیشتەجێ بوون، سەرۆکی سالْحیەکانی دیمەشق (عەبدولڕەحمان پاشا سالْحی)ە بوو، لەبنچینەدا هۆزەکە بەشێك بووە لەتایفەی دەروێشەکانی نەقشبەندی، وا پێ دەچێ لە بنەڕەتدا خەڵکی هەرێمی کەرکوك بن، بەدیالێکتی کرمانجی خواروو قسە دەکەن[١٢٠] .

## هۆزی دەلۆ :

پیاوە بەتەمەنەکانی ئەم هۆزە دەڵێن هۆزی دەلۆ لەبەرەبابی دە شۆڕەسواری ناوچەی بڵباسن. هەرچەند تاکو ئێستا ئەم زانیاریە پشت ڕاست نەکراوەتەوە.

ئەم دە برایە لەنێوان سنووری هەردوو میرنشینی بابان و ئەردەڵان نیشتەجێببوون، دەست بزێو بوون و مەترسیان خستبووە سەر سنوری هەردەوڵەتی (عوسمانی، قاجاری) جارێکیان کۆمەڵی دزو ڕێگر کاروانێك ڕووت دەکەنەوە، ئەم دە برایە دەچنە سەر جەردەکان کەلوپەلی دزراوی کاروانەکە دەگێڕنەوە بۆ کاروان چیەکان، ئەم هەواڵە دەگاتە (ئەوڕەحمان پاشا)ی میری بابان، ئەویش هەر دە براکەی بەخۆیان و خێزان و کەس وکاریانەوە دەهێنێتە بناری شاخی ئاچداخ و هەرێمی (جام ڕێز)یان

---

[١٢٠] مێجەرئی .بی . سۆن : چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و نەجاتی عەبدوڵڵا ،چ١ ،چاپخانەی شڤان– سلێمانی، ٢٠٠٧ ،ل٧٨ .

پێدەبەخشێت لەناوچەی سەنگاو موڵك و زەوی و زاری ئەوناوەیان پێ دەبەخشێت . ئیتر بەناوی هۆزی دەلۆ پەرە دەسەنن و وەچەیان زیاد دەکات و بە ناوی دەلۆ ناسراون [121]. جامڕێز لەنێوان چیاکانی (ئاجداغ و بەرکەچ) دایە لەڕۆژئاوای زنجیرە چیای قەرەداغی ناوچەی سەنگاو پاش ماوەیەك نەوەکانی ئەم دەبرایە گوندەکانی (بەرگەچ، مەسۆی، عەینکە، کارێزە، ترشاوە، باجگە، پێنج ئەنگوست و حەسەن کەنۆش و کۆیك ...هتد) ئاوەدان دەکەنەوە[122] . پێش هاتنیان بۆ ناوچەی کفری فرەیزەری گەڕیدە لەساڵی ١٨٣٤ دا لەسلێمانیەوە لەسەگرمەوە بەرەو کفری دەچێت لەگوندی جامڕێزی بناری ئاچداغ چاوی بەدەلۆکان کەوتووە[3]. وا دیارە تاکو ئەو مێژووە هەر لەبناری ئاچداخ ماونەتەوە.

هۆزێکی جەنگاوەرن و سەرلەبەر سوونەی شافعین، وێڕای ئەوەی کە ئێستاش هەر بە نیشتەجێ ماونەتەوە، بەشەکەی لای کفری بەسەر ڕاستی ناسراون و هیچ ئامادەی ڕاو ڕووت نین . هۆزەکە ساڵی (١٨٤٠) لەلایەن (محەمەدبەگی بابان) لەسەرقەڵا نزیك کفری نیشتە جێ کرد، مێژووی دواتر هۆزەکە بریتیە لەزنجیرەیەك یاخی بوونی بەردەوام و زۆربەی جاریش هاوبەشی (هەمەوەندیەکان) بوون، کە خزمایەتیەکی بنەوانی هاوبەشیان هەیە (خورشید بەگ، محەمەدبەگ) هەمیشە لەدەوڵەت یاخی بوون، تا دواجار هەردووکیان لەلایەن ویلایەت یەك لەدوای یەك بۆ کانی ماسی و کانی بز بۆپاراستنی سنوری دژبە (سنجاویەکان) بەکار هێنران کە بەشارەزایی و کارامەییێکی بەرچاو کارەکانیان ڕاپەڕاند[123] . پێکهاتەی ناوخۆی هۆزەکە لە (١٠) لق ( تیرە) پێکهاتوون (سەلیم وەیسی، عبدولرحمان بەگی ، خوبیاروەندی، گەچی، جامڕیزی، تەلکەوەندی، پێنج ئەنگوستی، ئالی نەزەری، تایشەیی ، چەرمەوەیی) لەهەندێك

---

[121] سالح هەلاج : چەردەیەکی مێژووی دەڤەری گەرمیان ، چ١ ، ٢٠١١ ،ل١٤٧–١٤٨ .

[122] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : س ، پ ،ل١٨٤ .

[3] جيمس بيلي فريزر ، م . س ، ص ٥١.

[123] مێجەر ئی . بی .سۆن : س ، پ ،ل ٤٥–٤٦ .

سەرچاوە باس لەهەردوو (کارێزی ، کاش)کراوە، ژمارەیان بەپێ خەملاندنەکانی زەکی بەگ لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا نزیکەی شەش سەد بنەماڵەن بوونە، لە(پارێزگای کەرکوك، خانەقین، ناوچەکانی کفری، سەرقەلا) نیشتەجێن [١٢٤].دەکرێ بڵێین ئەم هۆزە لەسەرەتاوە لەقەڵەمڕەوی میرنشینی ئەردەلان لەرۆژهەلاتی کوردستان دا ژیاون، پاشتر هاتوونەتە باشوری کوردستان، بەشێکیان روویان کردووەتە ناوچەکانی بناری ئاچداغ بەشێکی تریان لەسەروی شەقلاوە نیشتەجێ بوون، پاشتر ئەم بەشەیان رووی کردۆتە باکوری کوردستان و هەندێك لەوانە گەڕاوانەتەوە ناوچەی بەرواری دوو گوندیان بەناوی (بێدۆهی، مایی) یان ئاوەدان کردۆتەوە کە ئێستا لەو ناوچەیە دەژین و ژمارەی ئەو بەشەیان دەگاتە دە هەزار کەس[١٢٥] .

سنوری جوگرافیای هۆزی دەلۆ :

لەباکوری ڕژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا دەوری (کفری) یان گرت بوو، لەباکوری ڕۆژهەلاتی کفری ئەم گوندانەیان (سەرقەلا، سەیدجەژنی، هەیەرەکەل(ابراهیم خان)، وەلی هەیەر) یان ئاوەدان کردووبووەوە ، پاشتریش گوندی هەوارەبەرزیان لەناو جاف ئاوەدان کردووەتەوە، لەرۆژئاوایشەوە گوندەکانی (کارێز، تەپەچەرموو، باوەمەحمو، عەین شکور، عەین فارس، فەککە، کنگربان، گلابات)یان ئاوەدان کردبووەوە .

ژمارەیەك گوندیان لەزەویەکانی(خانەقین)دا ئاوەدانکردۆتەوە،لەگوندەکانی (کانی بز، کانی ماسی، نەوتخانە، پیکە، عەین هیلال، محەمەد خدر)یان ئاوەدانکردووەتەوە .

گروپێکیان لەگوندی خاسەی شوان دان لەم ناوچەیە بەدەلۆی سەرخاسە بەناوبانگن. بەشێکی هۆزی دەلۆ کەوتونەتە ناوچەی بەرواری بالاوە لەسنوری پارێزگای دهۆك هەردوو گوندی (بیدۆهی و مایی)یان ئاوەدان کردووەتەوە، ئەم هۆزە هەرچەندە بەشی سەرەکیان لەسنوری قەزای کفری و خانەقیندا نیشتەجێن، بەلام بەهۆی جەنگەوە

---

[١٢٤] محەمەدئەمین زەکی بەگ :س، پ ،ل٢٥٠، هەروەها بڕوانە حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : س ،پ ، ل١٨٥

[١٢٥] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : س، پ ،ل١٨٦ .

تـاوکو ڕادەیـەك پەرتـەوازەن و لەناوچـەجیاجیاکانی کوردسـتان دەژیـن و لەزۆربـەی ناوچـەکانی باشـووری کوردسـتاندا هـەن[١٢٦] . هـەروەها بەشـێکیان لەرۆژهـەڵاتی کوردستانی لەگوندەکانی بەڵەسن و ئنجێنەی گەورە و ئنجێەی مەلا ساڵەح و شاری بانە نیشتەجێ بـوون. مێـژووی بـەرخودانی ئـەم هـۆزە بەزنجیرەیـەك یـاخیبوون و شۆڕشـدا تێدەپـەڕێت دژ بـە دەسـەڵاتی سـتەمکاران بۆیـە لەسـاڵی ١٨٩٥ لەناوچـەی کفـری (کەمـەرخانی دەلـۆ) [٤] . راپـەڕینێکی دژ بـەئاکار و رەفتـاری نـاڕەوای کاربەدەسـتانی عوسمانی بەرپاکرد و ژیان و گوزەرانی لێ تـاڵ کـردن بەشـێوەیەك هەراسـانی کردبـوون ناچاربوون هێزی زیاتر لەناوچەکانی دیکەوە بۆ خامۆشکردنەوەی ئـەو راپەڕینـە بهێننـە کفـری، لەئەنجامـدا چـەندین شـەڕی خوێنـاوی لـەنێوان هێزەکـانی عوسمـانی و هێـزی کەمەرخان روویدا[٥] . کەمەرخانی دەلۆ چەند ساڵێك دژی ستەمکاری عوسمـانی چـەکی هەڵگرت و هەر لەو پێناوەدا سەری دانا [٦] عوسمانییەکان بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشە و گرفتانەی کە لەناوچەکەدا بۆیان دروست ببوو ناچاربوون (حوسێن ئاغای هەمەوەنـد) وەك سەرۆك ژاندارمێك بنێرنە ناوچەکە چونکە کەسێکی چاونەترس و ئـازا بـوو، بـەڵام ئەم ئازایەتیەی خۆی بەسەر میلەتەکەی خۆیدا دەنواند، قسەی حوسێن ئاغا یاسا بـوو، هەموو ڕۆژێك باجێکی نوێی دادەهێنا وەك باجی (سەرانە) (مـەڕوماڵات) و بـاجی (زەوی و زار) و (ئـالیکی هێسـتر) ، ئـیتر ژمـارەی ئـەو یاسـایانە ئەوەنـدە زۆر ببـوو لـەژماردن نەدەهاتن[١] .

---

[٤] کەمەر خان کوڕی ساڵح خـانی دەلۆیـە و براگـەورەی بـرایم خـانی دەلۆیـە ، لەگونـدی هەیەرەکـەل لـە دایك بووە لەساڵی ١٨٩٥ز بەدەستی عوسمانییەکان شەهید کراوە.

[٥]مستەفا نـەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلـۆ ١٩٢٠، ل٨٣ .هـەروەها بڕوانـە : ئـازاد مـام وەلی ، س . پ ، ل١١.

[٦] سەباح ئارام ، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ و خوێندنەوەیەکی نوێ ، س . پ ، ل ٨٣ .

[١] د. موکەڕەم تاڵەبانی ، کەمەرخان رۆڵەی ئازای کورد ، س . پ ، ل ٣٤-٣٥ .

هەرچۆنێك حوسێن ئاغا " کەمەر خانی بەنەشتەری بیناقاقای خۆی دەزانی، بەڵام کەمەرخان پەیتا پەیتا هەموو کاتێك هەڕەشەی دەگەیشتە حوسێن ئاغا، بۆیە هەمیشە بەدوای دەرفەت و هەلدا دەگەڕا تاکو ئێوارەیەك کە خۆر لەزەردە و دنیا کشومات بوو، لەو کاتەدا کەسەپان و شوان و گاوان دەگەڕێنەوە بەرەو ماڵ، زەڵە دەکەوێتە ناودێ ، لەهەموو رچە رێیەکاندا تەپوتۆز هەڵدەستا. بەڵام ئەو رۆژە لەرێگای سەرقڵا و کفریدا تەپو تۆزێکی گەورە هەڵسابوو، کەژاندرمەکانی حوسێن ئاغا وەکو (داڵ سەیری ژێری باڵی خۆیان کرد بوو) و نێچیریان دۆزیبووەوە، چونکە لەقەمە تاوێرەکانی رێی سەرقڵا، کەمەرخان و هاوکارانی خۆیان داگرتبوو، هێستر سوارەکانی ژاندارمەکان بە گورگە لۆقە بەقات قاتەکاندا هەڵدەزانان، دوای رەوە لەدۆڵەکان وون دەبوون، بەڵام دیار بوو لەگۆبەن نزیکتر دەبوونەوە، لەماوەی چاو تروکانێکدا شریقەی (جهاندار) دەیدا بە کشوماتیەی ئەو بەرد و تاوێرە بێدەنگە و هەموو شریقەیەك سەد دەنگی لێ دەبووەوە شەڕ و پێکدادان لەنێوانیاندا روویدا[٢]. راپەڕینەکەی (کەمەرخانی دەلۆ) لەسەردەمی عوسمانییەکان پەرەی سەند دەوڵەتی عوسمانی فەرمانی بە حوسێن ئاغای هەمەوەند و چەتەکانی کرد بۆ هێرشکردنە سەریان دوای زەبرو زەنگێکی خوێناوی کەمەر خان و حوسێن خانی برای کوژران، دوای ئەوە چەوسێنەرانە ویستیان لاشەکانیان لەناوشاردا ڕابکێشن بەڵام خەڵکەکە بەرەنگارییان بوونەوە، (نەنەخان)ی دایکیان بێ ئەوەی فرمێسك برێژێ نوێژی مردووی بەسەرا خوێندن، تەرمەکانیانی برد بەرانبەر ئاوایی هەیەرەکەل (برایم خان) لەسەر تەپۆڵکەیەك بەخاکی سپاردن[٣]، بەپێی زانیاری لەو شەڕەدا کەمەرخان و (١١) جەنگاوەری بەدەستی عوسمانییەکان کوژران[٤].

---

[٢] هـ . س ، ل ٣٤- ٣٥ .

[٣] مستەفا نەریمان ، بۆ برایم یوسف بەبان قایمقامەکەی کفری کوشت؟، رەنگین (گۆڤار)، ژ(٥٢) ،١٩٩٣، ل ١٤- ١٥.

[٤] چاوپێکەتنی دکتۆر حوسێن ئیسماعیل خانی دەلۆ لەگەڵ د.موکەرەم تاڵەبانی ، لەدایك بووی ١٩٢٣ کفری ، لە رۆژی ٢ / ١ /٢٠٠٩.

لەکاتی داگیرکاری بەریتانیادا چەندین یاداشت پێشکەشکراوە بۆ دروستکردنی دەوڵەتی کوردی کە کۆمەڵێك کەسایەتی و سەرۆك هۆزی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان واژۆیان لەسەر ئەو یاداشتانە کردووە برایم خانی دەلۆ و ساڵەح خانی باوکی دوو کەس بوونە لەو شەست و دوو کەسەی ئەو یاداشتەیان واژۆ کردووە .

برایم خانی دەلۆ بەهاوکاری پیاوانی هۆزەکەی و هۆزەکانی تری ناوچەکە بە تایبەت تیرەی رۆغزای و تەرخانی لەهۆزی جاف و هەروەها هۆزی گەلاڵی کەدەوری سەرەکی هەبووە لەشۆڕشی برایم خان دەلۆ، خاڵخاس خانم خوشکی براهیم خان خێزانی بەور ئاغای گەلاڵی بووە، هەر ئەمەش وادەکات دەوری زیاتر لەشۆڕشەکە ببینن، هەروەها بە هاوکاری هۆزەکانی تری ناوچەکە لەساڵی ١٩٢٠ شۆڕشێکی لەناوچەکە بەرپا کرد توانی شاری کفری و دەوروبەری لەژێر دەسەڵاتی ئینگلزەکان ئازاد بکات، جێگری حاکمی سیاسی شاری کفری بەدیل بگرێ، حکومەتێکی کاتی و ئەنجومەنێك بۆ بەڕێوەبردنی شار دابمەزرێنێ، داوای ئازادکردنی شێخ مەحمودی حەفید بکات .

هاوکات خورشید بەگی دەلۆ لەخانەقین بە هاوکاری کەریم خەسرو بەگی دەلۆ بۆ ماوەیەکی کەم توانیان شاری خانەقین لەدەسەڵاتی ئینگلزەکان ئازاد بکەن .

ئەم هۆزە لەکاروانی بزافی رزگاریخوازی کوریدیدا هەمیشە لەریزی پێشەوە قوربانیدان و کۆڵنەداندا بوونە[١٢٧].




فەتحولا بەگی دەلۆ – براهیم خانی دەلۆ – ئیسماعیل خان و فازڵ بەرواری – د.حوسێن ئیسماعیل

---

[١٢٧] دەستنوسی حوسێن ئیسماعیل خان دەلۆ: هەولێر، ٢٠١٨/٩/٢٣ .

## هۆزی گیژ یا گێژ :

هۆزێکی کۆنی کوردە، لەهۆزە کوردیە نیشتەجێکانە، بەپێی گێڕانەوەی گێژەکان خۆیان لەسەردەمێکی کۆنەوە بەسەرۆکایەتی (مامەسەن یان سەنەخان) لەناوچەی دیاربەکری باکوری کوردستانەوە هاتوونەتە ناوچەی شارەزوور، بەهۆی باج و سەرانەی دەسەلاَت دارانەوە لەحکومڕانی ئەو سەردەمە یاخی دەبن، ئەمەش وادەکات دەسەلاَت دارانی ناوچەکە هانی هۆزەکانی تر بدەن دژ بە هۆزی گێژ، ئیتر ناچار دەبن بلاَوەی لێبکەن. بەشێکیان بەسەرۆکایەتی (خالد ئاغا) کۆچ دەکەن بەرەو ناوچەی چیای مەقلوب، لەوێدا دەگیرسێنەوە لەنزیکەی (١٠٠) گوند لەکۆمەڵگەی بەردەڕش و دەوروبەری، لەشەنگال تیرەیەکیان هەیە بە ناوی (چیلەیی) نزیکەی (١٠٠) ماڵ دەبن .

بەشێکی تریان بەرەو ناوچەی گەرمیان کۆچ دەکەن و لەگوندەکانی (کەلاری کۆن، گۆبان، سەرقەلاّ و دەوروبەری) نیشتەجێ دەبن. بەشێك لەم هۆزە لەمێژەوە لەناوچەی بادینانن لەقەزای ئاکرێن، لەناو گۆران (عشائیر ئەلسبعەن) لەسەد گوندی ناوچەکە بوونیان هەیە [١٢٨]. ناوی ئەم هۆزە بۆ یەکەم جار لەشەرەفنامەدا هاتووە بە (کج) هۆزی گێژ خۆیان دەبەنەوە سەر ئەو هۆزە، لەباکوری رۆژهەلاّتی کفری وشێروانە (کەلار) ،سەید خەلیل) نیشتە جێ بووبوون، بەلاّم دواتر بەهۆی شەپۆلی کۆچڕەوی



هۆزی جاف و فشاری هۆزی جاف لەوێ هەلّکەنران و کشاونەتەوە تا گیشتوونەتە سەر ڕوباری (نارێن)ی ناوچەی قەرەتەپە، ئەو ناوچەیەیان ئاوەدان کردۆتەوە و لەچەند گوندێك نیشتەجێ بوون، ئەمانە جاران سەرۆکیان (سەعدوللاّ بەگ، کۆێخا بەهرام) بووە، هەردوو سەرۆکی هۆزەکە پێکەوە لەسەرقەلاّ دەژیان، گێژەکان بەکشتوکالّەوە خەریکن[١٢٩]. پێشووتر دێی کەلار لەلایەن عەباس جەلیل **موراد بەگ** و کوڕەکانیەوە دامەزراوە. لەسەروبەندی جەنگی یەکەمی جیهانی سەرۆکی هۆزی گێژ لەگەرمیان (موراد بەگ) بووە، موراد بەگ کوڕی موبارەك بەگە، لەسالّی ١٨٧٤ هاتۆتە دونیاوە، لەسالّی ١٩٥٣کۆچی دوای کردووە، لەشاری کفری پەروەردە بووە، یەکێك بووە لەو ئەفسەرانەی لەئەستانەوە هاتنەوە بۆ عێراق، لەگەلّ (نوری سەعید، جەعفەر عەسکەری)دا لەو سەردەمەدا دانرا بەسەرۆکی شابانەی کەرکوك، کەدواجار ناوی نرا پۆلیس، پاشان گواسترایەوە و کرا بە بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی، لەشەڕی بەردەرکی سەرا چەکی قەدەکردبوو لەپۆلیسەکان بۆ سەرکوت کردنی خەلّکی سڤیل بەو هۆیەوە چەندین پۆلیس کوژران دواتر لێپرسینەوەی لەگەلّ کرا. پاشتر بووبە قایمامی هەلّبجە. کەسایەتیەکی دەمڕاستی ناوچەکە بووە، کەسێك بوو لەدامەزرێنەرانی حکومەتی عێراق لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی ڕۆلّی هەبووە، (مستەفا نەریمان)

---

[١٢٨] کاروان عوسمان عەلی: ئاورێك لەهۆزی گێژ لە دیادنامەی حاجی خەلیل گێژ، چ١، ٢٠١٠ ،ل١١– ١٤

[١٢٩] مێجەرئی . بی . سۆن: س ، پ ، ل٥ .

لەکتێبەکەیدا ئاماژەی پێی داوە[130] . سەبارەت بەبنەچەی ناوی هۆزی گێژ لێکدانەوەی زۆر دەکرێ وەك: گێـژەکان خۆیـان پێیـان وایـە، قەڵایـەکیان پـێ دەسـپێرن تـاوەکو پاسەوانی بکەن، وتوویانە بەدەوری ئەم قەڵایـە گێـژ بخـۆن واتـە (سـوور بخـۆن) لـەوە ناویان بەگێژ هاتووە. یان هەندێك پێیان وایـە بـەهۆی کارەسـاتێکەوە کەوتوونەتـە نـاو گێژاوێکـەوە، زیـانی زۆریـان بەرکـەوتووبێ، پاشـان بـەپاشماوەکانیان وترابێـت گێـژاو، پاشان ناویان بەگێژ دەرکردبێ .بۆچوونی تریش هەیە دەڵێن لەناوچەیەك ژیانە بەناوی گێژاو، لەهەنێك جێگاش پێیان دەوترێت گێش[131] . هـۆزی گێـژ نـەوەکانی ئـەو کاژانـەن کەلەشـەرەف نامـەدا ناویـان هـاتووە، لەسـەر ڕووبـاری (نـارین)ی ناوچـەی قەرەتەپـە گیرسانەوە[132]. لەسەردەمانی پێشوودا نزیکەی سێ سەد مـاڵ بوونـە دووسـەد ئەسـپی ڕەسەنی چاکیان بووە، لەگوندەکانی (سەیدەلان، ئاسکی کفری، چنچاڵ، نارین، ئـاوای حاجی حەسەن، چەتاڵ، وەلی هەیەر، سەی جەژنی، ناحیەی سەرقەڵا هتد...) ژیـاون و ئێسـتا مـاڵی گێـژ لـەو ناوچـانە بوونیـان هەیـە. هـۆزێکی نیشـتەجێ ئاشـتی خـوازن، وابەستەی (جـەمیل بـەگی بابـان)ی کفـری بـوون، سـوونی مەزهـەبن، بەشـێوە زارێکـی تایبـەت بـەخۆیان بـەدیالێکتی کرمـانجی خـوارووقسـەدەکەن، ماوەیـەکیش (خورشـید محەمەد مسـتەفا) سـەرۆکیان بـووە لەگونـدی (یـالفور الغـاج)[133]. هـەروەها (ئیـبراهیم حەمەخان و کوێخا جاسم) ناویان وەك سەرۆك هۆزی گێـژ هـاتووە[134]. لەئێسـتادا ئـەم هـۆزە بەشـێوەیەکی بـڵاو لەناوچـەکانی کوردسـتان و وڵاتـانی تریشـدا بوونیـان هەیـە، کەسـانی چـالاك و ناودارێـان تێیـادا هەڵکـەوتووە لـەبوارە جیاجاکـانی ژیـان خزمـەتی مرۆڤایـەتی و نیشـتمان دەکـەن، لەگـەرمیان زۆریـان لەناحیـەی ڕزگـاری نیشـتەجێن،

130 گفتوگۆی نوسەر لەگەل م برهان حەمەفرەج: کەلار، ٢٠١٨/١١/٢٩ .

131 کاروان عوسمان عەلی: ئاوڕێك لە هۆزی گێژ لەدیادنامەی حاجی خەلیل گێژ ، چ١ ، ٢٠١٠ ، ل١٠

132 العشائیر الکردیه: فؤاد حمەخورشید ،گ١ ،بغداد ، ١٩٧٩ ،ل٦٠-٦١ .

133 عاسی کاکەیی ، س ، پ ، ل٢٨

134 سەید هاشم ئەحمەد سەید محەمەد: یاداشتەکانم لە کفریـدا لـەنێوان سـاڵانی (١٩٤٠-١٩٦٠)، چ١ ، ٢٠٠١ ،ل٤١ .

سەرۆکیان (عادل حاجی جاسم)ە لەناحیەی ڕزگاری [١٣٥]. لەناوچەی کفری لەگەڵ هۆزەکانی ناوچەکە تێکەڵاویان هەیەو لەچەند گوندێکدا نیشتەجێن[١٣٦].هۆزی گێژ لەچەند تیرە وبەرەبابێك و پێکهاتوون وەك: بەرەبابی بەگزادە: براگەورەیان جاران کەریم عەبدولڕەحمان بوو، ئێستا میقداد ئیبراهیم .

بەرەبابی وەرقە: براگەورەیان جاران خەلیفە حەمەجان بوو، ئێستا ئەحمەد مستەفا یاروەیسە.

بەرەبابی وەلك: براگەورەیان جاران حاجی خەلیل حاجی حەسەن بوو، ئێستا عادل حاجی جاسم.

بەرەبابی مامکی براگەورەیان جاران کوێخا جاسم حەسەن، ئێستا جەلال قادر جاسم .

بەرەبابی باپیری: براگەورەیان جاران حەسەن ئەحمەد مارف بوو، ئێستا نەجان ئەحمەد حەسەن.

بەرەبابی شاوان: براگەورەیان جاران عەزیز ئەحمەد بوو، ئێستا فایەق قادر حوسێن.

بەرەبابی پیروەیت: براگەورەیان جاران کەریم فەرحان بوو، ئێستا عەلی کەریم فەرحان.

بەرەباب مراد بەگ: براگەورەیان جاران مراد بەگ، ئێستا دارا محەمەد کەریم.

بەرەباب عەلی هدە: برا گەورەیان جان عەلی ئەحمەد بوو، ئێستا ئەحمەد نازم .

بەرەباب ڕۆژبەیانی: برا گەورەیان جاران ئیبراهیم حەمەخان، ئێستا عەزیز ئیبراهیم .

بەرەباب بارۆیی: براگەورەیان جاران مەحمود ئەڵماس، ئێستا م.ساڵەح مەحمود .

بەرەباب سالم: براگەورەیان عەلی سالم عومەر .

بەرەباب حارس: برا گەورەیان جاران عەزیز ڕەزا بوو، ئێستا دارا سەرتیب .

بەرەبابی عیسا: براگەورەیان جاران عەبدولاّ عیسا، ئێستا ڕەحمان حوسێن .

بەرەبابی چەلەبی: براگەورەیان جاران حەسەن چەلەبی، ئێستا جەلال جەلەبی[١٣٧]

---

١٣٥ کاروان عوسمان عەلی : س ، پ ، ل ١٨ .

١٣٦ حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : س ، پ ، ل١٣٥ .

١٣٧ دەستنوسی ئەحمەد مستەفا یاروەیس: ناحیەی ڕزگاری، ٢٠١٩/٣/٢٨ .



حاجی خەلیل حاجی حەسەن – (١٩٣٠– ٢٠٠١/٣/١٧)




مەحمود محەمەد ئەڵماس ١٩٢٠- ١٩٩٩



خەلیفە حمەجان محەمەد




محەمەد فەرەج گێژ کەلارکۆن

## هۆزی پالآنی :

هۆزێکی نیشتەجێی کشتوکاڵکار بوون، هەموویان سوونەی شافیعین، بەدیالێکتی کرمانجی خواروو قسەدەکەن، نزیکی سێ سەد وپەنجا ماڵ بوون، پێش جەنگی یەکەمی جیهانی دەیانتوانی دووسەد ئەسپ سوار و سەد پیادە ئامادە بکەن.

سنورەکانی بەم شێوەیە، لای باکوریەوە زەنگاباد، باشوری جۆگەی قەرەتەپە، ڕۆژهەلآتی ڕووباری سیروان، ڕۆژئاوایی گردی کەشکەوڵ، هەندێکیان لەگوندی (دەکا) نیشتەجێ بوون[١٣٨] . زێدی ئەم هۆزە لەڕۆژهەلآتی کوردستان بووەو هاتنیان بۆ ئەم ناوچەیە پێش دووسەد ساڵ لەمەو پێش بووە، سەرەتا لەناوچەی شێروانە نیشتەجێ بوون، دواتر ڕوویان کردووەتە دەشتی زەنگاباد، ئەمەش لەئەنجامی فشاری هۆزی جاف بووە، لەچەند گوندێکی دەوروبەری زەنگاباد نیشتەجێ بوونە وەك: (عەلوەش، کەنەسور، قەلآ، بنەباخ، بەیانلو، ئەمین حەبیب، ئاوای گەورە)[١٣٩]. مەردۆخیش بە سێ سەدو پەنجا بنەماڵەن مەزندەی کردووە، لەنێوان زەنگابادو قەرەتەپەو ڕۆژهەلآتی

---

١٣٨ مێجەرئی .بی . سۆن : چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو ، و نەجاتی عەبدوڵلآ ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ، ل٧٦ .

١٣٩ سهیل خورشید عزیز: مێژووی ناوچەی کفری ، چ١، چاپخانەی یاد ، ٢٠١٣ ،ل١١٢ .

سیروان و دەگاگا(دەکا) نیشتەجێن[١٤٠] .هەروەها ئێستا ژمارەیەك بنەماڵە و ئەندامانی هۆزی پالآنی لەدەوروبەری شارۆچکەی قوشتەپە نیشتەجێن و خەریکی کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات و کاری تایبەتین، هەرچەندە ژمارەی ئەندامانی هۆزەکە زۆرە بەلآم بلآون و جێگای تایبەتیان نیە، جگە لەباشوری کوردستان پالآنی لەباکور و ڕۆژهەلآتی کوردستان هەن[١٤١] . ئەم هۆزە لەکۆندا لەلایەن (ڕۆستەم ئاغا کوڕی عەبدولڕەحمان ئاغا) سەرۆکایەتی کراون، گوندی شێخ باوە لەسنوری پارێزگای دیالە ناوەندی دەسەلآتیان بووە، بەکشتوکاڵەوە خەریك بوون، چونکە گوندەکە کانیاوی تێدایە و ڕووباری سیروانیش بەتەنیشتیدا تێپەڕ دەبێت،بەهۆی سود وەرگرتن لەسەرچاوە ئاویەکان بەباخداری و بێستانەوە خەریك بوون[١٤٢] .

## هۆزی شێخانی بەرزنجی :

بەرزنجە* گوندێکی بچوکە لەسەر باشوری شاخی (کورەگاژاو)، کەوتۆتە دیوی ڕۆژهەلآتی شاری سلێمانی، سەنتەری ناحیەی (سروچك)ە سەربە قەزای شارباژێرە، بە گوێرەی (سی. جی. ئەدمۆنز) بنەماڵەکە لەڕووی ژمارەوە زۆرترین و بەدەسەلآترین بنەماڵە بوون لەباشوری کوردستان و نێوی خۆیان لەم گوندەوە وەرگرتووە .

بەرزنجیەکان ڕەچەڵەکی خۆیان دەبەنەوە سەر (بابا عەلی هەمەدان)*و گوایە دوای مردنی هەردوو کوڕەکەی (سەیدموسا، سەید عیسا) کۆچیان کردووە بۆ پێدەشتەکانی شارەزوور و گوندی (بەرزنجە)ی نێوبراویان ئاوەدان کردۆتەوەو مزگەوتێکیان بونیادناوە. بەگوێرەی ڕەچەڵەکی ڕابردووی بنەماڵەکە (سەید موسا) نەوەی لێنەکەوتۆتەوە، گشت ئەندامانی بەرزنجە لەڕواڵەتدا دەچنەوەسەرکەسێك کە بەناوی

---

[١٤٠] محەمەد مەردۆخی: س ، پ ، ل١٢٣ .

[١٤١] هەژار جەوهەر: تۆڕی میدیای ڕووداو، دووەمین فیستیڤاڵی هۆزی پالآنی لەهەولێر هەینی ٢٠١٨/٤/١٣ .

[١٤٢] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل١١٢-١١٣.

(باباڕەسوڵ) کە بەباباڕەسوڵی گەورە دەناسرێ و نۆیەم نەوەی (سەید عیسایە) پاش باباڕەسول کوڕەکەی بەناوی ئیسماعیل لەگوندی بەرزنجە کەناوەندی بنەماڵەکەبوو لەجێی باوکی دانیشت. لەمێژووی بنەماڵەکەشدا ساڵی (١٧٨٩–١٨٠٧) تایبەت مەندیەکی گرنگی هەیە، چونکە لەماوەی حوکمڕانی سوڵتان سەلیمی سێیەم ژمارەیەك موڵك و زەوی بۆخزمەت مزگەوت بە(سەید تەها)ی نەوەی شێخ ئیسماعیل بەخشی [١٤٣]. لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەم شێخ مارف نۆدێ (١٧٥٣–١٨٣٨) یەکێك بووە لەسەرگەورەکانی شێخانی بەرزنجەی سلێمانی، پاش داڕمانی میرایەتی بابانیش بوونە سەرکردەی بێ ڕکابەری شارەکەو دەوروبەری[١٤٤]. نێوبانگی شێخانی بەرزنجە لەسەردەمی کاکە ئەحمەدی شێخ (١٧٩٣–١٨٨٧) دەگاتە لوتکە بەتایبەت موریدانی سنوری کوردستان تێدەپەڕێنێت و دەگاتە ولأتانی ناوەڕاستی ئاسیا، دەبێتە جێی بایەخی هەریەلە سوڵتان (عەبدولعەزیز) و سوڵتان (عەبدالحەمیدی دووەم)[١٤٥] . مەردۆخی بەنزیکەی هەزارو پێنج سەد بنەماڵە مەزندەی کردوون، لەناوچەکانی (کەرکوك، سنە، خانەقین) خەریکی کشتوکاڵ بوونە و سونی مەزهەبوون [١٤٦] .ئەم هۆزە لەشاری کەرکوك و ناوچەی قادر کەرەم بوونیان هەیە، لەم گوندانە نیشتەجێن (پۆڵە، قەلأمکایەل گەورە، قەلأ مکایەل بچوك، قەشقە، چەم سورخاو، ژاژ، شاووك،

---

**بەرزنجە ئێستا ناحێیە کە لەناوچەی ناوچەی شاربازێر .

*بابا عەلی هەمەدان خوشکەزای بابا تاهیری هەمەدانیەو یەکێکە لەزانا دەرکەوتووەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی، خاوەنی چەندین نوسینە بەزمانی عەرەبی و فارسی .

*پارێزگای هەمەدان یەکێکە لەپارێزگاکانی هەمەدان، ناوەندی پارێزگا شاری هەمەدانە، لای باکوری پارێزی زەنگان و قەزوینە، لەباشوری پارێزی لوڕستانە، لای ڕۆژهەلأتی پارێزگای مەرکەزیە، لەڕۆژئاوای لەگەڵ پارێزگاکانی کوردستان و کرماشان هاوسنورە .

[١٤٣] خالد مەحمود کریم : س ، پ ،ل ١١٨ –١٢٠ .

[١٤٤] مارتین ڤان برونەست: ئاغاو شێخ ودەوڵەت، وکوردۆ، بەرگی دووەم،چ٢ ،سلێمانی ،١٩٩٩،ل ٢٩٩.

[١٤٥] خالد مەحمود کریم : س ، پ ، ل١٢١ .

[١٤٦] محەمەدئەمین زەکی بەگ :س ، پ ، ل٢٥٠

داربەسەرە، میل ناسر، قەڵخانلوی گەورە، قەڵخانلوی بچوك، گوڵەکانی، تەپەسەوز، تازەشار، چاڵەودوانە،عەلی مستەفا ،قەرەچێوار، نەورۆز، پارەبۆەڵەو هتر...) [١٤٧] .
ئێستا بەشێوەیەکی بڵاو لەچەندین شارو شاۆچکەی کوردستان ماڵی بەرزنجی دەبێنرێت .

## هۆزی جەباری :

هۆزێکی گەورەی کوردن حەزیان لەشەڕ نیە، هەڵس و کەوتیان چاکە لەگەڵ نەتەوەکانی تر و ئەو هۆزانەی لەدەوری خێڵی جەباریەکان کۆبوونەتەوە، سەربە بنەماڵەی بەرزنجین، هۆزی جەباری هەمیشە لەگەڵ تورکەکان نێوانیان ناخۆش بووە، پێنج سەد ماڵ بوون جاران دوسەد ئەسپ سوار و دووسەد پیادەیان هەبووە[١٤٨] .
هۆزی جەباری لەچەندین گوند پێك هاتوون، لەئێستادا ژمارەی گوندەکانیان سی و هەشت گوند دەبێت، لەڕووی ئیداریەوە لەباکوریەوە شوانی سەرخاسەیە، لەباشوریەوە ناحیەی قادرکەرەم، لەڕۆژهەلاتی چەمچەماڵە، ڕۆژئاوای کەرکوکە، مێژووی دروستبوونی ناحیەی جەباری دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم، کەبیست و

---

[١٤٧] عاسی کاکەیی: کوردو چەند بابەتێکی مێژووی، چاپخانەی ئەرابخا، کەرکوك، چ١، ٢٠٠٦ ل ٢٥ .

[١٤٨] مێجەرئی .بی . سۆن : چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و نەجاتی عەبدوڵلا ،چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ،ل٦١–٦٢ .

چوار گوند لەژێر کۆنترۆڵی شێخ شەرەفەدین بوو، بەلأم بەفەرمی ناساندنی ناحیەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شێخ مەحمود و حوکمی ئینگلیزەکان لەعێراق، سەید محەمەد جەباری کەسایەتی دیاری ناوچەکە وەك یەکەم بەڕێوەبەری ئیداری جەباری دانرا[149]. بەلأم سەید محەمەد نەك هەر ئەو کارەی قبوولّی ناکات بەلّکو قایم قامێتەکەی سوتاند و قامیقامەکەی بەناوی (عەلی ئەفەندی سەقەلّی) کوشت، سەید محەمەد هیچ کاتێك لەگەڵ بەغداد و ئینگلیزەکان ڕێك نەکەوتووە و سازشی نەکردووە، هەرچەند بۆ وازهێنان لەکاری شۆڕشگێڕی چەندین ئیمتازیان پێداوە، بەلأم هەر لەسەر هەلّوێست و دلّسۆزی خۆی مابوو بۆ کورد و شۆڕشەکەی شێخ مەحمود، دوای بەدیل گرتنی شێخ، سەید محەمەد و سەرۆك هۆزەکان لەڕاپەڕین و دژایەتی کردنی ئینگلیز بەردەوام بوون تا ئازادکردنی و دوای ئازاد کردنی، لەپاش دورخستنەوەی شێخ (مەلیك فەیسەلّی یەکەم) بانگهێشتی کۆمەلّێك سەرۆك هۆزی کورد دەکات بۆ بەغداد، سەید محەمەدیش یەکێك بوو لەو سەرۆك هۆزانە، کاتێك دانیشتن سکرتێرەکەی مەلیك فەیسەڵ هەر سەرۆك هۆزێك عەبایەکی عەرەبی دەخاتە سەرشانی وەك دیاری مەلیك، بەلأم سەید محەمەد قبولّی ناکات و وەری ناگرێت، مەلیك فەیسەڵ لێی دەپرسێ بۆ وەری ناگری ئەویش لەوەلأم دا دەلّێت شێختان نەفی کردووە دەتانەوێ بەفەروەی خوری بمان خەلّەتێنن[150]. ناوچەی جەباری خاوەنی نزیکەی حەوت سەد شەهید و ئەنفالە، ئەمە بۆ هۆزێك هەر هەمووی پشت و پەناو یەك بەرەبابن لەڕەچەلّەکدا ئەو پەڕی وەفادری و خۆشەویستیە بۆ کورد و کوردستان[151].

[149] حەسەن مەلا : کوردستانی نوێ،هۆزەکانی گەرمیان لەگێژاوی ئەنفالی سێیەم دا پەرتەوازە بوون، سلێمانی، ٢٠١٨/٤/٢٠ .

[150] مالّپەڕی کوردپیدیا :ڕۆلّی هۆزی جەباری لەپاش نەفی کردنی شێخ مەحمود .

[151] ئەسعەد جەباری: جینۆسایدی کورد، ناوی سەرجەم ئەنفالکراوەکانی هۆزی جەباری، ٢٠١٦/٤/١٦.

## هۆزی تیلەکۆ :

تیلەکۆ یەکێکە لەهۆزە دیار و ناسراوەکانی کوردستان، هۆزێکی ئازا و سەخی و میوان دۆستن، ناوەکەیان هەندێك دەڵێن لەناوی (تیر بەکۆڵە)وە هاتووە، لەبەر سەختی شوێنەکەیان و چاووتێبڕینی دووژمنان هەمیشە لەپارێزگاری کردنی هۆزەکەیاندا بوون و تیریەبەکۆڵیانەوە بووە بۆیە پێیان وتراوە تیربەکۆڵ دواجار گۆڕاوە بۆ تیلەکۆ. تیلەکۆ لەدوو ووشە پێك هاتووە تیل+کۆ تیل واتا خوار یان لاروو کەوانی، کۆ واتا کەژ یان کێو و چیا ئەم ناوە وەرگیراوە لەشێوەی سرووشتی چیای سەید لەنزیکی سەقز و دیواندەرە لەڕۆژهەڵاتی کوردستان، شێوەی ئەم چیایە کەوانیە دانیشتوانی بناری ئەم چیایە پێکهاتووە لەهۆزی تیلەکۆ. بۆچوونی دیکە هەیە ناوی تیلەکۆ لە(سیاکۆ)وە هاتبێ چونکە چیای حاجی سەید بەرزی لەئاستی ڕووی دەریاوە (٢٦١٣م)ە لەبەر زۆری گژوگیای و لەوەڕگای لەدوورەوە ڕەشی دەکردەوە بۆ هەندێك سیاکۆ لەوەوە هاتووە دواجار گۆڕاوە بۆ تیلەکۆ[١٥٢]. یان هەندێکی تر دەڵێن سەرەتای پەیدابوون و دەرکەوتنی ئەم هۆزە لەبناری تیل بووە کەزنجیرە کێوێك بووە، هەر بۆیە ئەم هۆزە دواتر بەتێپەربوونی کات ناویان تیلەکۆ دەرچووە[١٥٣] . تیلەکۆ لەڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتوون لەپەنجاو چوار گوند و ناحیەدا نیشتەجێ بوون، دابەش دەبن بەسەر دوو بەرەدا هەمەوەیسی و دۆناری، پیاوی ناودار و سەرۆکیان نازناوی خانیان پێوە بووە. لەباشوری کوردستان هۆزی تیلەکۆ دابەش دەبێت بەسەر زۆرێك لە ناوچەکانی کوردستان بەتایبەتی شارەزوور، گەرمیان، چەمچەماڵ، سلێمانی .

یەکێك لەبەناوبانگترین بەرەبابەکانی تیلەکۆ بەکربەگیەکانن کەدەگەڕێتەوە بۆسەر محەمەد بەگ باوکی حەسەن بەگ، ئەمانە حاجی مشیر ئەحمەد دەمسپیان بووە.

---

[١٥٢] جەلالەدین شافعی کورد: جوگرافیای تاریخی کوردستان، چ١، .

[١٥٣] دەست نوسی حاجی دارا حەمەڕەشید باوەمەردی : سلێمانی، ٢٠١٨/٧/٢٦ .

حەمەوەیسـیەکانیش: سـاڵەح خەسـرەو، حـاجی سـەمین حـاجی عـەلی سـەرۆکیان بوون[١٥٤]. ئەم تیرەیە زیاتر لە(٣٢٠) پێش ئێستا لەنێوان کەرکوك و بەغـداد دەژیـاون و هاتوونەتە باشوری کوردستان، پاشان گەڕوانەتەوە کوردستانی ڕۆژئاهەڵات و لەباشماخ نیشـتەجێ دەبـن و لەئێسـتادا خـاوەنی بیسـت و سـێ گونـدن لەناوچـەیە . دووسـەد خێزانیان بەرەو بانە ڕۆیشتوون و لەدەشتەتاڵ کیرساونەتەوە، پـەنجا خێزانیشـیان لـە خوڕخوڕە نیشتەجێ بوون، سێ سەد خێزانیان هاتوونەتە ناو جاف ئێستا زۆرتر لەسـێ هەزار کەسیان لەباشماخ دایە، هۆزێکی ئازاو سەخی و مێوان دۆستن .
کوێخایان زۆربووە، جاران سەرۆکی هەموویان (حەسەن بەگ) کوڕی محەمەد بەگ بووە کـە هـاوەڵ ودۆسـتیکی نزیکـی (کـەریم خـانی زەنـد) بـووە، ئـەم تیرەیـە لەباشـوری کوردستان زۆرنین، زۆربەیان لەڕۆژهەلآتی کوردستانن لەناوچەی (خوڕخوڕە، باشماخ)دا بلأوبوونەتـەوە[١٥٥].هەنـدێ سەرچـاوەش تـیرەی تیلـەکۆ بـەکوردی ناوچـەی ئـەردەلآن ناودەبات، ئەمانە لەئەسڵدا کوردی ناوچەی ئەردەلآنن و لەنزیك هەواجۆوە جێگیربوون و ژمارەیان شەش سەد خێزان بوونە[١٥٦]. تیلەکۆ پێشتر لەهەندێك ناوچەی نێـوان بەغـداد و کەرکوك نیشتەجێ بوون، بـەلآم دواتـر بەشـێکیان پەیوەسـت بـوون بەجافـەوە و زۆر بەشیان چوونەتە دەشـتەتاڵی بانـەو ناوچـەی خوڕخـوڕە و باشمـاخ و لـەوێ نیشـتەجێ بوون، تێکـەڵاوی و هـەوار و کۆزیـان زیـاتر لەگـەڵ تیرەکـانی رۆغـزادی و تـەرخانی بـوو لەهۆزی جاف[١٥٧] .چەند شوێنێك هەیە ناوی تیلەکۆی هەڵگرتووە (تیلەکۆی قەڵەنـدەر) لەناوچـەی گـەرمیان، پێشـتر ناحیـەی تیلـەکۆ هـەبوو، بـەلآم ئێسـتا بچـوك بووەتـەوە گوندێکە، لەڕۆژهەلآتی کوردستان گوندێکی دیکە هەیە بەناوی (تیلەکۆ) لەسەر سـنوری

---

[١٥٤] سەردار حاجی ستار: مێژووی ڕەچەڵەکی هۆزی تیلەکۆ، لەچاپ نەدراوە .

**[١٥٥] میرزا شکرولآ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلآن،و ئەنوەر سوڵتانی، چاپخانەی ژین–سلێمانی ، چ١، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف: س ،پ ،ل٣٩٥.**

[١٥٦] ئی ،جەی .ئار: هۆزەکانی کورد،و حسێن ئەحمەد جاف ، چ١ ، ١٩٨٥،ل٢٠ .

[١٥٧] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ٢٠٨ .

(ئێران—ئێراق) نزیکە لەگوندەکانی (چیاڕەزا، دێ سووتك) سـەربەقەزای خانـەقین[158] . ئەم هۆزە لەناوچەی گەرمیان لەچەند گوندێکی وەکو (کوردەمیر، چاڵاوسـورك، تیلـەکۆ، ناساڵەح، حاجی عەواد) و (شارۆچکەی رزگـاری، قـەزای کـەلار، قـەزای کفـری) گونـدی مراوە،چەند شوێنێکی تر بوونیان هەیە . تیلەکۆ کۆزی زستانەیان جاران لـەناو باشـکی دا بووە، هێزی جەنگاوەریان (٥٠ سوارە، ٣٠ پیادە بـووە، بـەم نزیکانـە سـەد و پـەنجا خێزانێك بوون[159] . هەروەها تیلەکۆ لەچەندین شوێنی تریش نیشـتەجێن وەك گونـدی: باوەمەردەی سەروو، باوەمەردەی خواروو، لەئێستادا تێکەڵ بەشاری سـلێمانی بـووە و بووەتە گەڕەکێك لەسلێمانی، کێلەسپی، کانی پان، داربەڕووی مامە سوارە، داربـەڕووی حــاجی عــەزیز، کۆزەڕەقــە، ئــەم گوندانــە ســەربەناحیەی سەرچــناری ســلێمانیە، تەپەسورەی حەمەڕەزا لەناحیـەی عەربـەت، گونـدی کـانی ڕەش لەشـارەزوور، گونـدی بنە، تەپەعارەبی، لەقەزای چەمچەماڵ، هەرمۆڵە، قـەڵای شـێخ ڕەشـید، تیلـەکۆیی نـاو زەنگنــە لەناحیــەی ســەنگاو، یــالآن پــێ، هانــە، وریــاوە لەناحیــەی خورمــاڵ، سماقــە، قەرەناو، لەناحیەی تەق تەق، کانی هۆمەران سەربەقەزای قەرەداغ، ورمزیار لەناحیـەی بازیان، خربلاخ لەناحیـەی لـەیلان سـەربەپارێزگای کـەرکوك، گونـدی کـوردەمیر حەمـە ئەمین خەرامان،گونـدی ریشـێن بنەماڵـەی مـەحمودی حـاجی سـابیری تێدایـە، گونـدی وڵەسمت بنەماڵەی خـانی کـەریمی تێدایە،گونـدی قـالیجۆ بنەماڵـەی حـاجی حەسـەن و حاجی عەزیزی تێدایە، گوندی دێکۆن بنەماڵەی ماڵی ڕەمەزان دێکۆنی، ئەکرەم دێکۆنی تێدایە، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی هۆزی تیلەکۆ لەم شار و شارۆچکانەی کوردسـتان نیشتەجێن : کەرکوك، هەولێر، سلێمانی، چەمچـەماڵ، عەربـەت، بـانی مـەقان، بازیـان، ســەنگاو، شــارەزوور، پێنجــوێن، هــەورامان، دەربەنــدیخان، قــەرگۆڵ، بــەکرەجۆ، قادرکەرەم، قەرەداخ .

[158] ساڵح هارونی: س ، پ ، ل١٣٨ .

[159] محمود عەزیز حەسەن: س ، پ ، ل ٢٠

لەئێستادا ئەم هۆزە لەلایەن ئەم کەسایەتی و ڕیش سپیانە بەڕێوەدەبرێت لەباشوری کوردستان فەرهاد ڕەفعەت، هیوا محەمەد غەریب، حاجی دارا حمەڕەشید باوەمەردی، حاجی ستار محەمەد تالب (ستارەسور)، خەلیفە مەحمود شاسوار، کەمال محەمەد غەریب، مەلا حەبیب سۆفی ئەمین حمەزەمان[١٦٠] .






ڕەفعەت علی حاجی موشیر- لەگەڵ فەرهادی کوڕی گەرمیان – عیزەت خەلیفە قادر کۆزە ڕەقە – حمەڕەشەید عەبدولڕەحمان باوەمەردە سلێمانی – محەمەد غەریب محەمە – چەمچەماڵ

## هۆزی گل :

گل هۆزێکی کوردن لەسنوری ئیدارەی گەرمیان، دوزخورماتوو، کەرکوك، خانەقین گیرساونەتەوە، لەگەڵ بناری گل کەهەژدە گوند لەخۆدەگرێت لەسنوری شارۆچکەی چەمچەماڵ[١٦١]. ئەو ناوچەیەی هۆزی گلی تێدا نیشتەجێیە هەرێمێکی زۆر کۆنە،

---

[١٦٠] دەست نوسی حاجی دارا حەمە ڕەشید باوەمەردی : سلێمانی، ٢٠١٨/٧/٢٦ .

[١٦١] سەبری هۆرێنی: سایتی وشە، ٢٠١٧/٩/١٧ .

مێژووی دروستبوونی قادرکەرەم و ئیدارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٦٦ زاینی، سەرەتا لەشێوەی گوندێك دروستکرا، سەبارەت بەناوەکەی دەڵێن دووبرا بوونە بەناوی قادر و کەرەم گوندەکەیان ئاوەدانکردۆتەوە، سەرچاوەکان باس لەوەدەکەن مێژووی دروستبوونی ناحیەی قادرکەرەم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٤زاینی ناحیەی قادرکەرەم پێشتر ناوی سنجاقی گل بووە، سەنتەری

دەکەوێتــە نێــوان دوو شــیوی ئــاوداری بــەناوبانگ یەکــەمیان ڕووبــاری ئاوەســپی لای خۆرهەڵاتیەوە شۆڕ دەبێتەوە تا باشوری، ئەم چەمە بەزستانان ئـاوێکی زۆری هەیـە و بەهاوینان ئاوەکەی کەم دەکات، بەشێکی زۆری گونـدەکانی دەوروبـەری دوزخورمـاتوو ئاودێری دەکات سەرچاوەی ئەم ئاوە چیاکانی سەنگاوە، دووەم ئـاوی ڕوبـاری ڕۆخانـە کە لەدەوروبەری داقوق پێی دەوترێت طوغ شایی ئـەم ئـاوە دەکەوێتـە لای باکوریـەوە دێت بۆ خوار ئاوایی .

ناوچەی گل بریتین لەم گوندانە: کۆرمۆر جان وەیس بـەگ، کۆرمـۆر عـەلی خـان بـەگ، کۆشکی ناوەڕاست، کۆشکی بچوك، فەرهادبەگ، بەهرام بەگ، کـانی قـادر قـەڵا، مـیران بـەك، کـانی قادرکـەلاوە،کانی قـاد، ئاوباریـك کۆشـکی گـەورە، تازەشـار، سـۆفی ڕەزا، دارەتوو، ئەحمەد بەگ، عەزیز بەگ، تەختە مینا، دەکەونە دەوروبەری چـیای جـەوەل ناساز و خۆرنەوەزان .هۆزێکی کۆنی کوردن لەچەند تیرە و بەرەبابێك پێکهاتوون وەك : جان وەیس بەگ، فەرهاد بەگ، بەهرام بەگ، میران بەگ(باخەوانی)، کوێخا عاشور .

عەباس عەزاوی لەکتێبەکەی تاریخ العراق بین احتلالین دەڵێت: شێخ عەبدولقادری پیری تەریقـەتی قـادری لەکوردسـتان و وڵاتـی تـر خـەڵکی هـەرێمی گلـە، بنەماڵـەی گـەیلانی بنەماڵەیـەکی کـۆنن سـەرەتایان بـەپیری گـەورەی تەریقـەت شـێخ عەبـدولقادر دەست پێدەکات ئەم زاتە لەناوچەی گـل لەهـەرێمی کـەرکوك هاتۆتـە بەغـداد، شـەرەف خـانی بەدلیس باسی ئەو کوردانە دەکـات کـە لـەپانتای خـاکی ئێـران بڵاوبوونەتـەوە لەدوایـدا نوسیوویەتی لەخۆراسان تیرەیەکی کـورد هەیـە پێـی دەوترێـت گیـل، کـە لەسـەردەمی شاتەهماسـبی سـەفەوی (١٥٢٤–١٥٧٦) سـەرداری ئـەم هـۆزە شەمسـەدین بـەگ بـوو، هەروەها عەباس عەزاوی لەکتێبی عشائر العراق الکردیە کاتێك باسی گل دەکات دەڵێت مەرکـەزی ناحێیـەك بـووە سەربەسـەنجقی کـەرکوك، لەبەرئـەوەی چـەند چاڵە نـەوتێك

---

ناحیەکە بناری گل بووە، دوری ناحیەکە لەناوەندی پارێزگای گـل ٦٥کـم بـووە، ناحیەکـە لەپـەنجاو سێ گوند پێك دێت پاشان لەساڵانی ١٩٢٩–١٩٣٠ ناحیەکە کراوە بەقەزا .

کەوتوو بووە ئەم ناوچەیە دەوڵەتی عوسمانی بایەخی بەهۆزی گل داوە، هۆزی گل دەکەوێتە ناوەندی ئەم هۆزانەی کورد لای باکوری خۆرهەڵاتی هۆزی زەنگنەیە، لەباکوری خۆرئاوای هۆزی جەباری و شێخانە، لای باشوری خۆرهەڵاتی داودەی کوردستان، لای باشورەوە داودەی خوارووە .

لەسەردەمی حکومڕانی دەوڵەتی عوسمانی دا بەهۆی دەسەڵاتی ئاینی بنەماڵەی (شێخ عەبدولڕەحمان تاڵەبانی) یەوە هەندێك لەئەندامانی تاڵەبانی لەو دەوروبەرەدا چەند گوندێکیان داگیرکردو کەوتنە شەڕەوە لەگەڵ بنەماڵەی بەرزنجیەکان کە بەشێخێتی و دەروێشی کەوتبوونە ناو تیرەی شێخان و لەقەرەچێوار دادەنیشتن، لەم شەڕەدا شێخ حوسێنی بەرزنجی براگەورەی شێخ حەسەنی قەرەچێوار لەلایەن تاڵەبانیەکانەوە کوژرا، لەم نێوەندەدا هۆزەکانی گل، داودە، شێخان پشتیوانیان لەشێخانی بەرزنجی دەکرد، کاتێك دەوڵەتی ئینگلیز باشور و ناوەڕاستی عێراقیان داگیرکرد و دواتر گەیشتنە جەلەولا شێخ حەمید و هەندێك لەخزمەکانی چوون بۆ جەولەولا پەیوەندیان لەگەڵ ئینگلیز پتەوکرد، سەرەتا شێخ حەمید کرا بەقایمقامی کفری و پاشان لەدوای خۆی کوڕەکەی لەجێگەی دانرا، شێخ حەمیدیان بردەوە بۆ ناوچەی گل و کرا بەناحیە فەرمانگاکەی برایە چەم سورخاوو، پاش ئەوەی سەید محەمەد جەباری ئەم فەرمانگەیەی سوتاند لەو کاتەدا گوێزرایەوە بۆ قادرکەرەم و گل کرا بەقەزا سەردەمێك مەرکەزی قەزای گل برایە لەیلان و پاشان برایە تاووخ و دواتر بۆ دوزخورماتوو. د. موکەڕەم تاڵەبانی لەکتێبی ایبراهیم خان ثائر من کردستان دەڵێت : لەوبەری چەمی ئاوەسپی یەوە شێخ حەمیدی تاڵەبانی لەنۆڵەی شێخ وەهابی کوڕی کە لەدەشتی قەرەئۆغلان کوژرابوو، هێزی خۆی کۆکردەوە بەیارمەتی ئینگلیزەکان لەماوەیەکی کورت دا لەسەردەمی عوسمانیەکان زەوی و زارێکی بەپیت و بەرەکەتی لەسەرۆك هۆزەکانی گل وەرگرت، پاش ئەمە ژمارەیەکی زۆر خەڵك چوون بۆ کەرکوك بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان، شێخ حەمید توانی جێ پێی خۆی لەناو هۆزی گل جێگربکات، شێخ حەمید هەرمەشەوە نەوەستا بەڵکو ویستی دەست بەسەر زەوی زاری

شێخەکانی بەرزنجە و ئاغاکانی داودە بگرێت، لەئەنجامی ئەم هەوڵەی شێخ سەمەد برای شێخ حەمید بەدەستی شێخ حوسێنی قەرەچێوار کوژرا، ئەویش لەتۆڵەی دا شێخ حوسێنی قەرەچێواری کوشتەوە، لەهەمان کاتدا هەندێك لەدێهاتەکانی داودەی ئاگر تێبەردا و هەندێك کەس کوژران. تاڵەبانیەکان بەهۆی ئەوەی هۆزی گل یارمەتی بەرزنجیان دابوو هەروەها لەگەڵ جەباریەکان دۆست بوون، هەموو گوندەکانیان داگیر کراو دەربەدەر بوون هەندێك لەماڵەکانیان مانەوە تاساڵی ١٩٣٠ کە شەڕی ئاوباریك ڕویدا لەنێوان شێخ مەحمود و هێزەکانی حکومەت و ئینگلیز و ئەو هۆزانەی لایەنگیری حکومەت بوون، هۆزی گل بەتاوانی پشتگیری هێزی شێح مەحمود کەلەڕێگەی محەمەد بەگی جان وەیس بەگ سەرۆك هۆزی گل و چەند سەرۆك هۆزێکی تر لەگوندەکان دەرکران و زۆر لەڕۆڵەکانیان خرانە زیندانەوە، ئەم هۆزە لەدوای ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی داگیرکەری ئینگلیز تەنگیان پێ هەڵچنی گەورەی خێڵەکانیان بەهەڵهاتن داو، هێلانەی ڕۆڵەکانیان تێك دان و خەلە و خەرمان و دار و بەردیان بەسوتان دا، لەو بنارە دەریان کردن و پەرش بڵاوەیان پێکردن و بەناو شار و دێ و دێهاتەکانی گەرمیان، داودە، جەباری، زەنگنە، شێخان، جاف دا، بەڵام بەپەنابەری و کۆچەری ئارامیان نەگرت و گەورە و بچوك تۆڵەسەندن بووبە پیشەیان .

ناوچەی گل ناوچەیەکی بەپیت و بەرەکەت و پڕ دەغڵ و دان و باخ و باخاتێکی زۆری تێدایە، بێستانی زۆری لێدەکرێ، هەندێك شوێنەواری تێدایە هەر لەکۆنەوە بەشوێنی ئاینی و پیرۆز ناسراون وەك :

١- باوەقەتاڵ: زیارەتگایەکی ئاینی یە بەسەر لوتکەی چیایەکەوەیە لەنزیك گوندی کۆرمۆری جان وەیس بەگ، کانیاوێکی گەڕاوی لەپاڵدایە ئاوەکەی گۆگردیە، پێشان خەڵکی ناوچەکە و دەوروبەری و زۆر لەکاکەیی یەکانی هەورامان هەمووساڵێك دەهاتن بۆسەر ئەم زیارەتگایە .

٢- گەڕاو: کانیەکی گەورەی ئاوی گۆگردە لەدامێنی زنجیرە چیای ناسازەوەیە، هەر لەکۆنەوە ئەوانەی توشی نەخۆشی پێست دەبن دەچنەسەری خۆیانی تێدا دەشۆن و پێی چاك دەبنەوە .

٣- سەرچاوەی نەوت: ئەو بنارە گەلێك سەرچاوەی نەوتی تێدایە خەڵکی ئەو دەڤەرە لەکۆنەوە لێیان هەڵدەگواست و بۆ سوتەمەنی و ڕۆشنکردنەوەیماڵەکان بەکاریان دەهێنا، هەندێك لەکەسانی هۆزی گل داهاتیان لەسەر ئەو نەوتە بووە بە کۆڵ و ئێستر بەکاروان ئەیان برد بۆ سلێمانی و ناوچە کوێستانیەکان لەوێ لەگەڵ خواردەمەنی و کەلوپەل و پێداویستیەکانی تر ئاڵ و گۆڕی پێدەکرا .

پیاوانی هۆزی گل وەك زۆرێك لەپیاوانی هۆزەکانی تر کورد، کەوا و سەڵتەیان لەبەر دەکرد و سەریان بەمشکی و قۆڵیان بەفەقیانەی سپی و دەبەست، سواری ئەسپ و ماینی گورج و گۆڵ دەبوون، ژنانیان کراس و کەوای زەرد و سور و پشتێنەیان بەسەردا دەبەست و لوتەوانەیان لەلوت و گوارەیان لەگوێ و ملوانکەی مێخەك بەندیان دەکردە مل، کوڕەکانی هۆز خاوەن بەهرەیەکی گەورە بوون لەهۆنراوەی فۆلکلۆری بەزم و ڕەزمی شایی و زەماوەندا، لەکاتی درەو و کێشە و هەڵگرتنی خەلە و خەرمان و کاری مەرەزە و باخ و باخچە و بێستانیان ئەنجام دەدا، هەروەها گەنج و لاوانی هۆز ئامادەبوون لەقسەخۆشەکانی دانیشتنی پاش نیوەڕۆی سێبەری مزگەوتی گوندەکان، وەئامادەبوون لەگفتوگۆیی پیرەپیاوەکان لەگاڵتەو گەپی شەوانی زستان لەدەوری کوانووی ئاگر و قاوەخانەی دیوەخانی پیاوە گەورەکان دا .

شێخ ڕەزای تاڵەبانی لەبەیتێکی شیعری دا دەڵێت :

ئاخ لەدەس شۆربای سلێمان چاوڕەش و قاوەی خلە
ئەو دەڵێی ئاوی گەڕاوە ئەم دەڵێت نەوتی گلە[١٦٢]

---

[١٦٢] پەشێو مکرەم ئەحمەد: تۆڕی کۆمەلایەتی فەیس بووك بنار گلی، ٢٠٠٣ .

## هۆزی سەنجاوی :

هۆزێکی ناودارن بەهۆی جەنگ و کارەساتەوە زۆریان لەناو چووە[١٦٣]. مەیجەرسۆن لەساڵی ١٩١٠ی زاینی دەڵێ: ئەم هۆزە بنکەی سیاسیان لەقەسری شیرینە و تاسەر سنور دەستیان بەسەر زەویەکانی ئەوناوەدا گرتووە، لەهاویندا لەشوێنی باشتردا جێگردەبن لەناو پارێزگای کرماشان، پەیوەندی ئەم هۆزە لەگەڵ هۆزەکانی (باجەلان، گۆران، کەڵهوڕ)دا زۆر باش نەبوو، لەوەرزی زستاندا بەشێکیان لەسەر سنور دەژین[١٦٤]. هۆزێکی گەورەی کوردە لەناوچەی مای دەشت کە ئەکەوێتە خۆرئاوی کرماشان نیشتەجێیە و ژمارەیان (١٥) هەزار خێزانە، هەموویان عەلی ئیلاهین وشیعەن[١٦٥] .

بەشێکیان هاوینان هۆبەو رەشماڵەکانیان لەپێدەشتی ماهیدەشت و هەرێمی جوانڕۆ هەڵداوە، زستانانیش بۆ زەوی زاری خوارووی ئەڵوەند کۆچیان کردووە، لەو ناوچانەی کەوتوونەتە باکور و باکوری ڕۆژئاوای قەسری شیرین[١٦٦].تا پێش جەنگی یەکەمی جیهانی سەرۆکەکەیان حاکمی قەسری شیرین بوو[١٦٧]. لەناوچەکانی (ماهیدەشت، ناوچەکانی کرماشان، جوانڕۆ، سنە) نیشتەجێن، دوانزە تیرەن تیرەکانی بریتین لە :

---

لەیلان: ئێستا شارەدێیەکە دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەلأتی شاری کەرکوك بەدووری ٢٥کیلۆمەتر، شارە دێیەکە

[١٦٣] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٩٥ .

[١٦٤] مەیجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ ، ل٨٩ .

[١٦٥] ئی ،جەی .ئار: هۆزەکانی کورد ، و حسێن ئەحمەد جاف ، چ١ ، ١٩٨٥ ،ل١٧–١٨ .

[١٦٦] مەیجەربی سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان،و مینە، محەمەد ئەمین حوسەین، ٢٠٠٧، ل٨٤

چالاوی (چالابی)، دالّیان، گوازی، سیمەوەند، سورەوەند(سورخەوەند)، تەکەوەوەند، تفەنگچی، حەق نەزەرخانی، ئیمامسوەند، دارخۆر، بێوەحشتییان هتد...[١٦٨] .

## هۆزی چۆلمەکی :

ئەم هۆزە دەگەڕێتەوە بۆ تەفنگچی قەڵخانی لەهۆزی سنجاوی لەشاری کرماشان لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، لەسەر مەزهەبی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی کاکەیی مەزهەب، ئەم هۆزەلەچوار تیرە پێکهاتووە: دەرۆستەمان، دەفرەشەینان، دەمرەهان، دەویسان، ئەم چوار تیرە بنەڕەتی ناوەکەیان بەم شێوەیە: ڕۆستەم، شەریف، مراد، وەیس ئەم چوار برایە باوکیان ناوی حوسێن خان یان حوسێن بەگ بووە، ناوی هۆزی چۆلمەکی دەگەڕێتەوەبۆگوندی چۆلمەك کە بیست و پێنج کیلۆمەتر لەچەمچەماڵەوە دوورە، چۆلمەك واتا (چۆڵی مەکە)، شێوازی ئاخاوتن و قسەکردنیان بەدیالێکتی ماچۆماچۆ بووە، ئەم هۆزە لەسەرەتای ساڵی ١٥٦٧ زاینی لەناوچەی کرماشانەوە کۆچیان کردووە بۆ ڕۆژهەلاتی شاری چەمچەماڵ لەپارێزگای کەرکوك، لەناوچەکەدا دوو گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە بەناوی چۆلمەك چونکە گەرمیان و کوێستانیان دەکرد، یەکەمیان لەڕۆژهەلاتی چەمچەماڵ دووەمیان لەناوچەی بازیان لەڕۆژئاوای شاری سلێمانی، ئەمانە لەئەسڵدا یارسانن بوون. ئەم کەسایەتی و ناودارانە سەرۆك و کوێخا و ڕیش سپی هۆزی چۆلمەکی بوونە یەك لەدوای یەك وەك: جانەوەیس بەگ، کوێخا ڕەمەزان، کوێخا مەلاك، فەقێ وەیس، کوێخا نادر، کوێخا سلێمان، مامە حەمەعەلی شاناز، کاکە ڕەمەزان عەزیز سلێمان، مامە حەمەعەزیز مارفە گێتە، کوێخا حەمەشەریف خەلیفە، مەلا محەمەد هەڕاوە، کوێخا ڕەحیم چۆلمەکی .

[١٦٨] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل١٠٣.

لەدەوروبەری ساڵی ١٦٥٠ زاینی ژمارەی خێزانەکانیان دەگەیشتە دووسەد و پەنجا خێزان. لەدەوروبەری ساڵی ١٨٢٠ میری بابان ئەفسەرێك و حەوت سەربازی نارد بۆ کۆکردنەوەی باج لەگوندی چۆڵمەك، لەبەر ئەوەی دانیشتوانی گوندەکە نەیانتوانی باج دابین بکەن، لەگەڵ میرنیشنی بابان پەیوەندیان تێکدەچێت، ئەفسەرەکە بەکوێخا ڕەمەزان دەڵێت ئەگەر باجەکە نەدەن تەعدای ناموستان لێدەکەم، کوێخا ڕەمەزان دەڵێت جارێك بووەستە بۆت دابین دەکەم، کوێخا ڕەمەزان ڕاوێژ لەگەڵ خزم و کەس و کاری دەکات و ڕێکدەکەون لەسەر کوشتنی ئەفسەرەکە، ئەفسەرەکە دەکوژن و حەوت سەربازەکە دەست و پێی دەبەستن بەڵام نایکوژن، هەر لەو شەوەدا دەگەڕێنەوە بۆ کرماشان بۆ زێدی خۆیان. لەدوای ڕووخانی میرنیشنی بابان لەساڵی ١٨٥٠ زاینی بەشێك لەهۆزی چۆڵمەکی دەگەڕێنەوە بۆگوندەکەیان، ئەبینن گوندەکەیان لەلایەن حەمەی هەیەر لەتیرەی سەفرەوەن لەهۆزی هەمەوەند داگیرکراوە، کە ئێستا لەناو نەوەکانیدا بە حەمەئاغا ناوی دەبەن، حەمەی هەیەر لەگەڵ هۆزی هەمەوەند نەچوو بۆ لیبیا، بۆیە لەلایەن میرنیشنی بابان زەوی و ئاوی چولمەکی پێبەخشرا بوو وا دیار بوو زۆر نزیکی میرنیشنەکە بووە، لەبەر ئەوە هۆزی چۆڵمەکی لەوکاتەدا لەسەر مەزهەبی کاکەیی بوون، کاتێك حەمەی سلێمان باوکی موشیر ئاغای هەمەوەند لەلیبیا گەڕاوەتەوە بینیەتی حەمەی هەیەر بووەتە خاوەن چۆڵمەکی چووە بۆ دێوخانەکەی بەپێڵاوەکانی دانیشووە، پێی وتووە حەمە ئەم ئاغایەت لەکوێوە هێناوە، حەمەی هەیەریش دەمانچەیەکی بەقەدیوە بووە وتوویەتی بەزەبری ئەم دەمانجە بوومە ئاغا گەورەم، پاشان دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری گەڕانەوەی هۆزی چۆڵمەکی دا . دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك دانیشتن پەیوەندیان لەگەڵ تیرەی سەفرەوەن لەهۆزی هەمەوەند تێك دەچێت، لەساڵی ١٨٦١ زاینی بەشێکیان کۆچ دەکەن بۆگوندەکانی کۆڵەکانی و شۆراو نزیك بەڕۆژهەلاتی داقوق، لەوێ تێکەڵی هۆزی زەنگنە، قەرەسەنی، گۆمەیی، زەند، جاف، ئەبن و دەبن خزم و دۆستی یەکتر . لەساڵی ١٨٩٥زاینی لەگوندی کۆڵەکانی و شۆراوە کۆچ دەکەن بۆناوچەی تاڵەبانی و کاکەیی لەڕۆژئاوای داقوق، پاشان دابەش

دەبن بەسەر ئەم گوندانەی کاکەیی وەك تۆپزاوە، زەنقڕ، عەلی سەرا، ئەلبومحەمەد، عەرەبکۆی، لەساڵی ۱۹۲۰ زاینی لەناوچەی کاکەیی یەوە کۆچیان کرد بۆ ناوچەی تاڵەبانی و لەم گوندانە نیشتەجێ بوون عەبدولا غەنم، یەنیجە، عەنانە، سنور، شێخ فەیزولا عەبدولقادر سەرۆك هۆزی تاڵەبانی لەڕۆژئاوای داقوق زۆر دڵسۆزی هۆزی چۆلمەکی بوو حەزی بەم کۆچەی هۆزی چۆلمەکی دەکرد بۆ ناوچەی تاڵەبانی .

سەید محەمەد بەرزنجی قایەچی کەیەکێك بوو لەنەوەکانی شا ئیبراهیم بەغدادی، ناوچەی کاکەیی لەڕۆژئاوای داقوق بەسەروەت و سامانی خۆیی ئەکرێت بۆ نەوەکانی و هۆزەکەی، بۆ نمونە تەنها عەرەبکۆی بە چواردە هەزار لیرەی ڕەشادی تورکی کڕی و داوای لەهۆزی کاکەی کرد کۆچ بکەن بوناوچەی داقوق و زەوی بەسەردا دابەش کردن جێگری کردن دوورلەکۆچ کردن، سەید ئیبراهیم بەرزنجی لەهۆزی کاکەیی ڕێزی زۆری لەهۆزی چۆلمەکی گرت، سەید عەدنان ئاغای کاکەیی ڕێبەری گشتی هۆزی کاکەیی دەڵێت : ئێمە بۆیە هۆزی چۆلمەکیمان خۆش ئەوێت چونکە ڕۆژێك زیانی بەئێمە نەگەیاندووە، کاتێکیش موسڵمان بوون و بوون بەسوونی مەزهەب هەر بچوکترین کێشە ڕووی نەدا، چۆڵمەکیەکان تا ساڵی ۱۹۲۰ زاینی هەر لەسەر ئاینی کاکەیی بوون، لەدوای ئەوە لەگوندی عەبدولا غانم لەناوچەی تاڵەبانی سەر بەقەزای داقوق بوون بەئیسلام لەسەر مەزهەبی سوونە، بەئارەزووی خۆیان نەك بەزۆر، کاتێك موسڵمان بوون خاکەیان بەدەستەوە نەمابوو، چونکە هۆزە کوردیەکان بەبیانووی ئەوەی کەهۆزی چۆڵمەکی کاکەی بوون دەستیان بەسەرخاکەکەیان گرتوو بوو، ساڵی ۱۹۲۷ زاینی بەهۆی وشکە ساڵیەوە کەبەگرانی بچوك ناوی دەبەن لەناوچەی تاڵەبانی یەوە کۆچ دەکەن بۆ شارۆچکەی چەمچەماڵ و دەوربەری لەم گوندانە نیشتەجێ دەبن (بنگرد، برایم ئاغا، سەیدان، کانی سارد، گورگەیی چاوسور، گورگەیی ئەحمەد کاکەولا، گورگەیی سەرخاسە، یاروەلی) دوای دووساڵ بەشێکیان گەڕانەوە بۆناوچەی تاڵەبانی و کاکەیی و داودە، بەشەکەی تریان هەر لەوێ مانەوە، ئێستا ئەم هۆزە بەشێوەکی گشتی لەزۆرێك لەشارەکانی کوردستان نیشتەجێن وەك کەرکوك، هەولێر، سلێمانی، دهۆك، بەغداد،

موسڵ، داقوق، دوبز، کەلار، خانـەقین، حەویجـە، چەمچـەماڵ، دووز، شـۆڕش، تەکیـە، لەیلان، لەناوچەکانی کاکەیی و تاڵەبانی و داودە هـۆزی چـۆلمەکی ئێسـتا لـەم گوندانـە نیشـتەجێن وەك هــەڕاوە، چـۆلمەك، لـەکاوە، گورگـەیی چاوسـور، گورگـەیی ئەحمـەد کاکـەولا، گـەزەلان، گورگـەیی سەرخاسـە، عەبـدولاَ غـانم، عـەرەبکۆی، عـەلی سـەراو، تۆپزاوە، ئەلبومحەمـەد، تەپـەی دووسـەر، ئـاوایی عـەلی ئاغـا، سـاڵەح ئاغـا، حوسـێن ئیسلام، قەرەدەرە، سیامەنسور[١٦٩] .

## هۆزی شێخانی :

هۆزی شێخانی هۆزێکی کوردیە، لەچوار پارچەی کوردستان بوونیان هەیە، ئەوەی ئـەم هۆزە لەهۆزەکانی دیکە جیادەکاتەوە ئەوەیە بنەڕەتی ئـەم هـۆزە یەزیـدین و بـاپیرانی لەسەر دینی یەزیـدی بـوون و دواتـر بـوون بـە ئیسـلام، هـەموو شـێخانیەکانی باشـوری کوردستان پاش ئەوەی موسڵمان دەبن کۆچ دەکەن بۆ (کۆیە) و لەوێوە بلاَو دەبنـەوە، لەقەزای کۆیە لەم گوندانە نیشتەجێن (بایزئاغا، ئێلخانی گەورە، بانی ماران، بانەمۆرد، نێرەگین)، تا ئێستا ڕای جیاواز هەیە لەسەر هاتنی شـێخانیەکان بـۆ (کۆیـە) و بوونیـان بەئیسلام، بەلاَم ئەوەی زیاتر باسدەکرێت ئەوەیە کاتێك سوڵتانی عوسمـانی (سـلێمانی قانوونی) لەساڵی ١٥٣٥زایـنی کاتێـك ڕوو لـەعێراق و کوردسـتان دەکـات هـەموو خـاکی سۆرانی لەمیرانی سۆران سەندەوەو خستیە سەر شـاری هـەولێر و مـیر (حوسـێن بـەگی داسـنی) کـەمیرێکی یەزیـدی بـوو کـردی بـەحاکمی ناوچـەی سـۆران، داسـنیەکان لـەم قۆناغەدا لەوپەڕی هێز و دەسەلاَت بوون، شاری کۆیە دواسنوری هەولێر دەبێـت لەگـەڵ

---

[١٦٩] سەیدا محەمەد چۆڵمەکی: ماڵپەڕی یاریکورد نێت، پەیوەندیەکانی هـۆزی چـۆڵمەکی لەکوردسـتانی باشور، ٢٠١٧ . پێداچوونەوەی ئەم بابەتە سەیدا محەمەد چۆڵمەکی .

ئەردەلآنیەکان و بابانیەکان، پاشان بەهۆی ڕاکێشانی سۆزی ئایینی کوردانی ناوچەکە میرانی سۆران کەوتنە شەڕکردن لەگەڵ یەزیدیەکان و زۆریان ئازاردان و کوشتنیان بەپێی سەرچاوەکان نزیکی پێنج سەد کوردی ئێزیدی لەم شەڕانەدا کوژراون، ناوچەی سۆران و هەولێریان لەژێر دەست دەرهێنان و (سولْتان سلێمان) بەهۆی ئەم شکستەی (حوسێن بەگی داسنی) بانگی کردە (ئیستانبوڵ) و بەهەزار ئازاردانەوە کوشتی .

هۆزی شێخانی لەگەڵ بوونی (حوسێن بەگ) بەمیری هەولێر ئەوانیش هاتوونەتە ناوچەی هەولێر بەتایبەتی کۆیە، پاش ئەوەی دەبێتە شەڕ و کوشتار ئەمان زۆربەیان بۆ پاراستنی گیانی خۆیان بوون بە ئیسلام .

ئێستا شیخانیەکان لەم شوێنانە نیشتەجێن (کۆیە، هەولێر، مەخموور، گەرمیان ، کەرکوك) لەڕۆژئاوای کوردستان لەقەزای (کۆبانیٚ، عەفرین) لەڕۆژهەلآتی کوردستان لە (پرانشار) و لەباکوری کوردستانیش هەن[١٧٠]. مارك سایکس دەڵێت: شێخان پێنج سەد خێزانن، بەتەواوی خێڵێکی کۆچەری و دەوڵەمەندن و لەنێوان ڕووباری دیجلە و هەردوو زابدا مەڕو مالآت دەلەوەڕێنن[١٧١] .

## هۆزی ئاکۆ :

دەوڵەتی حەسنەوی لەساڵی (٩٥٩)ی زاینی دامەزرا لەلایەن (حەسنەوی کوڕی حوسێن)، لەناوچەکانی ئەسەدئاباد و نەهاوەند لەناوچەی هەمەدانەوە تاکو لوڕستان و سنوری

---

١٧٠ ماڵپەڕی کوردپیدیا :هۆزی شێخانی .

١٧١ سایتی خەندان :مارك سایکس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،٢٠١٦/٥/١٦ .

ئازەربایجان و تاوەکو ناوچەکانی پشت زێی بچوك وەك ڕانیە و پشدەر و کۆیـە حـوکمی کردووە، پاش حەسنەوی بەدری کوری حوکمی کردووە پاش ئەو هیلالی کوڕی حـوکمی کردووە، لەکاتی حوکمی تاهیری کـوڕی هـیلال دەوڵـەتی بـوهیی ئـەم دەوڵەتـەی لـەنێو بردووە، شـەرەفخانی بەدلیسـی لەشـەرەفنامەدا نووسـیویەتی یـەکێك لـەکوڕانی هـیلال پاش کوشتنەکەی چووەتە نێو هۆزی ئـاکۆ و بووەتـە گـەورەی هـۆزی ئـاکۆ و حـوکمی کـردووە لەسـەدەی شـازدەیەمدا[172]. مێجـەر سـۆن لەسـاڵی (1912) لـەبارەی هـۆزی (ئاکۆ)وە دەنوسێت ئەم هۆزە نزیکـەی هەشـت سـەد و پـازدە ماڵـە دەکەونـە ناوچـەی (ڕانیە) ئەوانە لەچـەند تـیرەو تائیفەیـەك پێکهـاتوون و ئاغـایی باڵایـان نیـە و هـۆزێکی سەربەخۆن و لەچەند تیرەیەك پێك هاتوون .

تیرەکـانی هـۆزی ئـاکۆ: (باشـاغایی پێشـووتر دووسـەد مـاڵ بـوون (مـەحمود ئاغـا) سـەرۆکیان بـوون، لەڕانیـە، سـەرکەپکان، پڵنگـان، زارگـەلی، بۆکریسـکان، دۆڵەڕەقـە، میرەبەگ نیشتەجێن. باوەبییە (حاجی حەمـەدەمین) سـەرۆکیان بـوو، خەیلـە (حەمـەد ئاغـای کانـەبی) سـەرۆکیان بـوو، لەناوچـەکانی ئێنـدزە، لێـوژە، سەنگەسـەر، ڕانیـە نیشتەجێن. مەندەمەرە سەد ماڵ بوون (بـاڵۆڵ ئاغـا) سـەرۆکیان بـوو، لەمەندەمـەران، سەنگەسەر، توەسوران، ئاشوران نیشتەجێن. بۆڵی و بابۆڵی: (حاجی مۆتان) سـەرۆکی بـوو، بـۆڵی لەسەروچـاوە، حـاجی ئـاوا، ئەسـتریلان، چـوارقوڕنە، گەرمکـەداڵ، حـاجی ئۆمـەران، هـەولێر، ئـاقۆلان نیشـتەجێن. بـابۆڵی: لەناوچـەکانی هـەولێر، چـوارقڕنە، شیوەڕەش،ماوەتان ،دەرماناوا،لای خدرانی نیشتەجێ بوون. شارۆشـی: (حەمـەدەمین، حەمـەدی عـەولا) سـەرۆکیان بـوو لەناوچـەکانی سـەرگەنیەڵ، چـوارقوڕنە، دەروکـۆتر، قادرائاوا، سەنگەسەر، بـاراوە، بـێ ڕێـژ، سورەدێ، ئاشـقۆڵکە، سـینەمۆکە، کاسـکان، گونـدی شارۆشـی نیشـتەجێوون[173]. دەلاڵ: لەناوچـەکانی ڕانیـە، دەلالان نیشـتەجێن.

---

[172] کورتەباسێك لەسەر دروست بوونی هۆزی ئاکۆ: لەئەینسایکلۆپیدیای ئازادی ویکیپیدیاوە وەرگیراوە .

[173] سي. جي .ادموندز: كرد و ترك و عرب سياسة و رحلات و بحوث عن الشمال الشرقي مـن العـراق 1919 – 1925 ، ط1 ، ص 201 – 202 .

پاشـقۆتەڵی: لەناوچـەکانی ڕانیـە، پاشـقۆتەڵ نیشـتەجێن، بـیر کـۆدی: لەناوچـەکانی ڕێزێنـە، مێکۆکـە، کفـرەدۆڵ، ڕانیـە نیشـتەجێن. مخـە: لەناوچـەکانی ڕانیـە، تیتۆکـە نیشتەجێن.پیران: لەگوندەکانی پیرانان، ڕانیە، سەنگەسەر، کونەسێ نیشتەجێ بـوون، زەنگـڵ: لەناوچـەکانی زەنگـەلآن، ڕانیـە، کۆنەسـێ، سەنگەسـەر نیشـتەجێن. بنزێـری: لەناوچـەکانی گرتـك، حـاجی ئـاوا، چـوارقوڕنە، سەنگەسـەر نیشـتەجێن. مـاخۆبزن: لەناوچەکانی ماخۆبزنان، ڕانیە، سەنگەسەر، زەنگڵێن، چوارقوڕنە نیشـتەجێن، جـەلك: لەناوچەکانی جەلکان، سەنگەسەر، ڕانیە، سەرشێخان نیشتەجێن. خەیلە: لەناوچەکانی ئۆردوگای ڕانیە، سەنگەسەر، پۆڵە، ئەستێرۆکان، کۆمتان، باوتی وان نیشتەجێ بـوون. مەروان: لەناوچەکانی سڵە، دوێڵە، سەنگەسەر، ڕانیە نیشتەجێن. شارۆی: لەناوچەکانی گـولآن، مێـدێرە، بێردبـی، بەردانگـە، ناوەزینـان، دارەبـەن نیشـتەجێن. نێوکۆڵـە: لەناوچـەکانی ڕانیـە، دەلآلآن، سـەرکەپکاکان نیشـتەجێن. ڕەژیکـەری: لەناوچـەکانی بەردەڕەشـان، گنـدی، بـەردەڕەش و لەناوچـەی سورچـیدا هـەن. نـۆرە: لەناوچـەکانی گونـدی نـورێ نیشـتەجێن. دێـرێ: لەگونـدەکانی ناوچـەی دێـرێ نیشـتەجێن. سـارکە: لەگوندەکانی ناوچـەی سـارکە نیشـتەجێن. چـۆڵی: لەناوچـەکانی دوگۆمـان، چـۆلیاوە، گەرمکە نیشـتەجێن. ناودەشت (ڕەژیکـەری) چوارسـەدو پـازدە مـاڵ بـوون غـەفور ئاغـا سـەرۆکیان بـوو). سـنوری هـۆزی ئاکۆیـەتی دەسـت پێـدەکات لەشـاخی ماکۆکـەوە دەچێتەوە سەر بۆ سەروچاوە، لەوێوە دێتەوە بەردی تلێ دواتر بـۆکفردۆڵ، لەوێشـەوە درێژدەبێتەوە بۆ حاجی ئاوا ئینجا دێتەوە ڕانیەو لەوێوە سەردەکەوێ بۆ دەربەند دواتر دەچێتە سەرەوە و بۆ سەنگەسەر، دواتر دەچێتە زورکان درێژدەبێتـەوە بـەرەو شـاخی گەلآڵە، دواتر دێتەوە بۆ سەرشێخان لەوێشەوە دێتەوە پردەشاڵ، دواتر دێتـەوە زینـوێ ئەستێرۆکان دواتر دێتەوە شاخی کاروخ و دێتەوە ماکۆك[١٧٤]. هەندێك هۆزی (ئاکۆ) بـە (کۆنفیدراسیۆن) ناو دەبات وەك (ئیدمۆندز، دبلیوهای)، (عەباس عەزاوی)یش لای وایـە (ئـاکۆ) هۆزێکـە لەکۆنفیدراسـیۆنی هـۆزی (بڵبـاس) جیـا بووەتـەوە. هـۆزێکی نیمچـە

---

[١٧٤] لەئەینسایکلۆپیدیای ئازادی ویکیپیدیاوە وەرگیراوە .

کۆچەرین، ژمارەی خێزانەکانی لەناوەڕاستنی سەدەی نۆزدەهەم بەپێنج سەد خێزان خەملێنراوە. د.عیمادالدین عبدولسلام رەئوف دەڵێ: ئاکۆ هۆزێکی کوردیە لەناوچەکانی سنوری (عوسمانی، ئێرانی) دەژیان، بەتایبەتی لە (ڕانیە) و دەوروبەری، (ئاکۆیەکان) توانیان سود لەهەلومەرجی کشانەوەی (نادرشا) لە(عێراق) وەربگرن بەرەو ولاتی خۆی ،دوای ئەوەی لەعێراق سەرنەکەوت ، (ئاکۆ، بلبـاس) توانیان هەندێك لەخاکی ئێران بگرن . سەرباری ئەمانە لەنێو هۆزی ئاکۆ دوو تیرەی کۆچەری هەبوون (بۆڵی، بابۆڵی) تێکڕ (١٥٠) ڕەشماڵ بوون، هاوینان دەچونە ڕۆژهەلاتی ڕەواندز، زستانانیش مانەوەیان بەند بوو بە توانانی بە کرێگرتنی لەوەڕگای شوێنەکە [١٧٥] .







عەباس ئاغای مامند ئاکۆ — بایز ئاغای عەباس مامەند ئاغای ئاکۆ — غەفورخانی سمایل ئاغای ئاکۆ

## هۆزی ئیسماعیل عوزەیری :

ئەم هۆزە ئێستا سەربەخۆن لەجاف بەلام لەسەردەمانی کۆچەری شوێن و هەواریان لەگەڵ تیرەکانی جاف بوو، یەکێکن لەو هۆزانە پێش جاف لەشارەزوور هەبوون، بەشێك بوون لەپێکهاتەی دەسەلاتی کورد جەلالیەکان (گەلاڵیەکان) ،هەر بەڕەچەڵەکیش لە

١٧٥ سی . جی . ادموندز : کرد و ترك و عرب سیاسه و رحلات و بحوپ عن الشمال الشرقی من العراق ١٩١٩ — ١٩٢٥ ، گ١ ، ص ٢٠١ — ٢٠٢ .

گەلاڵیەکان بوون[١٧٦]. مێجەر سۆن دەڵێت: شەش سەد بنەماڵە بوون و دووسەد سوار و پێنج سەد پیادەیان هەبووە، زستانان لەو ناوچانەی دەکەونە نێوان چیاکانی دوکان و تۆکمەداغ و سەردەشت و چیای ئەسکووت نیشتەجێ دەبن، هاوینان دەگەڕێنەوە بۆ ئێران، هۆزێکی ڕێگری تەواو کۆچەرین، بەگشتی پەلاماری حکومڕانی سونی نادەن، ئۆپیراسیۆنەکانیان تەنها لەئێران سنوردار کردووە[١٧٧].ئەم هۆزە یەکێکی ترە لەهۆزە گەورەکانی کورد، وەك هەر هۆزێکی تر لە چەند تیرە و بەرەبابێك پێك هاتووە وەك : گۆمەیی، قەرەوەیسی، میرئالأیی(میرالەیی)، سمایل عوزێری[١٧٨]. تایفەی یەکەمی هۆزی عوزێری بریتیە لەسمایل عوزێری کە کوڕە گەورەی عوزێر بووە ناوی ئیسماعیل بووە کە پیاوێکی ئازاو چاونەترس و بووە سەرپەرشتیاری بنەماڵەی عوزێری کردووە، ئەم تیرەیە لەم بنەماڵەیە پێك هاتووە (بەگزادە، باوەکەی، تەمری، نەوسووری، بەگری، ئاغامرادی، سورەی) لەم بنەماڵە سەرەکیانە چەند بنەماڵەیەکی پەیدا بوون کە بریتین لەبنەماڵەی (ئەڵماس، یامرادی، باجەلان، بارامی، ئەللایەری ، مرادوەیسی، هەمیدخان (خانی)، شاوەیس). هەندێك لەپیاو ماقوڵانی سمایل عوزێری: فەیزوڵا بەگ، مەجید بەگ، عەلی بەگ، حاجی قادر بەگ، حاجی عەبدوڵای مەلا ساڵەح) ئێستا (ئەکرەم حاجی عەبدوڵای مەلاساڵەح) برا گەورەی ئەم تیرەیە. لەم گوندانە نیشتەجێن (حاجی ئاوا، گورگەدەر، زایەر، حەسەن تەپەی حەمەی حاجی عەبدوڵا، قایکەن، کانی جنە، قولەڕەیسی، کەلەکاوی، سەردارئاوا،کیلەسپی ، سلیمانەگەورە، ئەللای، کۆیك قووشقایە، هالەی حاجی ڕەشید، قاینەجا، ئاوای حەمەبارام، سوسی مەرد) .

تایفەی دووەمی هۆزی عوزێری میرالەیەکانە، ناوی ئەم تیرەیە بەناوی میرانی کوڕی عوزێرەوە هاتووە، ئەم ناوە لەمیرانەوە بووە بەمیرالەی چونکە باس لەوە دەکەن ئەم

---

[١٧٦] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ل٢٦٢ .

[١٧٧] مێجەرئی. بی .سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و نەجاتی عەبدوڵلا ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ،ل٦٠–٦١ .

[١٧٨] خسرەو جاف: س، پ ، ل٢٣٩ .

میرانە چووەتە هەر ناوچەیەك ئالآیەکی هەڵکردووە کەلەشێوەی پارچە قوماشێکی یەك ڕەنگ هۆکارەکەشی بۆپاراستنی سنوری لەوەڕگای ئاژەڵ بووە ئەم میرانە پیاوێکی وریا بووە حەزی بەدەسەلآتی ناو هۆز و عەشیرەت کردووە ئاگاداری هەموو ڕووداوەکانی ناو بنەماڵەکەی بووە. بنەماڵە سەرەکیەکانی تایفەی میرالەیی بریتیە لە(چرانی، میدەیی، سورەیی، مسانی ، قلیان ڕەش، حەکیمی). گوندەکانی تیرەی میرالەیی بریتیە لە (چەرمەگا، قازی ئاوا، کانی چنار، تەرەماری خواروو، تەرەماری ناوەڕاست، تەرەماری سەروو، بەقازان، کلاوەنان، داربەڕوو، دارتووی مەولانا، قەمەرتلی، سۆنگە، سورگا، تووەسپی، هەناران، چالگە، فوول فوولە، هالە) .

تایفەی سێیەمی هۆزی عوزێری بریتیە لەگۆمەیی ئەم تیرە نەوەی ئەحمەدی کوڕی عوزێرن، ناوەکەی لەوە هاتووە ئەحمەد پیاوێکی کەمێك چەماوە بووە کە ئەو کات بەچەماوەیان ووتووە کۆم بۆیە وردە وردە ناوەکەی دەگۆڕێت بۆ گۆمەیی، بیروڕایەکی تر هەیە کە گوایە ناوی گۆمەیی لەناوی ئاوی گۆمەوە هاتووە، کە هەمیشەماڵەکانی ئەم تیرەیە لەنزیك گۆمە ئاوەکانەوە دەواریان هەڵداوە. ئەم تیرە لەم بنەمالآنە پێك هاتووە (ڕەزایی، حەسەن مەیی، کەرەم وەیس، حوسێنی، شینەیی...) لەلایەن چەند کەسایەتیەکی ناودار بەڕێوە دەبرێن، گوندە کانیان بریتین لەگوندی (کرژە، یاران بەگی، گردەبور، حەسەن تەپەی گۆمەیی، گولیجە، گەبە، هەناران، پیرکە، قالاوە، گۆمەیی، چەورگە، خەلیفاوا، قرخ، سەنگاو) .

تایفەی چوارەمی هۆزی عوزێری بریتیە لەقەرەوەیسی: کە کوڕی چوارەمی عوزێرەو ناوی (وەیس) بوو، ئەم پیاوە پیاوێکی ڕەش ئەسمەر بووە کە ئەو کات بە ڕەشیان وتووە قەرە، هەر بۆیە لەناو خەڵکدا بە قەرەویس ناسراوە، لەدوای خۆی ئەم ناوە وون نەبووە ئیتر نەوەکانی هەر بەوناوە ناویان دەرکردووە و بلآو بوونەتەوە تابوون بە تائیفەیەکی گەورە. ئێستا قەرەوەیس لەم بنەمالآنە پێکهاتووە (خاتری، بچیلی، حەمەرەقی، جوبرائیلی، ئیلی، باوەیسی، جەژنی، کتە، باسام، فەتاحی، هەمیر، نەغالی). ئەم تیرەیە چەندین پیاوی گەورەی تێدا هەڵکەوتووە، ئێستا سدیقی حاجی

شەریف براگەورەی ئەم تیرەیە . گوندەکانی قەرەوەیسی بریتین لە(چالاخ، کەلەباش، باوەمەنان، کەنەشین، خوردە لووك، کانی میران، موغاغ، سوسی کۆن، شێخ زەینەڵ، پیرانی نزیك قەرەچەتان، کیلەشین لەبانە، کەنەسورە، بازەگیر، شەمساوە، ووزمەلە، میرەدێ، میرگە نەخشینە، گویزێ، شێخ چۆمان، گولولەی سەروو، کەلەسورەی ئێران، قەرەویسی بانی مەقان، سووسی سەروو ،پیرکەی دۆلە ڕووت، میرگەپان، ئەحماوا)[١٧٩] .

ئەم تیرە وەك تیرەکانی هۆزی جاف پێشتر ژیانێکی کۆچەرییان هەبووە لەگەڵ تیرەکانی هۆزی جاف گەرمیان و کوێستانیان کردووە، زۆرتر لەگەڵ تیرەکانی مکەیاڵی نزیك و تێکەڵاو بوونە و لەڕێچکەی ئەوانەوە هاتووچۆیان کردووە لەکوێستاندا هەوارگەو لەوەڕگای تایبەتمەندی خۆیان هەبووە و لەڕێچکەی نەکەروزان، کەلی خان، پیرهۆران، خۆیان گەیاندۆتە کوێستان و لەنێوان شاری سەقز و بانەدا هەواریان خستووە . لەکوردستانی باشوریشدا ناوچە و دەڤەری تایبەت بەخۆیان هەیە و زۆرتر لەپارێزگای سلێمانی دان، بەتایبەت لە(چەمچەماڵ، سورداش) نیشتەجێن[١٨٠] . کەریم بەگی جاف دەڵێت: ئەم هۆزە سەد ساڵ دەبێت لەجاف جیابوونەتەوە، لەکاروباری عەشایەری خۆیاندا تەواو سەربەخۆن، ئەم هۆزە لەجوانڕۆوە نەهاتوون شوێنی نیشتەجێ بوونیان هەر باشوری کوردستان بووە[١٨١] .









حەسەن جاف: ئەگاوێتی نیل بەگی جاف .

**هۆزی نورەدینی** :

پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پشدەر ئەوەی لەبارەی دیاریکردنی بنەچە و دانیشتوان و پۆلێنی هۆزایەتی بێت، تا ڕادەیەك ئالۆزە هەم ناویان هەم پێشینەی هۆزەکان و ڕەچەڵەکیان و نیشتەجێ بوونیان لەوێ بیروڕایی جیاجیای لێکەوتۆتەوە و یەکلایکردنەوەی تا ڕادەیەك زەحمەتە .

هۆزی نورەدینی لەدانیشتوانی ڕەسەن و دێرینی ناوچەی پشدەرە، هەرچەندە نورەدین لەبناری پشدەر ناوی گوندێکە بەلام بۆ خۆیی هۆزێکە، لەناحیەی (هەڵشۆ ، هێرۆ، ئیسێوەن) نیشتەجێن گوندەکانی (ئەشکەنە، باوزە،بێناسە، بێگەلاس، قەندۆڵ، گەناو) بەشی هەر زۆریان نورەدینین، لەگەڵ چەندین گوندی دیکە هەر لەناوچەی پشدەر. نورەدینیەکان دانیشتوانی سەرەکی و ڕەسەنی پشدەرن و خاوەنی زەوی زاری خۆیانن ، وێڕای ئەو گوندانە باسکران لەقەلادزێ و گوندەکانی لێواری زێی بچوك نیشتەجێن، پێشووتر (هەزار و شەش سەد خێزان) بوون .

هەندێك پێی وایە میراودەلی هۆز نیە بەڵکو بنەماڵەیەکە پشتاوپشت حکومڕانی هۆزەکەیانی کردووە[١٨٢] .

---

[١٨٢] گۆڤاری سەنتەری برایەتی : ژمارە ٢٦ ،هەولێر ،٢٠٠٢ .

## هۆزی میراودەلی :

سەرانی میراودەلی وەکوخۆیان وتیانە، نەوەی(میرئاودەلی کوڕی فـەقێ ئەحمـەدی دارەشمانـەن) دارەشمانـە گوندێکـە لەناوچـەی پشـدەر[*١٨٣] ، شـوێنی نیشـتەجێ بـوونی فەقێ ئەحمەد بووە، فەقێ ئەحمەد باپیرە گەورەی بنەماڵەی پاشـاومیرو بـەگزادەکانی بابان بووە، قسەی خێڵەکان لەسـەر ڕەچـەڵەکی خۆیـان بۆئـەوەی خانـەدانی خۆیـان و ڕەوایـەتی دەسـەلاتەکەیان بسـەلمێنن، زۆر جـار تێکـەڵاوە بەچـیرۆکی هەڵبەسـتراو، لەبەرئەوە زۆرجێگەی باوەڕ نین بەتایبەتی ئەگـەر هـیچ بەڵگەیـەکی نوسـراوی مێـژوویی قسەکە پشتڕاست نەکاتەوە. میراودەلی وەکو بنەماڵەیەکی ناسـراو یـان وەکـو خێڵێکـی بەهێز پێ ئەچێ تازەبێ، لەشەرەفنامەدا (١٠٠٥ك/١٥٩٦ز)باسی نەکراوە، تەنانـەت ئـەو ساڵەش (١٨٢٠) کە ریچ سەردانی کوردستانی کردووە ناوی نەبووە، ڕیـچ لەگەشـتەکەی دا گفتوگۆیەکی درێژی لەگەڵ پیرەمێردێك کـردووە کـە لەگونـدی دارەشمانـەوە هاتۆتـە سلێمانی و لەهەمان بنەماڵەی میرەکانی بابان بـووە، لـەزمانی ئـەوەوە چـیرۆکی فـەقێ ئەحمەدو کەیخانی تۆمارکردووە، ئەم پیـاوە نـەناوی میرئـاودەلی هێنـاوە وەك نـەوەی فەقێ ئەحمەد و نەباسی هۆزی میرئاودەلی کردووە وەکو تیرەو هۆز، ڕیچ خۆیشی بەناو و بەژمارە باسی خێڵە ڕەوەند و گوندنیشـینەکانی قەڵـەمڕەوی بابـانی نوسـیووە بـەلاّم ناوی بنەماڵە،تیرە، یا هۆزێکی بـەناوی میراودەلیـەوە نەنوسـیوو، بـەڵکو لـەڕیزی خێڵـە نیشتەجێ و سەقامگیرەکان لەناوچەی پشدەردا باسی هۆزی سەکرو نورەدینی کردووەو دەڵێـت: ئـەم دوو هـۆزە نزیکـەی (١٠٠) گونـدیان دەبێـت و دەشـتوانن نزیکـەی هـەزار کەسێك چەکدار بکەن. ئیدمۆندس حـاکمی سیاسـی دەسـەلاّتی داگیرکـەری ئینگلیـز لـە

---

*[١٨٣] پێویستەئاماژەبۆئەوە بکـەین، کەپشدەرناوچـەیەکی جوگرافیـە، نـەك شـوێنی هۆزێـك. چـونکە پشدەرتەنها بریتی نیە لەشوێنی هۆزێك (پشدەر) کەمەبەسـت لێـی (میراودەلـی، نـورەدینی هـتر...)ە یـەکێکن لەبـەهێزترین هۆزەکـانی باشـوری کوردسـتان، لەبنەڕەتـدا نێـوی (نـورەدینی) یـە، نازنـاوی بنەماڵەی حکومڕان تیاید ا(میراودەلی)یە، کە دەسەلاّتێکی ڕەهای بێڕکابەری بەسەر تێکڕای هۆزەکـە هەبووە .

سلێمانی (١٩١٩–١٩٢٠) کە تێکەڵاوی بووە لەگەڵ سەرانی میراودەلی لەزمانی خۆیانەوە ئەگێڕێتەوە کە بنەماڵەی میراودەلی هەموویان لەحەمەئاغای گەورە کەوتوونەتەوە، ڕەنگە ئەم گێڕانەوەیە لەچیرۆکەکانی کەزیاتر جێگەی باوەڕبێ بەتایبەتی درەختی بنەماڵەکەیان زۆر دورودرێن نیە، ئەوانەی قسەیان بۆکردووە هێشتا ناوی باپیرەکانی خۆیان لەبیربووە[١٨٤]. هەندێ پێیان وایە میراودەلی هۆز نیە، یەکێك لەبۆچوونەکان پێیوایە، کە میراودەلیەکان لەبنەڕەتدا خەڵکی ناوچەی (جزیرەی بۆتان)ن و لەسەردەمێکی مێژووی هاتوون بەرەو ناوچەی هەولێرو بەشێکیان لەوێ نیشتەجێ بوون، بەهۆزی گەردی ناسراون، ئەوانەی هاتوونەتە ناوچەی پشدەرو بوونەتە دوو بەش بەشێکیان چوونەتە سنوری ئێران ولەناوچەی بۆکان بەناوی هۆزی (فیزولاَبەگی) ناسراون، ئەوانەیشی لەپشدەر ماونەتەوە بەمیراودەلی ناسراون، بەلاَم بۆچوونەکان کۆکن لەسەرئەوەی هۆزی (میراودەلی) لەپشتی (حەمەئاغای گەورە)ن، کە ژمارەیەکی زۆرژنی هێناوەلە ناوچەی پشدەر (١٦–١٧) کوڕی هەبووە، ئەوکوڕانەش بەپێ بەرە دایك ناویان براوە و بەرەباب (تایفە) ئەگەردوویان سێیان لەیەك دایك بوونایە ئەوا بەناوی براگەورەکەیانەوە ناویان بردوون، کەسەرجەمیان هەشت تایفەن[١٨٥].ئەو هەشت تایفە کە لەهەشت کوڕەکانی (حەمەئاغا)ن هەر یەکەیان لەیەکێ لەهاوسەرەکانی بووە، خێزانێکی ناوکیان پێکهێناوە، ئەویش پەرەی سەندووەو خێزانێکی فراوانی پێك هێناوە، ئەویش پەرەی سەندووە بەرەبابێکی جیاواز لەوانی کەی پێك هێناوە، ئەو بەرەبابانەی بەناوی کوڕەکانی حەمەئاغاوە ناوی دەرکردووە بریتی بوون لەتایفەی :(بابەکر ئاغایی، مەحمود ئاغایی، ئەحمەدئاغایی، ڕەسوڵ ئاغایی، عەلی ئاغایی، ئۆمەرئاغایی، هەباس ئاغایی،بەگزادە) ئەندامانی بنەماڵەی میراودەلی دەسەلاَتداربن یان بێ دەسەلاَت بن، دەوڵەمەندبن یان هەژار، بەگشتی

---

[١٨٤] نەوشێروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی، چ١ ، کتێبی یەکەم، بەرگی دووەم ، ٢٠١٥ ،ل١٤٩–١٥٠.

[١٨٥] دارا تۆفیق کاکەمین: ناوچەی پشدەر لەسەری پاشایەتیدا ، چ١ ،٢٠١١ ،ل ٥٩–٦١ .

نازناوی ئاغایان بەمیرات لەباوکیانەوە بۆ ماوەتەوە، لەبەرامبەردا دانیشتوانی ناوچەکە سەرەڕای جیاوازی تیرەو هۆز و خێڵەکانیان بەمسکێن ژماردووە، خۆیان لەدانیشتوانی ئاسایی بە خانەدانتر و لەپلەی کۆمەڵایەتی دا بەبەرزتر داناوە، میراودەلی پەیڕەوی نەریتی هاوسەرگیری ناوخۆیی کردووە، لەناو خۆیاندا ژن و ژنخوازیان کردووە، ژنیان نەداوە بەدەرەوەی میراودەلی، لەناو ئاغاکان دا مارەکردنی ئافرەت و گوێزرانەوەی بۆ ماڵی زاوا لەهەمان ڕۆژدا ڕوی داوە. میراودەلی کەهەشت بەرەباب بوون، ئەوەی یەکێکیان سەرۆکایەتی هەموویانی کردووە، ڕایەڵەی خزمایەتی—هاوخوێنی بەیەکەوەی بەستوون، بەلاّم ڕایەڵەی پەیوەندی دەرەبەگی—زەوی سەپاندنی بەسەردانیشتوانی ناوچەکەدا، ڕێکخراوەیەکی دەرەبەگی پتەویان هەبووە، کەخاوەنی زیندان و هێزی چەکداری تایبەت و دەسەلاّتی عورفی بکوژ و ببڕی یەکلایکەرەوی ناکۆکی و کێشەکانی بووە. ئاغاکان بەدێهاتەکان دا بلاّو بوونەتەوە، هەریەکەیان چووەتە دێیەك دانیشتووە، ئەگەر زۆربچوکیش بووبێ دەستی بەسەردا گرتووە، جوتیارەکانی هێناوەتە ژێر باری فەرمانبەریەوە، بەمجۆرە هۆزەکانی نورەدینی لەقەلاّدزەو شیلانەیی لەبەری مەرگە و شینکی لەماوەت و سوێسنی یان لەسەردەشت هێناوەتە ژێردەستی خۆیان ودەستیان گرتووە بەسەر گوندەکانی پشدەر، مەرگە، ماوەت، ئالان، سیوەیل و شارباژێڕدا، میراودەلی دامودەزگایەکی جەنگی کارای دامەزراندووە، نۆکەر و خزمەتکار و پیاوەکانی لەناو مسکێنەکان دا هەڵبژاردووە، لەگەڵ زۆر لەهۆزەکانی ناوچەکەدا جەنگاوە، پەیوەندی نێوان ئاغای میراودەلی و مسکێنی پشدەری (نورەدینی، شیلانەیی، ئالانی، سیوەیلی، ماوەتی، شارباژێڕی و تەنانەت هەندێ گوندی مەنگوڕ و مامەش و پیرانی ژێر دەستی ئەوان) ڕەچەڵەکی هاوبەش یاخزمایەتی هاوخوێنی نەبووە، بەڵکو پەیوەندی نێوان ئاغاو مسکێن لەسەر بنچینەی زەویداری بووە، ئاغا بە داگیرکردن یان کڕین بووەتە خاوەنی گوندەکە، مسکێن بەخۆشی بووبێ یان بەزۆر لەزەوی ئاغادا کاری کردووە. دانیشتوانی قەڵەمڕەوی میراودەلی دابەش بوون بەسەر دووچینی سەرەکی دا: چینی ئاغا کەپێی خەملاّندنی سەرچاوەیەکی ئاگادار لەساڵی (١٩٣٩) بەهەموویان دوو

سەد و هەشتا خێزان بوون لەکاتێکدا چینی مسکێن*[١٨٦] بەپێی هەمان سەرچاوە شەش هەزار حەوت سەد و پەنجا خێزان بوون. بەڵام قانوونی ئیسلاحی زەراعی و بەهێز بوونی داموودەزگاکانی حکومەت و پەرەسەندنی چالاکی سیاسی (حزبی شیوعی عێراق وپارتی دیموکارتی کوردستان) دەسەلاتی ئاغاکانی میراودەلی لەقاند لەبەرامبەردا هۆزەکانی (نورەدینی، شیلانەیی ، شینکی، ئالانی، سیوەیلی، شارباژێڕی) لەدەسەلاتی ئاغاکان یاخی بوون و چیتر وەك جاران نە ئەمان گوێڕایەڵی یان ئەکردن و نە ئەوان ئەیان توانی وەکوجاران ئەمان بچەوسێننەوە، بەدەست پێکردنی شۆڕشی ئەیلول لە (١٩٦١)دا سەرەتای قۆناغێکی نوێ لەپەیوەندی نێوان ئاغاکانی میراودەلی و مسکێنەکان پشدەر دا دەستی پێ کرد، هۆزی میراودەلی لەزۆری دەسەلاتەکانی ڕوت کردەوەو بەڵکو بەگشتی دابڕیون لەکۆمەڵگای پشدەری، ئەوڕێکخراوە دەرەکیە پتەوەی سالأنێکی دوورودرێژ حوکمی ناوچەیان پێکرد لەبەریەك هەڵوەشاوە[(١٨٧)].

## هۆزی لەیلانی :

مەیجەر سۆن دەڵێت: لەیلانی هۆزێکی کشتوکاڵکاری بێوەی بوون، نزیکی پێنج سەد ماڵ بوون، سەد ئەسپ و چوارسەد پیادە بوون، زۆریان لەگوندی لەیلان نیشتەجێ بوون، گوندەکە لای باکوریەوە جۆباری لەیلانە، باشوری زەوی و زارەکانی تاڵەبانە، ڕۆژهەلات زەوی و زارەکانی هەمەوەند، ڕۆژئاوایی حەسەن قولی تەپەو سەرج داغ، بە

---

[١٨٦] * ئەمین زەکی لەتەعریفی مسکێن دا نوسیوێتی: مسکێن ئەم ناوەی کەبۆ بەشی گەورەی پشدەر یا بەڕاستی بۆهەمووپشدەر دانراوە، ئەمەش باش حالیمان ئەکات کە ئەم بەشە ڕەعیەتی ئاغاواتن و بەگوێرەی قابیلەت وقوەتیان ئیدارەئەکرێن ،ئەم چەوساندنەوە سەختە رق و قینێکی قوڵی لەدەرونی مسکێنەکان ونەوەکانیان خولقاندووە تا ئێستایش گاریگەری ماوە لەسەر پەیوەندی کۆمەلأیەتی، سیاسی ،ئابوری نێوان ئاغایانی میراودەلی و دانیشتوانی پشدەر .

[١٨٧] نەوشێروان مستەفا ئەمین : بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی،ل١٥٠-١٥١.

ژن و ژنخوازی لەگەڵ هۆزی هەمەوەند تێکەڵ بوون، ژنەکانیان بەجوانی و بەژن و باڵایانەوە بەناوبانگ بوون[(١٨٨)] .

## هۆزی هورمزیار:

هورمزیار بریتی بوو لەکۆمەڵە هۆزێکی زەردەشتی لەناوچەکانی ماکۆ و سنوری ئەرمینیا و بایەزید. هاوسێی هۆزی گەلاڵی(جەلالی) بوون بەرلەوەی ببن بەئیسلام هەریەکیان ناوێکیان هەبوو، دوای ئەوەی دەبن بەئیسلام بەهەموویان دەڵێن هورمزیار واتا پێڕەوانی خودا، لەدوای لێکۆلینەوە ڕوون بووەتەوە لەساڵی ١٥١٤زاینی لەدوای هەڵگیرساندنی شەڕ لەنێوان عوسمانی و سەفەوی لەشەڕی چاڵدێران لەگەڵ بەشێك لەهۆزی گەلاڵی و چەند هۆزێکی تر بۆ خۆراسان گواسترانەوە. بەشێکیان ئاوارەی کوردستانی ئێران و کوردستانی تورکیا بوون. ئەوانەی ئاوارەی کوردستانی ئێران بوون لەناوچەکانی بۆکان، میاندوا، سەقز، دیواندەرە، ناوچەکانی نێوان قەسری شیرین و ئیلام نیشتەجێ بوون. ئەوانەی کەوتنە کوردستانی تورکیا بەپەرت و بڵاوی لە ناوچەکانی ئورفە، دیلۆك(غازی تەپە) نیشتەجێ بوون و توانەوە لەنێو هۆزەکانی دیکە. ئەوانەی لەناوچەکانی سنە، سەقز، دیواندەرە نیشتەجێ بوون بوونە سونە. ئەوانەی چوونە ئیلام، بەدرە، جەسان بوونە شیعە. زیاد لە(٣٥٠)ساڵ دەبێت بەشێکیان قۆناغ بەقۆناغ لەڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتوونەتە ناوچەکانی باکوری خانەقین، قەزای

---

[١٨٨] مێجەرئی .بی . سۆن : چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو ،و نەجاتی عەبدوڵلا ، چ١، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ، ل٧٥.

لەیلان: ئێستا شارەدێیەکە دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی شاری کەرکوك بەدووری ٢٥کیلۆمەتر، شارە دێیەکە ٥٢گوند لەخۆدەگرێت، حەوت گوندی عەرەب نشین و شەش گوندی تورکمان و سی و نۆ گوندی کورد نیشینە، لەساڵی ١٩٧٥ شارەدێکە دووجار کەوتۆتە بەرشاڵاوی ڕاگواستنی کوردەکان، لەدوای ساڵی ٢٠٠٣ەوە زەوییەکان گەڕانەوە بۆ خاوەنە ڕەسەنەکانیان .

کفری، بتوێن، دەشتی دزەیی، گوندی تۆپزاوەی کەرکوک، تیرەیەک لەم تیرانە لەنێو ڕەگەزی تورکمانی توانەوە و بەزمانی تورکمانی قسەدەکەن و پێیان دەڵێن (هورمزی) . هەروەها بەشێوەی ماڵ و دووماڵ و گوند و دووگوند لەزۆربەی ناوچەکانی باشوری کوردستان دەبینرێن وەك (سلێمانی، ڕانیە، شەبەکستان(ئامدان)، ژمارەیەکیان لە ناوچەکانی قەزای کفری و زنجیرە چیای حەمریندان لەبۆتەی ڕەگەزی عەرەبتواونەتەوە. هورمزیارەکانی ئێران دوو تیرەن: هورمزیاری زێڕینە و هورمزیاری دەردەسەر هەروەها وەرمزیاریشیان پێ دەڵێن. بەشێك لەهورمزیارەکان لەگەڵ هۆزی گەڵباخی دەژین .

هورمزیارەکانی دەشتی هەولێر: هورمزیار لەدەشتی دزەیی لەچەند تیرەیەك پێکهاتووە و لەهۆزە کۆنەکانی ناوچەکە دەژمێردرێن، بەلاّم نازانن لەکوێوە دەگەنەوە بەیەکتر، هەندێکیان پێش (١٥٠)ساڵ لەبتوێنەوە هاتوون. کۆنترین هەواری هورمزیار لەدەشتی هەولێر گوندی (قورشاغلوو، سۆربەش، میراوە، سمایلاوە) بووە[١٨٩] .

## هۆزی فەیزولاّبەگی :

ئەم هۆزەی کورد لەناوچەی مەهاباد و سەقزدان، لەڕۆژهەلاّتی هۆزی دیبوکریەوە، هۆزێکی قارەمانن یارمەتی کۆماری کوردستانیان داوە، زنجیرەی باوانی فەیزولاّبەگی بە چەند پشتێك دەگەنەوە بە (میر ئەبداڵ) کە سەرۆکی هۆزی نورەدینی پشدەر بوو[١٩٠] .

---

[١٨٩] ئازاد سەلیم: مێژووی هورمزیار، ٢٠١٦، تۆڕی کۆمەلاّیەتی فەیس بووك .

[١٩٠] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٦٢ .

## هۆزی زڕگوش :

زڕگوش یەکێکە لەگەورەترین هۆزی کوردی شیعە مەزهەب، دانیشتووی سنوری پارێزگای دیالەن، بەزۆری لەناحیەی سەعدیە نیشتەجێن، ئەحمەد زڕگۆشی کە بەڕێوەبەری ناحیەی سەعدیە سەرۆکی ئەم هۆزەیە، هەستی نەتەوایەتیان بەرزە، ئەم هۆزە ڕژێمی بەعس فەرامۆشی کردوو بوون، دواتر قائیدە بە بەردەمی قەتلّ و عامی کردوون، ئێستاش لەلایەن حوکمی عێراق بە بەردەوامی فەرامۆش دەکرێن، هەر بەهۆی ئەوەوە ئەم هۆزە پشتگیری ڕیفراندۆمی هەرێمی کوردستانیان کرد بۆسەربەخۆی کوردستان لە٢٠١٧/٩/٢٥، گەڕانەوەیان بۆسەر کوردستان ئاواتیانە[(١٩١)] .

## بنەماڵەی تلیشانی :

مەیجەر سۆن دەڵێت: بنچینەی بنەماڵەکە دەگەڕێتەوە بۆ (سەید عومەر ئاغا) کە لەساڵی (١٨٠٠)ی زاینی لەتلیشان جێگر بووە، نزیکی پەنجا ماڵ ئەبوون، سەرۆکیان (سەید موحسین ئاغا) بوو. تاساڵی (١٩١٦)زاینی سەرۆکەکەیان (سەید عوسمان ئاغا)

[١٩١] سەبری هۆرێنی: هۆزی زڕگوش، سایتی وشە، ٢٠١٧/٩/١٧ .

بوو کەکچی (مەجید پاشا)ی بابانی کفری هێنا بوو، دواتر بەدەستی تورکەکان کوژرا، بنەماڵەکە سونیەکی تۆخن و بەدیالێکتی کرمانجی خواروو قسە دەکەن[١٩٢] .

## هۆزی خدربەگی :

خدربەگی هۆزێکی کوردن دەچنەوە سەر (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) یەکێ لە کوڕەکانی (خدربەگ) بەناوی (میر ئەحمەد بەگ) هاتۆتە ناوچەی شارەزوور، گوندێکی بەناوی (میرەدێ) ئاوەدانکردۆتەوە، خدربەگیەکان دوو بەرەبابی سەرەکی پێك دێن بەم ناوانە: ١– بنەماڵەی ڕۆستەم بەگی ٢– بنەماڵەی حاجی بەگی . خدربەگی گەرمیان و کوێستانیان نەکردووە، هەر لەسەرەتاوە لەگوندەکانی (میرەدێ، قلیجە)دا نیشتەجێ بوون، هەندێکیشیان کەسەر بە بەرەبابی (میرانبەگی) بوون لەناوچەی (نەورۆڵی) ژیاون، چەند خێزانێکیشیان هەر لەسەرەتای ئاوەدانکرد نەوەی (سلێمانی)تێدا نیشتەجێ بوون، هەندێکیشیان لەگوندی (موغاغ)ی ناوچەی (سورداش) و لەگوندی (نەوتی قەرەداغ) و لە(ڕانیە، قەلآدزێ ،مەرگە) نیشتەجێن. ژمارەیەکی زۆریشیان لەناوچەکانی (بەرواری بالآ)، لە(شەمزینان)ی باکوری کوردستان نیشتەجێن، چەند گوندێکیان ئاوەدانکردۆتەوە یەکێك لەگوندەکانیان ناوی (شارەزوور)ە. بەرەبابی خدربەگی هەریەکیان ڕیشسپی و پیاوماقوڵی خۆی هەیە، بەڵام هەموویان لەناو خۆیاندا بنەماڵەی (ڕۆستەم بەگی)یان بەڕیش سپی خۆیان قبوڵکردووە و گوێڕایەڵیان بوون.

---

[١٩٢] مێجەرئی .بی .سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو،و نەجاتی عەبدوڵلآ،چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ، ل٨٩ .

سەرچاوەی بژێویان کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بووە، هەندێکیان سەرقاڵی کاسپی و کاروباری دەوڵەتین، بەشێوەیەکی گشتی باری ژیان و گوزەرانیان باشە[١٩٣] .

## هۆزی ئەترووشی :

ئەترووش هۆزێکی گەورەی کورد و فرەلقی ناوچەی بادینانە، (مارك سایکس) ئەترووشی وەك هۆزێکی ئێجگار گرنگ ناوزەند کردووە، بۆچونی وابووە ڕۆژێك دادێت لێکۆڵینەوەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن کەئەترووش ئەو ئەلقە ونەیە کە کوردی عێراق بە کوردی ئەرمینیا دەبەستێتەوە، ناوچەکانی نیشتەجێ بوونیان لەباشوری دەریاچەی وانەوە تا زاخۆ و دەهۆك دەگرێتەوە. ئەترووش هەندێ لەلقەکانی کۆچەری و هەندێکیان نیشتەجێ بووبوون، مارك سایکس بەم شێوە خەملاندوونی:

شەرەفان: سێ هەزار خێزانن، گەورەترین پێکهاتەی ئەترووشین، بەهاران تا باشوری ئاکرێ دەچوون .

هەفجان: پێنج سەد خێزان بوون .

مام کور: چوارسەد خێزان بوون .

گەودان: سێ سەد خێزان بوون، ڕەشماڵەکانیان نزیك زاخۆ هەڵدەدا .

زەفکی سەد و پەنجا خێزان بوون .

هەرچی لقە نیشتەجێکانێتی پێکهاتوو بوون لە :

میرزیکی: نۆسەد خێزان بوون، لەنزیك (باش قەلاّ) نیشتەجێ بوون .

---

[١٩٣] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٨٤–٨٥ .

مامەد(مامەند): دووسەد خێزان بوون .

بیروز: شەست خێزان بوون، ئەمانە بە تووتن چاندن بەناوبانگ بوون .

مام ڕەش: دووسەد خێزان بوون، هەڵگری بیروباوەڕی یەزیدی بوون، لەگەڵ تیرەکانی (جرکی، ئالان، شیدان). لەراپۆرتی کۆمیتەی کۆمەڵەی گەلاندا کەتایبەت بوو بەچارەسەرکردنی کێشەی ویلایەتی موسڵ لە(١٩٢٤-١٩٢٥) وەك (یەکێتی ئەترووش)ی ئاماژەی بۆکردوون و سەرجەم لقە کۆچەریەکانی ناو هێناوە[١٩٤]. مەردۆخی دەڵێت هەموویان بەسەر یەکەوە چوار هەزار خێزان ئەبوون[١٩٥] .

## هۆزی میلان :

هۆزێکی کوردن لەناوچەیەکی پان و بەرینی کوردستانن، کە لەشاری خۆیی تا شاری ماکۆ دەگرێتەوە،بەپێی گێڕانەوەکان زیلان و میلان ناوی دووبرا بووە، هەریەك لەوانە دوو هۆزی زیلان و میلانیان پێك هێناوە، ژمارەیەکی زۆری هۆزی میلان لەسەردەمی نادرشای ئەفشار کۆچیان پێکراوە بۆ خۆراسان، لەوێ هۆزی میلانوو و شێخکانلوویان پێکهێناوە، شێخکانلوو گەورەترین هۆزی خۆراسانە کە لەشارەکانی (قوچان، مەشهەد،

[١٩٤] خالد مەحمود کریم: س ،پ ،ل١٤١-١٤٢ .

[١٩٥] محەمەد مەردۆخی: مێژووی کورد و کوردستان، س ، پ ، ل١٢٣ .

دەرەگەز، ئەسفەرایەن، چناران) نیشتەجێن[196]. ئەم هۆزەی کورد بەزمانی کوردی کرمانجی قسەدەکەن[197].

## هۆزی سورەمێری :

هۆزێکی نیشتەجێی بێوەیی و باشترین و شارەزاترین هۆزی کشتوکاڵکار بوون، پێکهاتوو بوون لە(٢٢٥) خێزان، لقەکانی بریتی بوون لەتوتك، عەنتەر، عەینە، مامەجان، کەڵهوڕی. هۆزەکە نزیکی سەد ساڵ لەمەوپێش مەیجەر سۆن ئەو کات ئەو قسەیە دەکات ساڵی (١٩١٧) بووە دەڵێت: لەهولێلانەوە هاتوونەتە زەهاوە، لەبنەچەدا لوڕن. سەرۆکیان محەمەد بەگ کوڕی باباخان بووە. ناوچەی جوگرافی ئەم هۆزە بەم شێوەیە بوو: لقەکانی عەنتەر لەنێوان شارەبان و ئەبوجیسرەدا نیشتەجێ بوون، ئەوانی دی تێکڕا لەگوندەکانی دەوروبەری خانەقین دەژیان[198].

---

[196] محەمەد عارف تەبەد: گەشتێك بەرەو کوردستانی ئێران شاری مێژووی خۆی، ماڵپەڕی جام کوردی ، ٢٠١٨/٣/٥ .

[197] ماڵپەڕی ویکیپیدیای فارسی .

[198] مێجەرئی. بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، س ،پ ، ل٨٣ .

## هۆزی دزەیی :

مێژووی دزەیەکان بۆ چوارسەد ساڵ لەمەوپێش دەگەڕێتەوە، ناوەکەیان لەگوندی دزێی ناوچەی (ورمێ)وە هاتووە، د.ئەحمەد دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین دەڵێت لەسەرەتادا ئەوان بنەماڵەیەك بوون، بەڵام دواتر بەهۆی زۆر بوونی ژمارەیان لەئێستادا وەك هۆز دەناسرێن.

بەهۆی کێشەیەك لەنێوان سێ کوڕی ئەو بنەماڵەیە لەسەردەمی ڕابردوودا کەسێ برا دەبن، ئەوانیش قەرەنی ئاغا و عیسا ئاغا و پیرداود ئاغان، ئێستا ئەو هۆزە بەشێکیان لەدەشتی دزەییاتی پارێزگای هەولێر نیشتەجێن کە لەنەوەی قەرەنی ئاغان، بەشی دووەمیان کەبنەماڵەی عیسا ئاغان لەسلێمانی نیشتەجێن و پێیان دەڵێن ئاغای گەورە، بەشی سێیەمیان کەبنەماڵەی پیرداود ئاغایە ڕوودەکەنە ناوچەی جەزیرەی بۆتان لەباکوری کوردستان لەوێ نازناوی هەرتووشی یان وەرگرتووە .

قەرەنی ئاغا سەرداری دزەیی لەدوای ناکۆکی لەگەڵ براکانی لەسەدەی هەژدەی زاینی ڕوودەکاتە پارێزگای هەولێر، قەرەنی ئاغا پیاوێکی ئازا و ژیر بووە، لەماوەیەکی کورتدا دەبێتە خاوەن زەویەکی زۆری کشتوکاڵ و ئاژەڵی زۆر، چوار کوڕی بووە بەناوی (مەحمود، ئیبراهیم، خولە، مام زێندین)، توانیویەتی هەریەك لەکوڕەکانی لەشوێنێك جێگر بکات، بیانکات بەئاغای شوێنەکە و دەستیان بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات کردووە، پاش کۆچی دوای قەرەنی ئاغا، مەحمود ئاغای کوڕی سەرۆکایەتی دزەیەکانی کردووە، لەدوای نزیکەی سەدەیەك بوون بەهۆزێکی گەورە لەناوچەکە و لەوالی بەغداد هەڵگەڕانەوە و باجی ساڵانەیان نەدا، بۆیە عوسمانیەکان لەساڵی ١٨٣٧ بەداود پاشای والی بەغدادیان ڕاگەیاند کەمەحمود پاشای بابان ڕاسپێرێت لەشکربنرێتە سەر دزەیەکان، دەست بەسەر بەروبووم و مەڕوماڵاتیاندا بگرن، بۆ ئەم مەبەستە مەحمود

پاشـای بابـان لەشـکرێکی پێـنج سـەد کەسـی کۆدەکاتـەوە و بـەرەو هـەولێر دەچـن، هەرچەندە دزەیەکان ژمارەی لەشکرەکەیان زۆر لەبابانیەکان کەمتر دەبێت، بەڵام لەبەر پاراستنی سەر وماڵیان شەڕێکی مـان و نـەمان دەکـەن، کاوێسـی کـوڕی مـەلای کـوڕی مەحمود ئاغا و ڕەحمان کوڕی کاکەخان مەحمود ئاغا سەرۆکایەتی لەشکری دزەیـەکان دەکەن، دوای شەڕێکی قورس لەئەنجامدا لەشـکری بابـان دەشـکێت و نـەیانتوانی هـیچ لەگـەڵ خۆیـان بـەرەن، بـەم جـۆرە دزەیـەکان سـنوریان فـراوانتر دەبێـت و زۆربـەی گونـدەکانی باشـوری هـەولێر دەگرێتـەوە و لەهـەر گونـدێك نەوەیـەکی قـەرەنی ئاغـا دادەنـێن وەك ئاغـای گوندەکـە، ئـەو ناوچـەیە تـا ماوەیـەکی زۆر بەدەشـتی دزەییـاتی بەناوبانگ دەبێت، تا لەدەیەی شەستەکانی سەدەی بیستەم ناوی ناوچەکە بـۆ دەشـتی هەولێر دەگۆڕێت. دزەیەکانی پارێزگای هەولێر لەهەشت بەرەباب پێکهاتووە هـەموویان لەنەوەی قەرەنی ئاغان بەرەبابەکان بریتین لەبەرەبابی بایز، پاشا، فـارس، کاکـەخان، کاوێسی مەلا، مام زێندین، براهیم ئاغا، خولەیی[١٩٩] . کلۆدیۆس جـەمیس ڕیـچ دەڵێـت: لەساڵی ١٨٢٠ گەیشتینە هەوارگەی فارس ئاغـای سـەرۆکی هـۆزی دزەیـی، فـارس ئاغـا ئازوقەچیەکەمانی دەرکردبوو پێی وتووبوو مـن نەسـەربە وەزیـری بەغـداد و نەپادشـای کوردستانم و نە پادشای ئێرانم، بەڵکو خۆی گەورەی خۆیـەتی لـەوڵاتی خۆیـدا دەژیٙ و میـوانیش ڕانـاگریٙ، بۆیـە چـاکتر وایـە بچـن بـۆ هـەولێر[٢٠٠]. یـەکێکی تـر لەکەسـایەتیە دیارەکانی بنەماڵەی دزەیی براهیم ئاغایـە، کـە لـەنێوان سـاڵانی (١٨٤٠–١٩٢٠) ژیـاوە،

---

[١٩٩] ئامادەکردنی ڕەوەست نەوزاد: سـایتی puk media نـەم زانیاریانـە لـەد. ئەحمـەد دزەیـی سـەرۆکی زانکـۆی سـەلاحەدین و ڕزگـار دزەیـی وەرگـیراوە، هـەروەها ئـەم بابەتـە لەئەکاونتـەکانی هـۆزی دزەیـی بلاوکراوەتەوە.

[٢٠٠] عەبدوللاٙ عەلیاوەیی (د) ود. مەولود ئیـبراهیم حەسـەن هـتر: ئینسـکلۆپیدیای هـەولێر، چ١ ،لوبنـان ، ٢٠٠٩ .

ڕۆڵی باڵای هەبووە لەبەهێزکردنی پێگەی هۆزەکەی لەدەشتی دزەیی، هەوڵی زۆری داوە بۆ بەرەنگار بوونەوەی هۆزە عەرەبەکانی ناوچەی مەخمور، نەیهێشتووە ناوچەکە داگیربکەن و شەڕی لەدژیان بەرپاکردووە لەناوچەکە دەری پەڕاندوون هەندێکیشیان لەزێ دیجلە ئاودیو کردووە، ئینگلیز و عوسمانیەکان ڕۆڵی ئیبراهیم ئاغایان لەبەرچاوگرتووبوو هەوڵیان دا پەیوەندی باشیان لەگەڵیدا هەبێت .

کاپتن های حاکمی سیاسی ئینگلیز لەهەولێر لەکتێبەکەی دووساڵ لەکوردستان لەساڵی ١٩١٨–١٩٢٠باسی پەیوەندی خۆی و دزەیەکان دەکات دەڵێت ڕۆڵیان هەبوو لەداڕشتنی سیاسەتی ناوچەکە و پشتیگیری سیاسەتی ئینگلیز بوون، لەباسی کەسایەتی براهیم ئاغا دەڵێت: کەسێکی زیرەك و قسەکەرێکی نایاب و پیاوێکی دنیادیدە بوو، هەروەها چەند کەسێکی دزەیەکان بەحاکمی ناوچەکەو بەڕێوەبەری ناحیە دادەمەزرێنێت .

دزەیەکان خاوەنی چەندین کەسایەتی گرنگن کەڕۆڵیان هەبووە لەمێژووی کورد و هۆزەکەیان وەك لەوانە عەلی مەحمود کاکەخان، خدری پاشا، ئەحمەد پاشا، ئیبراهیم ئاغای بایز، ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی، موحسن دزەیی، هۆمەر دزەیی، موشیری براهیم ئاغا، هاوار براهیم ئاغا، مەعروف حاجی پیرداود، قەرەنی ئاغا، هادی ئاغای پونگینەیی، د.ئەرسەلان بایز، سەلیم ئاغا هتد.... هەمووکات کەسایەتیە دزەیەکان بەئاغا ناوزەند دەکران، بەهۆی ئەوەی خاوەنی زەوی و زاری زۆری کشتووکاڵی بوون، دزەیەکان لەکۆندا بەکاری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری سەرقاڵ بوون، لەسەدەی بیستەمدا کاری بازرگانیشیان ئەنجامداوە، زۆربەی ئەندامانیان خاوەن موڵك و ماڵێکی زۆر بوون بەخەڵکی دەوڵەمەند ناسراون[٢٠١] . بەڵام لەدوای ئەوەی حوکمی پاشایەتی نەما لەعێراق

[٢٠١] ئامادەکردنی ڕەوەست نەوزاد: سایتی puk media ئەم زانیاریانە لەد.ئەحمەد دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین و ڕزگار دزەیی وەرگیراوە، هەروەها ئەم بابەتە لەئەکاونتەکانی هۆزی دزەیی بلاّوکراوەتەوە.

لەساڵی ١٩٥٨ و دەرچوونی یاسای چاکسازی زەوی لەعێراق، و بەهێزبوونی دام و دەزگاکانی حکومەت و پەرەسەندنی چالاکی سیاسی (حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان) دەسەڵاتی ئاغا و بەگەکان وەك جاران نەما، نەئەمان گوێرایەڵی یان ئەکردن و نە ئەوان ئەیان توانی وەکو جاران هەڵسوکەوت بکەن، بۆیە بەشێکی زۆری زەوی زارەکانیان بەر ئەویاسایە کەوت و موڵك داریەکەی گەڕایەوە بۆمیری و دابەشکرا بەسەر جوتیارەکان[٢٠٢]. دزەیەکان بەهۆی ئەوەی چەند سەدەیەك لەمەوبەر بەهۆی کۆچکردنیان بۆ گوندی دزێی ناوچەی ورمێ ئەو ناوەیان لێنراوە، بۆیە بەپێی هەندێك سەرچاوە دزەیەکان ڕەنگە سەر بەهۆزی پیران بن لەباکوری کوردستان، سەرچاوەی تریش دەڵێت سەربە هۆزی زەرزای ناوچەی شنۆی ڕۆژهەڵاتی کوردستانن، بەپێی هەندێك سەرچاوەی تر دزەیەکان سەربەهۆزی بلباسن، بەلاّم هیچ بۆچونێکیان بەتەواویی پشتڕاست نەکراوەتەوە. یەکێك لەداب ونەریتی دزەیەکان ژن و ژنخوازی بوو لەکاتی بەشوودانیان کچی خۆیان تەنها بەکوڕانی بنەماڵەی دزەیی دەدا، هەر ژن و ژنخوازیەك لەدەرەوەی ئەندامانی هۆزەکەیان ڕەتکردۆتەوە، بەلاّم ئێستا ئەو داب ونەریتە بەهۆی گۆڕانکاری لەژیانی ئێستادا نەماوە و ژن و ژنخوازی لەگەڵ هۆزەکانی تر ئەنجام دەدەن[٢٠٣] . دزەیی هۆزێکی دەوڵەمەند بوون لەنێوانی زێی گەورە و زێی بچووك و ڕێی هەولێر_کەرکوك نیشتەجێ بوون بەکشتوکاڵەوە خەریك بوون[٢٠٤] . دەوڵەمەنترین هۆزی کوردستانی باشور بوون لەسەر زەوی و زارەکانی خۆیاندا نیمچە کۆچەری بوون، هۆزێکی شایستە بوون و تالاّن و بڕۆییان نەکردووە، ئەگەر کێشەی نێوان هۆزەکان

---

[٢٠٢] هیوا مەلا حەسەن: چەردەیەك لەمێژووی هۆزی گەلاڵی : چ١، ٢٠١٧، ل٩٨ .

[٢٠٣] ئامادکردنی ڕەوەست نەوزاد: سایتی puk media نەم زانیاریانە لەد. ئەحمەد دزەیی سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدین و ڕزگار دزەیی وەرگیراوە هەروەها ئەم بابەتە لەئەکاونتەکانی هۆزی دزەیی بلاّوکراوەتەوە.

[٢٠٤] کەریم زەند :جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٢٢٨ .

بهاتایەتە پێشەوە هەندێك جار یاریدەی هۆزەعەرەبەکانی شەمەری هاوسێیان دەدا، هۆزەکە سەر بەمەزهەبی شافیعین و کەمێك دەمارگیرن، بەلاَم ناو و ناوبانگی میوان دۆستیان هەیە و خاوەنی وەعدی خۆیانن، قەیم دالّدەی هەمەوەندیە کانیان داوە، زەوی و زارەکانی قەزایەکانی بەناوی قەزایی دزەیی ناسراوە، بەڕێوەبەری قەزا هەمیشە لەناو هۆزەکە هەڵدەبژێردا. سنوری جوگرافیان: لەباکورەوە زێی گەورە، لای باشورەوە زێی بچوك، لای ڕۆژهەلاّتیەوە ڕێگەی ئالّتون کۆپری— هەولێر، لەڕۆژئاواوە زەوییە نزمابیەکانی دەوربەری دیجلە[٢٠٥].

## هۆزی مەرزان :

یەکێکن لەهۆزە ناسراوەکانی کورد لەباشوری کوردستان، بەزۆری لەدەشتی (کۆیە، هەولێر، مەخمور، دەشتی هەریر) نیشتەجێن، بەلاّم لەبەشەکانی کوردستانی (باکور، ڕۆژهەلاّت) مالّی هۆزی مەرزان بەرچاو دەکەوێت، مەرزان یا مەرزەوان بە واتای ئەوەی ئەوان کۆن لەسەر سنوری کوردستانی (تورکیا، عێراق، ئێران) نیشتەجێ بوون، لەچەند تیرەیەکی سەرەکی پێك هاتوون وەك (ناصر، شاور، باوەمەر، مالّ مالّ، بریندار) چەندین گوند هەیە ناوی (مەرزان)ی هەلّگرتووە، سیستەمی ئاغایەتی لەم هۆزە نیە، هۆزی مەرزان ئاین و ئاینزای جیاوازی تێدایە وەك (شیعە، سونە، کاکەیی) بەلاّم مەزهەبی سەرەکیان (سونە)یە، پێشتر گەرمیان و کوێستانیان کردووە، لەوەرزی پایز و زستان لەدەشتی هەولێر بوون، لەوەرزی بەهار و هاوین دەچوون بۆ (دۆڵی شاور) لەپشتی (ڕانیە)، برا گەورەی ئەم هۆزە پێشتر(ڕەسولّ موسا) بوو. لەکەسایەتیە

---

[٢٠٥] مێجەرئی .بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، س، پ ،ل٤٧ .

دیارەکانیان وەك (کۆسرەت ڕەسوٚ عەلی، عومەر قادر، مـام سـەلیمە گـەورە، مامۆسـتا بەکر مستەفا، مامۆستا گۆران، حەسەن مەلا مستەفا، حاجی کاکۆ ڕەسولٚ)[٢٠٦] .

## هۆزی گۆران :

یەکەم هۆزی کوردن ژیانی نیشتەجیٚ بوونیان هەڵبژارد[٢٠٧] .یـەکێکن لـەهۆزە کۆنـەکانی کورد زۆر لەمێژوونووس و ڕۆژهەلاٚت ناسەکان باسیان کردووە، بەزۆر شوێنی کوردستان دا بلاٚوبوونەتەوە، وشەی گۆران بەو کەسانە وتراوە کە زووتر گۆڕاون لەکۆچـەریەوە بـۆ جێگـر و نیشـتەجیٚ بـوون وئـاوەدانی و شـاریان دروسـت کـردووە، لـەژێر دەسـەلاٚتی کەسێکی دیـاری کـراو نـەبوون[٢٠٨].مـیرزا شـکرولاٚ سـنندجی لـەنێوان سـالاٚنی (١٨٨٢– ١٨٨٨) دەلٚیٚ: هـۆزی گـۆران ئێسـتا لەشـاری (سـنە) نیشـتەجێن و زۆربـەی بازرگـان و پیشەساز و کاسبی شارەکە لەو هۆزەن، زاناو خواناس و پارێزگار و لـەخوا ترسـی ئـەم هـۆزە لەهـەموو هـۆزێکی دیکـەی کـورد زیـاترن. نزیکـەی دوو هـەزار خێـزان دەبـن، ماوەیەکی دوور و درێژە خێلاٚیەتیان وەلاناوە گوند و شارنشینیان هەلٚبـژاردووە، مەگـەر ژمارەیەکی کەمیان نیشتەجیٚ گوندن و بۆ ئاژەلٚ لەوەڕانـدن لەبـەهارەوە تـا دوو مـانگ لەهاوین، لەمالٚ دەچنە دەریٚ و لەدەورو پشتی ئاواییەکەیان سیٚ مانگێـك دەمێننـەوە و

---

[٢٠٦] گفتوگۆی نوسەر لەگەلٚ شاکر کاکۆ مەرزان : هەولێر ، ٢٠١٦/١٠/٢٠ .

[٢٠٧] زریان ئەحمەد: مالٚپەری میژووی کورد، ٢٠١٧/٣/٩ .

[٢٠٨]ئارام عەبدولواحێد: مێژووی گوندی یالاٚنقۆز و نەوەکانی ،چ١، ٢٠١٠ ،ل٧٢ –٧٦ .

ئینجا دەگەڕێنەوە ماڵی خۆیان، هەروەها لەهۆزی گۆران ژمارەیەکی زۆریشیان لەخاکی (دار ئەلدولە)ی کرماشان نیشتەجێن[٢٠٩]. ماوەیەکی زۆرە هۆزی گۆران پەرتەوازەیەو سەپەرشتیاری نیە، بۆیە لە(٢٠٠٧/٢/١ز) چەند کەسایەتیەکی هۆزی گۆران لەناوچەی (دۆڵەڕووت) لەنزیك شاری سلێمانی کۆبوونەوەو بڕیاریان دا سەنتەرێك بکەنەوە و ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری و سەرپەرشت بۆ ئەم هۆزە دابێن، لە(٢٠٠٨/٥/١٠) لەسلێمانی سەنتەرەکە بەناوی (سەنتەری ڕۆشنیری گۆران) کرایەوە، بارەگای سەرەکی لەشاری (سلێمانی) بوو، کەنزیکەی شەش سەد گوند لەخۆدەگرێت، جگە لە(١٥٠) گوند لەناوچەی (بادینان، موسڵ، هەولێر) کە (بەشار موشیر ئاغا) سەرپەرشتیان دەکات[٢١٠].

## هۆزی شینکی :

شینکی ناوچەیەکە لەشاربازێر کەوتۆتە لای قەزای (ماوەت) کە پازدە بۆ شازدە گوند دەبێت، هەموویان لەهۆزی شینکین، زۆرێکیانیش لەناوچەی (بازیان)نیشتەجێن لەحەوت گوند نیشتەجێن، کەپێشتر دووبرا بوون لەگوندی (قامیش)ەوە ڕۆیشتوون، هەروەها لە(کۆیە، سێوسێنان، سلێمانی، هەولێر) خێزانی شینکی دەبینرێت، کاتی خۆی هەموو (شینکی) لەگوندی (قامیش)ەوە ڕۆیشتوون بۆناوچەکانی تر، ناوچەی

---

[٢٠٩] میرزا شکرولاَ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلاَن، و ئەنوەر سوڵتانی، چاپخانەی ژین–سلێمانی ،چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف: س ،پ ،ل ١٠٥–١٠٦.

[٢١٠] ئارام عەبدولواحێد: مێژووی گوندی یالاَنقۆز و نەوەکانی ،چ١، ٢٠١٠ ،ل٧٢ –٧٦ .

(شینکایەتی) کە هاوسنورە لەگەڵ ناوچەی (جافایەتی) ئەم هۆزە هۆزێکی سەربەخۆیە ، (کوێخا تۆفیق)ی کلاش کەران سەرۆکایەتی ئەم هۆزەی لەئەستۆدا بووە پێشتر کە دۆستێکی نزیکی (شێخ مەحمود) بووە، پاش خۆی برازایەکی بەناوی (مام فاتح) بە سەرۆك هۆز دانراوە، لەئێستادا (فەرحان کوێخا تۆفیق) لە(بازیان) سەرۆکایەتی ئەم هۆزە دەکات. ناوی شینکی ناوەکەیان لەوەوە هاتبێت ئەو کەسانە جلی ڕەنگ شینیان لەبەر کردووە، بۆ جیا کردنەوە لەکەسانی دیکە بەو کەسانەیان ووتووە (شینکی)، یان ناوچەکەیان شینکە بووە، هۆزی (شینکی) لەبنەڕەت دا ناوچەی شینکایەتی دەگرێتەوە، لەناوچەی ماوەت لەحەوت گوند نیشتەجێن وەك (شینکی، دڕی، قامیش، سەفرە، زەروون، بەرگورد) بەلأم لەئێستا ژمارەیەکان زیادی کردووە لەچەند ناوچەك نیشتەجێن وەك ناوچەی بازیان لەگوندەکانی (کلاشکەران، بیبیکەران، ولّبلاخ، سلێمانەگردە) لە(قەرەداخ) یش لەگوندی (سەوسێنان) لەزۆر گوندو ناوچەی تر هەیە .

هۆزی شینکی سەرەتا لەناوچەی شارەزوور بوون، بەلأم ئەوە نازانرێت بەچ هۆکارێك هاتوون بۆ ناوچەی (شاربازێڕ)، د.فواد حەمەخورشید لەکتێبی العشائر الكردية دا دەڵێت: ناوچەی شارەزوور چەندین هۆزی تێدا نیشتەجی بوو وەك گەلاڵی، شێخ سمایلی، چوچانی، قوبلای، سمایل عوزەیری، شینکی، کافرۆشی، بڵباس، کەڵهوڕ، تیلەکۆ، گەڵباخی، مەنمی)[٢١١]. هەندێك پێیان وایە هۆزی شینکی بەشێکن لەگەلاڵی، بەلأم ڕیچ بەهۆزێکی سەربەخۆ دایناوە[٢١٢].

---

[٢١١] ئارام عەبدولواحێد: مێژووی گوندی یالآنقۆز و نەوەکانی ،چ١، ٢٠١٠ ،ل٧٢–٧٣ .

[٢١٢] مەحمود ئەحمەد محەمەد (مەلا مەحمود گەلاڵەیی): سەنتەری ڕۆشنبیری کۆمەلأیەتی بابان ، ژ١٠ حوزەیرانی ٢٠٠٩ .

## هۆزی مامۆیی :

مـامۆیی تێکەڵەیەکـە لەووشـەی (مـاموو+یی)، هەنـدێك کـەس دەڵـێن مـامۆ هـەمان ووشـەی (مـام)ە، ئـەم هـۆزە بـە بـەربڵاوی لەناوچـەکانی (سـلێمانی، سەیدسـادق، شـارەزوور، مـەریوان، جـوانرۆ، کرماشـان) و هەنـدێك لەعەرەبـە دراوئاوسـێکانی کـورد خۆیـان بـەهۆز و بـەرەبابی مـامۆیی دەناسـێنن، هۆزێـك ئەوەنـدە بـەربڵاو بێـت دەبێـت تاڕادەیــەك بنــەڕەت و مێژوویەکــەی ڕوون بێــت، لــەڕابردوودا ئــەم هــۆزە پاڵپشــت و پشتیوانی میرنیشینەکانی بابان و ئەردەڵان بوون. هەروەها لەگـەڵ شـێخانی نەقشـبەند پەیوەندی گـەرم و گوڕیـان هـەبووە[٢١٣] لەکۆنـدا هـۆزێکی گـەورە بـوون، قـانعی شـاعیر بەبنچینەی کوردان ناوی بـردووە، لەگـەڵ تیرەکـانی ئێلـی جـاف کۆچـەری (گـەرمیان و کوێستان)یان کردووە، هەواری تایەتی خۆیان هەبووە، بەهاران بەڕێگای (گـەورە قـەڵا، پەیکۆلی) دا ڕۆیشـتونەتە شـارەزوور و لـەوێوە بـۆ پێنجـوێن و ئینجـا بـەرەو کوێسـتان بووەتەوە. لەم دوایانەدا (حاجی ئەحمەدی گـۆڕی ئەسـپ) سـەرۆکی ئـەم تیرەیـە بـوو، کەبەپیاوێکی دەمڕاست و قسەزان وڕاستگۆو تێگەیشتوو ناوبانگی دەرکـردوو بـوو، ئـەم تیرەیـە ئێسـتا لەهـەردوو گونـدی (گـۆڕی ئەسـپ، تاڵـەوان)ی سـەربەناحیەی (پیبـاز) نیشــتەجێن، هــەروەها لەگونــدی (خاڵەبــەگی)ی ســەربە قــەزای کــەلار وگونــدی (محمودخـانی) دەشـتی شـارەزور دەژیـن، لەشارۆچـکەکانی (هەڵەبجـەی تـازە، کـەلار، ڕزگـاری) مـاڵی مـامۆیی هەیـە[٢١٤]. (مـامۆیی، مـەمۆیی) ئـەلمموی، واپێدەچـێت زیـاتر لەهۆزێکی کورد بەم ناوە هەبن، یان بەواتایەکی دیکە، ئەمـە یـەك هۆزبـووە لـق تـیرەی زۆری لـێ بووەتـەوە، لەناوچـە لێـك دوورەکـان بڵابوونەتـەوە، لەوانـە لـەوڵاتی هـەکاری کەیەکێك لەمیرەکانیان بریتیـە لە(شـەرەفەدین ئەحمـەد کـوڕی شـەهابەدین داود کـوڕی بلـس ئـەلهکاری ئـەلمموی) کـە هـەواڵی ئەمـە لـەدوای هـاتنی داگیرکـەری مـەغۆلی بۆکوردستان دەکەوێتە نێو سەرچاوەکان، دەڵـێن هێزێکـی زۆری لەگەڵیـدا بـووە، بـەڵام

---

[٢١٣] فەریدوون پەروازە: زاگرۆس پۆست، کورتەك لەمێژووی هۆزی مامۆیی، ٢٠١٤ .

[٢١٤] ساڵح هارونی : س ، پ ، ل١٣٩ .

ساڵی (١٢٥٧ز) لەسەردەستی کەسێکی تورکمان بەناوی (ئبن سمری) بەفێڵ کوژرا، هۆزێکی دیکە بەهەمان ناوەوە، لەکۆتایی دوازدەهەمی زاینی، ولآتی خۆیان کەدەکەوێتە دەوروبەری چیای سماقی ولآتی شام جێدەهێڵن بەرەو لوڕستانی گەورە کۆچ دەکەن، لەدەوری میرزا (هزار ئەسب کوڕی ئەبی تاهر ئەللری ئەلفزلوی) کۆبوونەتەوە، دەڵێن (بابائەردەلان)ی دامەزرێنەری میرنیشنی ئەردەلان سەربەم هۆزەی بووە. (کلودیس جیمس ڕیچ) باسی هۆزی (مەماکۆی) لەلوڕستانی گەورە دەکات، لەلوڕستانی بچوکیش هۆزی (مەمایی) هەیە[٢١٥]. مامۆمییەکان بۆخۆیان لایان وایە لەبنەچەدا دەگەڕێنەوە سەر ئەردەلانیەکان و خۆیان بەکوڕو نەوەی(مەئمون بەگی ئەردەلان) دەزانن و لاشیان وایە ناوی (مامۆیی) لەوشەی (مەئمون)ەوە وەرگیراوە .

بەلآم پێناچێت ئەم هۆزە ڕەچەڵەکیان بچێتە سەرئەردەلانیەکان، (بابابە ئەردەلان) بۆخۆی ماوەیەك لەناوهۆزی گۆران بووە، ئەگەر ڕەچەڵەکیان بۆسەر ئەردەلانیەکان بگەڕاباتەوە بێگومان ئێستا بەشێکی زۆر هەواری سەرەکیان ناوچەی ئەردەلانیەکان بوون بەتایبەتی ئەردەلانیەکان تا ساڵی (١٨٦٧) هەر لەدەسەلآتدا بوون، بەلآم ڕەنگە دۆستایەتی لەگەڵ لەڕیش سپیانی ئەم تیرەو ئەردەلانیەکان هەبێت، پێم وایە مامۆیەکان میژوویان لەئەردەلانیەکان کۆنتربێت .

هۆزی مامۆیی لەناوخەڵکیدا بەوەفا و پابەندی پەیمان و بەڵێنی خۆیان ناسراون، لە ناو تیرەکانی هۆزی جافدا ڕێزلێگیراو بوونە، ئەم هۆزە خاوەنی بالآی بەرزو دامەزراون، هەندێکی زۆریان ناندەر و خاوەن دیوەخانن، لەزۆربەی ناو تیرەکانی جاف و دەڤەری گەرمیان، شارەزور، ڕانیە،قەلآدزی ،سلێمانی ،بێتواتە، بیتوێن، کەلار، کفری، سنە، موکریانن. بەلآم زۆرتر لەشارەزووردا نیشتەجێن[٢١٦].

---

[٢١٥] زرار سدسق تۆفیق : هۆزو دەسەلآتە هۆزەکیە کوردەکانی چاغی ناوەڕاست، س ،پ، ل٢٢٥–٢٢٦

[٢١٦] خسرەو جاف : س ، پ ، ل٢٤١–٢٤٢

## هۆزی شێخ سمایلی :

بـەپێی سەرچـاوەکانی مێـژوو (شـێخ سمایلیـەکان) پـێش هـاتنی هـۆزی جـاف بـۆ ناوچـەکە هــەر هــەبوون و خــاوەن جێگــەو هــەوار و پێگــەی تایبــەتی خۆیــان بــوون، سەرچـاوەکان ئامـاژە بـەوە دەکـەن ئـەم هـۆزە لەبنەچـەدا دەچـنەوە سـەر کـورد گەلاڵەیەکان، هـەروەها پێکهێنـەرێکی سـەرەکی دەسـەڵاتە مێژوویەکـەی گـەلاڵی بـوون بەڵام کەجافەکان ڕوویان لەناوچەکە کرد دوای ئەوەی پێکدادان دروست بـوو وەك بـیری پاوانخوازی خێڵ و فراوان کردنـی جێگـەو پێگـە ئـەم بەشـەیان کەوتنـە ژێـر هـەژموونی جافـەوە[217]. شـێخ سمایلیـەکان سـەرەتا لەناوچـەی (قـروە)ی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان بوون، پـێش پـەنجا سـاڵێك بـەر لەکۆچـی یەکـەمی مورادیـەکان هاتوونەتـە شـارەزوور، ماوەیەکی دوورودرێژ گـەرمیان و کوێسـتانیان کـردووە، پـاش شـەڕی (حوسـێن شـەهید) لەبــەینی جافــەکانی (مــورادی) و تیرەکــانی ناوچــەی شــارەزوور لەســەر ئــاوی شــلێر ڕوویداوە، ئەم تیرەیە دەستیان بەنیشـتەجێ بـوون کـردووە لـەبناری شـارەزوور چـەند گوندێکیان ئاوەدانکردۆتەوە لەوانە (کێلەکـەوە، کەچـەڵی، مـاو، مزگەوتـە، شـانەدەری کۆن) بەڵام لەکۆچی هاوینەیان بەدوای لەوەڕگە و سەرچاوەی ئاودا تاسیەکانی سەدەی بیسـتەم بـەردەوامبوون، لەگـەڵ بـەردەوام بوونیـان لەنیشـتەجێ بـوون سـی و حـەوت گونـدیان ئاوەدانکردۆتــەوە، ئەمانــە نــاوی هەنــدێك لەگونــدە گــەورە و دیارەکانیــان (شـانەدەریەکان، کـانی پانکـەی سـەروو، کـانی پانکـەی خـواروو ،گرێـزە) لەناوچـەی شارەزوور، (قەڵاڵقۆچاڵی، کارێزەی حەمەسەعید) لەگەرمیان، لەڕۆژهەڵاتی کوردستانیش چـەند گونـدێکیان ئاوەدانکردۆتــەوە لەوانە(سـەرتیب ئـاوا، وێهـەج، وێهـەم، خـەنائاوا، ئەسەفئاوا) چەند خێزانێکیشیان لەقروە و دەوروبەریـدا دەژیـن .ژمارەیـەکی زۆریشـیان لە(عەربــەت، سەیدســادق، دەربەنــدیخان، کــەلار) و نــاو شــاری (ســلێمانی)دا نیشتەجێن[218]. کەریم بەگ دەڵێت: ئەمانە تایفەیەکی زۆرن، ئەوانەیان هان لەناوجافدا،

---

[217] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ل١٨٧ .

[218] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ، ل٦٤ .

ئەبن بەدوو کۆمەڵ، کۆمەڵێکیان پیان ئەڵێن (شێخ سمایلی سورەجۆ) کۆمەڵەی تر پێیان ئەڵێن (شێخ سمایلی بنە جووت) هەردوو کۆمەڵەکە پێنج سەد ماڵ بوونە جاران، سێ سەد ماڵیان کەتاقمی(فەقێ ئەولآیە) لەسورەجۆ نیشتەجێ بوونە، دووسەد ماڵیان لە(گرێزە، بنگرد، سەراو، قالیجۆ، موان، بنەجووت، بالآن تەران) لەناحیەی خورماڵ دانیشتووبوون، مەڕو بزن و ڕەشە ولآخیان زۆر زۆربووە، کشتوکاڵێکی زۆرچاك بوون، بۆ (گەنم، جۆ،نۆك، نیسك) بەهەردوو لایان سەدو پەنجاسوار و دووسەد تاسێ سەد پیادەی تفەنگداریان بووە، ئەم تایفەیە بەشی زۆریان هەزارو سێ سەد ماڵ بوونە کەهان لەڕۆژهەلآتی کوردستان، هاوین ئەچنە بەینی (هەمەدان، قۆریە) زستان هەندێك ساڵ دەچوون بۆدەوری سەرقەلآ کە نزیك قەسری شیرینە[٢١٩]. بەشێکیان لەشارەزوور و بناری شارەزووردا لەم گوندانەدا نیشتەجێن (کانی پانکەی سەروو، شانەدەری، چوارتاق، شانەیەری، ئاوایی حاجی نامیق، کەچەڵی، ماو،کێلەکەوە، گڵەزەردە، سەراوی سوبحان ئاغا، هەیاس، موانەکان)[٢٢٠]. ئەم تیرەیەش لەگەرمیان بوونی هەیە (باوەنور، کەلار) و لەچەندێکی گوندێکی تردا چەندان خێزان بەرچاو دەکەون، لەرۆژهەلآتی رووباری سیروان لەگوندەکانی (کەوزەینالی، زەلکە) چەند ماڵێکی ئەم تیرەیە دەبینرێت، لەرۆژهەلآتی کوردستان بە تایبەتی لەشاری (سنە)دا هەر لەدەسەلآتی فەرمانڕەوای قاجاریەکانەوەتاڕۆژگاری ئەمڕۆ، شێخ سمایلی بوونی هەبووە، بەدەیان خێزانیشی بەرەو باشور شۆربووەتەوە، بۆچەند گوندێکی ناوچەی زەهاو[٢٢١]. لەڕۆژهەلآتی کوردستان شێخ سمایلی هۆزێکی گەورەن و بەناوبانگن، لەسەرەتای حوکمی قاجاریەکاندا لەناوچەی سنە نیشتەجێ بوون. هەندێکیشیان چوونە ناوچەکانی سەرقەلآ و کەناری ڕووباری هەواسان[٢٢٢]

---

[٢١٩] کریم فتاح بەگ: س، پ ،ل ١٤٠–١٤١ .

[٢٢٠] حکیم مەلاساڵەح: س ، پ ، ل١٤٤.

[٢٢١] ساڵح هارونی: س ، پ ، ل١٤٧

[٢٢٢] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل١٣٦.





ناسرخان شێخ ئیسماعیلی کوڕی عەزیزخان– نەسرولاّ قادر (مامە نەسە)             سالاری مامە نەسە
براگەورەی شێخ سمایلەکانی ڕۆژهەلاّت –براگەورەی شێخ سمایلەکانی باشور – براگەورەی سێخ سمایلی

## هۆزی قەرەلوس:

مەیجەرسۆن دەلّێت: قەرەلووس هـۆزێکی کـوردن لەهـەموو باشـوری تـرن، سـەرقالّی کشتوکالّ و مەڕداری و نەوت کارین کەبەباری کەران دەیانگواستەوە، بەگشتی هـۆزێکی بێوەین بەلاّم چاك بـەرگری لـەخۆیان دەکـەن ئەگـەر خـراپ مامەلّـەیان لەگـەلّ بکـرێ، بەدیالێکتی کوردی ئەوپەڕی باشوری قسەدەکەن، هەموویان لەسەر مەزهەبی شیعەن . بەپێی سەرژمێری سالّی١٩١٧ هەزار و شەش سەد و پەنجا کەس بوون پێنج سـەد پیـاو و پێنج سەد ژن و ئەوەی دیکەیان منداڵ بوون، نزیکی حەفتا سوار و دووسـەد پیـادەی چـەکداریان هـەبوو. شـوێنی جوگرافیـان لـەم پێدەشـتدا بـەم شـێوەیەی خـوارەوە سـنووردراوە: لای بـاکوور بەرزایـەکانی دامـێنی چـیای ئـەبی نـەفت تـا سـنوری ئێـران، باشوری تەنگی سومبار، هێلّی ڕۆژئاوا تائەبی نەفت، ڕۆژهەلاّت تـا سـنوری ئێـران، هـەر

لەزووەوە لەم شوێنەی ئێستایان بڵاو بوونەتـەوە. لەچـەند تیرەیـەك پێـك هـاتوون وەك (گەچی، قەیتوون، چەرمەوەندی، کاکەوەند،نەفتچی ،گاوساواری) سەرۆکیان کاکـەخان بوو[٢٢٣].

## هۆزی دێبوکری :

ئەم هۆزە لەکۆتای ساڵەکانی نادرشـای ئەفشـار و سـەرەتای هاتنـە سـەر دەسـەڵاتی



کـەریم خـانی زەنـد لەئامـەدی بـاکوری کوردسـتانەوە هاتوونەتـە ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان، سـەرەتا لەگونـدی بەیرەمۆی نزیك شاوەلەی پیرانشار نیشتەجێ بوون، پاشان بەیەکجاری هاتوونەتە گوندی دێبوکر و هەربـەو بۆنـەوە بـە دێبوکری نێوبراون. پێش هاتنیان لەئامەد بەهۆزی قارەمـەنی **ئـەمیر ئەسـعەد عـەلی** ناسراون ئێسـتاش یـەکێك لـەتیرەکانی دێبـوکری لەناوچـەی **سـەرۆك هـۆزی دێبـوکری** موکریـان ئـەو ناوەیـان وەك شـۆرەتی بنەماڵـە هەرلەسـەر مـاوە. لەسـەرەتای هاتنیـان بۆناوچەی موکریان سەرۆکایەتی هۆزەکە بەدەست بەیرەم ئاغاوە بووە، گڵکۆی بەیرەم ئاغـا لەگۆڕەسـتانی پیروبـایزی باشـوری ڕۆژئـاوای شـاری مـەهابادە، ئـەو گۆڕسـتانە دەکەوێتە نێوان گوندی دێبوکر و قازی ئاوا، بەیرەم ئاغـا کـوڕی عـەرەب ئاغـای کـوڕی کـوڕی ئەحمـەد ئاغـا بـووە، بـە ئامـانجی بەدەستخسـتنی ژینگەیـەکی باشـتر هـۆزی

---

[٢٢٣] مێجـەرئی. بـی. سـۆن: چـەند سـەرنجێك دەربـارەی هۆزەکـانی کوردسـتانی خـوارووی، و نـەجاتی عەبدوڵڵا ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ،ل٧٧–٧٨ .

قارەمانی ڕێبەری کردووە ئەمری کۆچی پێداون تا لەموکریان گیرساونەتەوە، هۆزی ئەشکەوتی لەو کۆچەدا بەشداریان کردووە، لەئامێدیەوە لەگەڵ قارەمانیەکان هاتوونەتە موکریان، هاتنی دێبوکریەکان بۆ موکریان ئاڵوگۆڕێکی بەرچاوی لەوناوچەدا بەدیهێنا، ئەوان بەپێی پلان و بەرنامەیەکی ڕێکوپێك لەژێر سەرۆکایەتییەکی لێهاتوو و بەهێزدا توانیان شوێنە گرنگەکانی مەهاباد، میانداو، بۆکان بخەنە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە بۆئاوەدانکردنەوەی تێبکۆشن. بەرهەمی کشتوکاڵیان پەرەپێداو خوێندنگە و مزگەوتیان تێدا دروستکرد و مامۆستای زانا و لێهاتوویان بۆدابینکرد، شاری سابلاخ تائێستاش شوێنەوارەکانی هەباس ئاغای دێبوکری ماون، دێبوکریەکان لەڕوداو کارەساتە مێژوویەکانی موکریان دەوری بەرچاویان هەبووە[٢٢٤] . هۆزی دێبوکری لەپێنج بەرە و سی بنەماڵە پێکهاتوون: ئەم هۆزەی کورد شەش هەزار خێزانن، لەنێوان مەهاباد و سەقز و میانداودا نیشتەجێن، خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین، پێنج تیرەن (هەباس ئاغایی، سلێمان ئاغایی، حەمەد ئاغایی، مارفا ئاغایی، شێخ ئاغا) .

هەباس ئاغایی: لەئیندرقاش،کارێزە،ئەمبار، سەراو،سەرچاوە نیشتەجێن بوون، لەم بنەمالانە پێکهاتوون عەباسی، قادری، شەهابی، فەرید .

سلێمان ئاغایی: لەقونقەلان نیشتەجێن بوون، لەم بنەمالانە پێکهاتوون قەهرەمانی، ئەبووبەکری، دانیشمەند، موحەمەدی، ئەحمەدی، بایەزیدی، سولیمانی، ڕەسوڵی، تەنهایی .

حەمەد ئاغا: لەم بنەمالانە پێکهاتوون محەمەدی، کەریمی، فەتاحی، عەزیزی، موزەفەری، سەدیقی، دێهبۆکری، موجەڕەد .

---

[٢٢٤] ماڵپەری ویکیپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد، سەید محەمەد سەمەدی، مێژووی مەهاباد ٢٠١٨/٦/٢٠.

مـارف ئاغـایی: لەدەڤـەری بۆکـان نیشـتەجێن و لـەم بنەماڵانـە پێکهـاتوون حەمیـدی، ڕەسوڵی، حیسامی، پیرۆتی، گولابی، موهتەدی، ئێلخانی زاد، مەعروف، عەلی یار .

شێخ ئاغا: لەم بنەماڵانە پێکهاتوون شێخ ئاغای، حەقیقی[٢٢٥] .

## هۆزی لوڕ :

هۆزی لوڕ لەئێران دەکرێت بەچوار بەشەوە :

لــەك و زەنــد، بــەختیاری، مەمەســنی، فــەیلی: هــۆزی فــەیلی لــەنزیك خــوڕەم ئابــاد نیشتەجێن، هەندێك وەرز بەپیّ کۆچیان دەکرد بۆبەغداد بەسیّ ڕۆژ، هۆزی لـوڕ دابـەش دەبن بەسەر دوو دابەش بوونی گەورەدا، ئەویش لوڕی گەورە و لـوڕی بچـوك، لوڕەکـان بڵاوبونەتـەوە بەڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوای ئێرانـدا، هـۆزی کـومزاری لـوڕ: لـەوڵاتی عومـان لەباکور و باکوری ڕۆژئاوا و باکوری ڕۆژهەڵات لەناوچەکانی کومراز، دوورگەکانی خصب، لارەك و موسەندەم بڵاوبوونەتەوە .

هـۆزی لـەك: لـەخوڕەم ئابـاد، هەمـەدان، کرماشـان و ناحیـەی پارێزگاکـانی ئـیلام و ئازەربایجـانی ڕۆژئـاوا و قـەزاکانی کلاردەشـت و سـەڵماس و سـاینقەڵادا نیشـتەجێن .

مەمەسنی: لەپارێزگای شیراز و شارۆچکەی مەمەسنی، ناحیەی کازیرون و ڕۆستەم دان.

بۆیرەحمـەدی: لـەپارێزگای کۆگگلیـو و بوێرئەحمـەد و ناحیـەکانی باشـوری پارێزگـای خوزسـتانن. بەختیاریـەکان لەشارسـتانی (ئەندیمشـك، مەسـجد سـلێمان، شوشـتەر، رامـوهرمز، گتونـد، ئـەیزە، باغمولـك، ناحیـەی دهـدز، شارسـتانی دزفـول) لـەپارێزگای

---

[٢٢٥] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٦٠-٦١ .

چوارمەحاڵ و بەختیاری، لەشارستانی لوڕدگان و شاری کورد، بروجەن، دارێژە، سخلە، پارێزگای لوڕستان، ئەسفەهان، ڕۆژئاوا و باکوری ڕۆژئاوای شارستانی فەریدوون .

لـوڕی بچـووك: لـەپارێزگای لوڕسـتان، ئـیلام، بـاكوری پارێزگـای خوزسـتان، باشـور و ڕۆژئـاوای پارێزگـای هەمــەدان و هەنــدێك ناوچــەی ڕۆژهــەڵاتی عێـراق لوڕەكـان ٦٪ دانیشتوانی ئێران پێکدەهێنن کەدەکاتە پێنج تا شەش ملیـۆن کـەس، لـەعێراق سـەد و بیست و یەك هەزار كەس دەبن، لـەعومان پێـنج هـەزار و سـەد نەفـەر دەبـن، لوڕەكـان زۆربەیان شیعە مەزهەبن، لەناویاندا یارسان و جولەکەش هەیە .

عـەباس جـەلیلیان نوسـەری گـەورەترین پـەرتووکی فەرهـەنگی کـوردی باشـوری لـە وتارێکدا بەناوی ڕەسەنێتی زمانی کوردی و پۆلێنکردنی شـێوەزارەکانی پـاش تێـڕوانین لەبیردۆزە پێشینەکاندا پۆلێنکردنی خـۆی پێشـکەش دەکـات، زمـانی کـوردی بەحـەوت شێوەزار دەناسێنێت کەبریتین لە: کرمانجی، کوردی نـاوین، زازا و گـۆرانی ،هـەورامی ، لەکی، کوردی باشوری کەڵهوڕی، لوڕی .

زمـانی لـوڕی نزیکـە لەهـەردوو زمـانی کـوردی و فارسـی، هەریـەکیان بەشـێوەزارێکی زمانەکەیانی دەزانن، زمـانی لـوڕ دابـەش دەبێـت بۆسـەر چـەند گـرووپ (فـەیلی، لـوڕی ناوەڕاسـت، بـەختیاری، لـوڕی باشـور، لـەکی)، پاشـان دابـەش دەبێتـەوە بـۆ بەشـی سـەرەکی: زاراوەی لـوڕی گـەورە نزیکـە لـەزمانی فارسـی، ناوچـەکانی بـەختیاری و بوێرەحمەد و مەمەسنی و باکوری خوزستان و هەندێك ناوچەی بوشەهر پێی دەدوێن .

زاراوەی لـوڕی بچـووك نزیکـە لـەزمانی کوردیـەوە، ناوچـەکانی لوڕسـتان و هەمـەدان (مـەلایر، نەهاوەنـد، تۆیسـەرکان) و ئـیلام و بـاکوری خوزسـتان پێـی دەدوێـن. زۆرێـك

لەزمانناسان لەکی بەشێوەزارێکی کوردی باشوری هەژماردەکەن، بەشێك لەزمانناسانی نوێش لەکی بەشێوەزارێکی سەربەخۆی کوردی دەزانن[٢٢٦] .

لورِ بەگشتی هۆزێکی ناودار و بەهێزی کوردن، بەر لەهەخامەنشی لەم ناوچەیە نیشتەجێ بوون، ئەوکات لورِستان و خوزستان یەك ناوی بووە[٢٢٧] . زێد وخاکیان لەئیسفەهانەوە تاسنوری عەرەبستانی ئێران خۆزستان وهەمەدان و جەمسەری خاکی عێراقی عەجەم کە ئیسفەهان و هەمەدان و کرماشان و کوردستان تاسنوری ئازەربایجان دەگرێتەوە، عەرەبەکان پێیان دەووت هەرێمی جیبال بەشێکیانیش بەتێپەرِ بوونی کات و سەردەم لەقەزوین و شوێنی ترنیشتەجێ بوون[٢٢٨] .

شەرەفخانی بەدلیسی مێژوونووسی گەورەی کورد لەشەرەفنامەدا لورِەکان بەبەشێك لەکورد دادەنێت، لورِەکانیش خۆیان بەکورد داناوە بەلاّم بەهۆی سیاسەت و جیاوازی مەزهەبی کە زۆرینەی کورد سوونی مەزهەبن، لورِەکانیش شیعە مەزهەبن ئەمە وای لە دەسەلاّتدارانی ئێران کردووە، بیکەنە خالّی جیاوازی نێوانیان و هەندێك لەلورِەکان بلێّن

---

[٢٢٦] مالّپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد، ٢٠١٨/٦/٢٠ .

پارێزگای خوزستان یەکێکە لەپارێزگاکانی ئێران، ناوەندی ئەم پارێزگایە شاری ئەهوازە، باکوری پارێزگای لورِستانە، باکوری رِۆژهەلاّتی پارێزگای ئەسفەهانە و چوارمەحالّ و بەختیاری و کۆهگیلوویە، باشوری رِۆژئاوای پارێزگای ئیلام، لای باشوری کەنداوی عەرەب، لەرِۆژئاوای لەگەلّ ولاّتی عێراق هاوسنورە .

پارێزگای چوارمەحالّ و بەختیاری یەکێکە لەپارێزگانی ئێران ناوەندی ئەم پارێزگایە شەهری کوردە، لای باکور و باکوری رِۆژهەلاّت دا لەگەلّ پارێزگای ئەسفەهان هاوسنورە، لای باشوری کۆهگیلوویە و بۆیرەحمەدە، لەرِۆژئاوای پارێزگای خوزستانە، رِۆژئاوای پارێزگای لورِستان .

[٢٢٧] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل١١٧ .

[٢٢٨] میرزا شکرولاّ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلاّن، و ئەنوەر سولّتانی، چاپخانەی ژین—سلێمانی ،چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢— ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ، ل٥٤ .

ئێمە کورد نین. لوڕ لەهۆزە تێکەڵە خۆماڵیەکانی ئێرانە، لەهۆزە ئاریایەکانە کە لە ڕۆژئاوای ئێران دەژیان وەك کاشیەکان و لولوبیەکان و ئیلامیەکان، لەسەربنەمای هاوتای لێکچوون و زەویناس و بەڵگەی شوێنەواری هەندێك مێژوونووس لوڕەکان بە پاشماوەی ئیلامیەکان دەزانن، سەرچاوەیی مێژووی دۆزراوەتەوە ئاماژە بەوەدەکەن کە چوارهەزار ساڵ پێش زاینی ژیان لەلوڕستان هەبووە، داگیرکاری عەرەب بۆسەر ناوچەکە گۆڕانکاری لەفەرهەنگ و کەلتور و زمانی ناوچەکە کرد، ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر لوڕستان بەڵام لوڕەکان توانیان زمان و زۆر لەنەریتی خۆیان بپارێزن . لەشەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیس دا هەردوو بنەماڵە (خانەدان)ی لوڕ بەپێنجەم و خانەدانانی کورد هاتووە وەدەسەلاّتیان سەربەخۆ بووە، لەمعجم ئەلبلدانی یاقووتی ئەلحەموی ئەلرومی دا باسی هاتووە باسی ئەوە دەکات کەوا لوڕەکان هۆزێکی کوردەکانن لەچیاکان دەژین لەنێوان خوزستان و ئەسفەهاندا .

لەسەردەمی سەفەوی دوو دەوڵەتی لوڕ هەبوون کە زۆرینەیان لوڕ بوون، ئەم دوو دەوڵەتە بەناوەکانی لوڕستان کە ناوەندەکەی خوڕەم ئاباد، هەروەها کۆهگیلۆ ناوەندەکەی بەهبەهان بوو، والی لوڕستان فەیلی بوو لەساڵی ١٦٢٧زاینی بەدەستوری شاعەباس حاکمی پشتکۆ و پێشکۆ بوو تادەوری قاجاریەکان، لوڕستان لەسەردەمی زەندا دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو، پاش ئەوەی دەسەلاّت کەوتە دەست قاجاریەکان، ئاغا محەمەد خانی قاجار ڕقی لەدەوڵەتی زەند بوو وەزمانی ئەوکاتی دەوڵەت لوڕی بوو، بۆیە دەستی کرد بەگۆڕانکاری لەناوچەی لوڕستان، ئاغا محەمەد بەزۆر جێگۆڕکێی بەلوڕەکان کرد بۆقەزوین، لوڕستان بەهۆی سیاسەتی دەسەلاّتی قاجاریەوە نائارامی و بێسەروبەری بەخۆیەوە دی، لەناو لوڕەکان کرووپی نەتەوەی دروست بوو بووەهۆی ناکۆکی و زۆرێك لەمانە گەڕانەوە بۆژیانی ڕەوەندی .

لوڕ لەسەردەمی مەشروتیەتدا: یەکێك لەمەزنترین چالاکیەکانی لوڕ بەشداری کردن بوو (جنبش مشروته ایران)، لوڕ بەتایبەتی ئێلی بەختیاری دەورێکی بەهێزیان هەبوو لە شۆڕشی دەستوری، لەحوزیرانی ساڵی ١٩١٩ دەستی پێکرد سوپای سەردار ئەسعەد بەختیاری گەیشتە قوم و سوپای سپیهدار



ئەعزەم گەیشتە یەنگی ئیمام، بەپێچەوانەوە **ڕزگارکردنی تاران لەلایەن سوارەی بەختیاریەوە** سەعدلدەولە سوپای بەسەرکردایەتی ئەمیرمەفخەمی بەختیاری ناردە کەرەج، موجاهیدینی بەختیاری بەرەو تاران جوڵان و لەنزیك تاران لەباکور پەیوەندیان کرد بەفەرماندە سپهدار ئەعزەم بەرگری کەم کراو لەپاشاندا تاران ڕزگارکرا .

**لەسەردەمی پەهلەویدا**: لەسەرەتای سەردەمی ڕەزاشای پەهلەوی دا ئێران نائارامی بەخۆیەوە بینی، ناوچە عەرەب نشینەکان لەژێردەسەلاتی شێخ خزعل ئەلکعبی دا بوو، ناوچە کوردنشینەکان زۆریان لەژێر دەسەلاتی سمکۆی شکاکدا بوو. لەباکوریش کۆماری جەنگەڵ و نارێکی نەبوونی یەکێتی لەئێراندا، یەکێك لەو نائارامیەکان یاخی بوون و جەردەیی و هۆزە لوڕەکان بوو، لەساڵی ١٩٢٣ هۆزەکانی لوڕ و سوپای حکومەت کەوتنە شەڕەوە لەشارەکانی بروجەرد و خوڕەم ئاباد، هێزی هۆزەکانی لوڕ پێکهاتوون لەئێلەکانی (بایرەوەنی، سەگوەند، چنگنی، پاپی) لەمانگی نۆی هەمان ساڵدا سوپای حکومەت توانی گەمارۆی خوڕەم ئاباد بدات و کۆنترۆڵی بکاتەوە، پاشان حکومەت لێبوردنی گشتی دەرکرد و ئێلە لوڕەکان چەکەکانیان تەسلیم کردەوە و هەندێك لەسەرانی ئێلەکانیش گیران و لەسێدارەدران، لەساڵی ١٩٢٤ دووبارە هۆزەکانی باکوری خوزستان دەستیان بەشۆڕش کردەوەو بەردەوام بوو

تاکۆتایی ئەو ساڵە، حکومەت دەستی کرد بەتۆپبارانکردنی ڕەوەندنەکان و کۆنترۆڵی شاری خوڕەم ئابادی کرد و هۆزە لوڕەکان شکستیان هێناو چوونە ژێردەستی حکومەت[٢٢٩] .

## هۆزی بەختیاری :

ساڵانێکی زۆرە بەختیاریەکان لەباشوری ڕۆژئاوای ئێران نیشتەجێن و دراوسێی ڕۆژهەلاتی کوردستانن، ئەوان ڕێژەی دانیشتوانیان ئێستا بەسەروی چوارملیۆنەوە مەزندە دەکرێت، بەگوێرەی زانستنامەی ئێرانی زیاتر لەپارێزگاکانی (چوارمەحاڵ و بەختیاری، لوڕستان، خوزستان، کاهگلیووە،بوویەرئەحمەد، ئەسفەهان) نیشتەجێن، لێکۆلینەوە شوێنەوار ناسەکان باس لەوەدەکەن مرۆڤ زیاتر لەچل هەزار ساڵە لە دەڤەری بەختیاریەکاندا دەژین، بەختیاریەکان لەزەویەکی بەپیت بەرەکەت ژیاون کە پڕبوو لەبەخت و شانس ڕەنگە ناوی بەختیاری لەمەوە وەرگیرابێت بەختیاری بەمانای بەختەوەر بوون دێت، سەر زەوی بەپیت و بەرەکەتی دەڤەرەکەیان هەلی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بۆ ڕەخساندوون، سامانە سروشتیەکانی ناوچەکەیان لەوانە ڕووبارەکان و دارستانەکان و کێڵگە بەپیتەکان و هەروەها زۆربوونی ڕێژەی باران، بوونی بەنداوی گەورە و گەلێك زنجیرەچیا ئەم ناوچەیەی کردۆتە شوێنێکی لەبار بۆ نیشتەجێ بوون، بەختیاریەکان لەزستانان بەرەو خوزستان کۆچ دەکەن، لەهاوینایش بەرەوکاهگلیووە و بوویەرئەحمەد ناوچەکانی دەوروبەری ئەسفەهان دەچن، لەمیانەی ئەم کۆچەدا ڕووداو گەلی زۆر ڕوودەدەن لەوانە لەدایك بوونی منداڵ کەبەرێورەسمێکی زۆر جوان ئەنجام

---

[٢٢٩] ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد،هۆزی لوڕ، ٢٠١٨/٦/٢٠ .

دەدرێ، هۆز لەم کاتەدا خەریکی پێوانی ڕێگایەکی دوور و درێژەو ئەم ڕووداوەش پـێش دێت، ژەنیاران سازگەلی زوڕنا دەژەنن و دەهۆڵ دەکوتن ئەم سازە هەم لەشایی و هەم شین دا بەکاردێت، ئەمەش لەبەرئەوەیە منداڵەکە قیڕەو قیژەی دایکەکە عەزێتی نەدات، ژنەکە دەبەنە سەر دووتاشە بەردوو هەروەها موسیقا لێدەدرێ و ژنەکان گۆرانی دەڵێن، پارچـەکی سـپی دەدەنـە سـەر ژنەکـە، کاتێـك منداڵـە لـەدایك دەبێـت ئەنـدامانی هـۆز هەڵدەپەڕن و شایی دەکەن. ژنانی بـەختیاری زیـاتر لەچـك و مینـا و تـەنپۆش و جلێقـا وەك پۆشاك بەکاردەهێنن، بەڵام ژنە مەزنەکانی هـۆز ڕەش دەپۆشـن بۆئـەوەی شـان و شکۆی ئـەوان زیـاتر بێـت، پیاوانیشـیان بیجامیـەکی بـەناوبانگ و سـەرپۆش و چـۆقە و پـانتۆل ببلیـت و پێئـەبزار لەبەردەکـەن، زۆربـەی ئـەو ڕەنگانـەی لـەجل و بەرگـەکان بەکاردەهێنرێن لەسروشتەوە وەرگیراون، لەنێو بەختیاریەکاندا کاتێك کەسـێك دەمرێـت شینێکی تایبەتی بۆدەکەن، ئەوان هەموو بەختیاریەکان بەبنەماڵەی خۆیان دەزانن، بـۆ شـین و ڕۆڕۆ موسـیقایەکی تایبـەتی خۆیـان هەیـە، عـەباس بـەختیاری دەڵـێن: ئەگـەر سەرنجێك بدەین لەو بەختیارانەی ئێستا کۆچبەری دەکەن و ئەوانـەی لـەناو شـارەکاندا ماونەتەوە، تێدەگەین چ گۆڕانکـارێکی مـەزن بەسـەر زمانەکـەدا هـاتووە، گۆڕانکاریـەك بەئاراسـتەی تواندنـەوەدا، بەتایبـەتی ئـەو کەسـانەی لـەئیزە و شوشـتر و کـاهگلیووە نیشتەجێ بوون، جیاوازیەکی زۆریش هەیە لەنێوان لوڕی گەورە و لوڕی بچووك، پاشـان لەسەرەتای دروستبوونی کۆماری ئیسلامی ئێران هەوڵێکی زۆردراوە تا لـەئاین و زمـانی بەختیاریـەکان گۆڕانکـاری دڵخـوازی خۆیـان بکـەن، بەختیاریـەکان لەمێـژووی دێـرین و هاوچەرخی ئێران دا ڕۆڵی سەرەکیان گێڕاوە. یـەکێك لەتایبـەت مەندیـەکانی پێکهاتـەی کۆمەڵایەتی هـۆزی بـەختیاری هـەبوونی یەکـە جـۆراو جۆاکیەکانـدا کەلەهـەناوی هـۆزدا جێدەگرن، کەلەڕەشماڵێکەوە دەست پێدەکات هەتا هۆز شۆڕدەبێتەوە ڕشماڵ، ئەولاد،

تەش، تیرە، تائیفە، باب، لق، هۆز ئـەو زنجـیرە ئەسـتونیەی هـۆزی بەختیاریـە کەهـەر کامەیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، گرنگترین ئەرکی بەڕێوەبەرە سیاسیەکانی بـەختیاری هەماهـەنکردنی کـات و چـۆنێتی کـۆچ و چارەسـەر کردنـی کێشـەناوخۆیەکانی هۆزەکـە بووە، هەندێك جاریش سەرۆك هۆزەکـان بەمەشـەوە نەوەسـتاون و بـەوەرگرتنی بـاج و سـەربازگرتن و پێکهێنـانی دەسـتەو تـاقمی جیاجیـا هـەوڵیان داوە دەسـەڵاتی خۆیـان بەسـەر ژێردەسـتەکانیان پێشـان بـدەن، لەمێـژووی هاوچـەرخی ئێـران دا دەوڵەتـە ناوەندیـەکان لەڕێگـەی دروسـتکردنی پەیوەنـدی تۆکمـە لەگـەڵ سـەرۆك هۆزەکـانی بـەختیاری توانیویانـە ئـەوان بۆئامـانجی خۆیـان بـەکاربهێنن تەنانـەت پـاش هـاتنی ئینگلیزەکـان بۆدەڤـەری بەختیاریـەکان و دۆزینـەوە و دەرهێنـانی نـەوت و هـەڵکۆڵینی شوێنەوارە مێژوویەکان، ئەوان بۆڕازی کردنی سەرۆك هۆزەکان پشکی٥٪ نەوتی شـاری (مەسجد سلیمان) یان پێداون، بەم جۆرەش بەختیاریـەکانیان کردۆتەلەمپـەر لەبـەردەم تەقاندنەوەی بۆڕیە نەوتیەکان .

بەختیاریەکان وەك هۆز و نەتەوەکانی تری ئێران خەریکن لەژێر تەوژمی ئەسمیلاسـوێن دا دەتوێنەوە، چەند سـاڵ پـێش ئێسـتا لەزنجیرەیـەکی تلفزیـۆن لـەژێرناوی سـەرزەوی کۆن لەتلفزیۆن فەرمی ئێـران دا بڵاوکرایـەوە کەسـوکایەتی بـەو هـۆزە کردبـوو ئەمـەش گـەلێك نـاڕەزای لێیکەوتـەوە بەختیاریـەکان ڕژانـە سەرشـەقەمەکان. ئێسـتا گـەلێك بەختیاری لەئـەمریکا دەژیـن و مـەزنترین ڕێکخـراوەی بەختیاریـەکانی جیهانیـان هەیـە، بەرنامەی زۆر و جۆربەجۆر بەڕێوەدەبەن[٢٣٠]. ئەم هۆزە لەتایفەی لوڕی گەورەن، لەدوو گـەورە لقـی چـوار لـەنگ و حـەوت لـەنگ پێکـدێت، چـوار لەنگیـەکان لە(کرماشـان، ئیسفەهان، شوشـتەر، چـیای زەرد، چـیای سـەوز) نیشـتەجێن، حـەوت لەنگیـەکان لـە

[٢٣٠] کەناڵی ئاسمانی NRT : ڕاپۆرتێك لەسەر هۆزی بەختیاری : ٢٠١٨ .

(بـرۆجیرد، گۆڵپایـەکان) نیشـتـەجێن پێکـەوە شەسـت هــەزار خێـزان دەبـن، هــەردوو بەشەکەیان سی و پێنج تیرەن، ڕۆژهەلاّتناسی بەناوبانگ (کەرزن) ژمـارەی دانیشـتوانی بــەختیاری لەسـاڵی (١٩١٨) بەحەڤـدە هــەزار کـەس دەخـەملّێنێت[٢٣١] . مێژوونووسـی گەورەی کورد شەرەفخانی بەدلیسی لەشەرەفنامەدا دەلێت: چوارسەد بنەماڵـەی چـەند هۆزێکی کورد بەسـەرۆکایەتی حەسـەن فەسـڵەویی لەسـەدەی شەشـی کۆچـی (هەشـت سـەدە پـێش ئێسـتا)، لەناوچـەکانی شـامات و کێـوی سمـاق لـەڕۆژئاوای کوردسـتان و سوریاوە بەرەو زنجـیرە چـیاکانی خـوارووی زاگـرۆس کۆچـیانکرد، لەنێویانـدا هـۆزێکی بچووك هەبوو بەناوی بەختیاری، ئـەم کۆچـکردنە هۆیەکـەی نـەزانراوە، بـەناوی کۆچـی هەزار سـوارەی جـەنگی نـاوی ڕۆیـوە، دوای گەیشـتنیان بـەم هەرێمـەی ئێسـتا کـەپێی دەووتـرێ لوڕسـتان، سـەرۆکی هـۆز حەسـەن فسـلەویی بـەخێرای هـۆزە خۆجێیـەکانی ناوچەکەی خستە ژێر دەسەلاّتی خۆیەوە، حکومەتێکی سەربەخۆی پێکهێنـا لەمێـژوودا بەناوی حکومەتی ئەتابەکانی فەسڵەویی(تەتابەکانی لوڕ)ناسراوە، بەدەسـتە وەرگـرتنی دەسـەلاّتی ناوچـەکە لەلایـەن حەسـەن فەسـڵەوی و هێزەکەیـەوە، هۆزەکـانی دیکـەی ڕۆژئاوای کوردستان لەلایەن تەتەرەوە ئاگادارکران، ئەوانیش لـەڕۆژئاوای کوردسـتانەوە بـــەرەو لوڕســـتان کۆچـــیانکرد، بەلوڕســـتان و ئـــیلام و بوویەرئەحمـــەد و کێوگیلۆیـــەدا بلاّوبوونەوە، دوای چەند سەدەیەك هۆزی بەختیاری لوڕی کـورد بـوون بـەدوو بەشـەوە بەشی چوارلەنگ و بەشی حەوت لەنگ.لەمێژووی کوردا کەم نین ئەو ئافرەتانەی لەسای زانـــایی و لێوەشـــایی و کەســـایەتی بەرزیانـــەوە ســـنوری دابوونـــەریتی داســـەپاوی کۆمەلاّیەتیان تێکشکاندووە، نەك هەر بوونەتە جێـی سـەرنج و ڕێـزی ڕەگـەزی نێرینـە، بەڵکو پێشەنگی و سەرۆکایەتی هۆز و هەرێمی خۆیانکردووە، لەگۆڕەپانـەکانی جەنگـدا

---

[٢٣١] شێخ محەمەدی مەردۆخ : مێژووی کورد و کوردستان ،و زانەر محەمەد ،چ١ ،٢٠٠١ ،ل٨٧ .

ناوبـانگی ئازایـەتیان سـنوری کوردسـتانی تێپـەڕادووە یـەکێ لـەو ئەسـتێرەگەش و بلیمەتانەی کوردەواری بی بی مەریـەم بەختیاریـە، بـی بـی مـەریم لەسـەردەمی خۆیـدا ناوبـانگی ئازایـەتی سـنورەکانی کوردسـتان و ئێرانـی بڕیـووە، بـی بـی مـەریم لەسـاڵی ١٨٧٦زاینی لەنێو هۆزی بەختیاری لـەدایك بـووە، بـاوکی حوسـێن قـولی خـان سـەرۆك هۆزی گەورەی بەختیاری بوو لەتەمەنی بیست و چوار ساڵی بووبەحکومڕانی بـەختیاری ،حوسـێن قولیخـان چـەند شـەڕ و شۆڕشـێکی گـەورەی خوێنـاوی لەگـەڵ هۆزەکـانی



بیبی مەرێم

دەوروبەری هەڵگیرساند، توانی هەموویان تێکبشـکێنێ و هۆزەکـانی چـوارلەنگ و چـوارمەحەل و بایـادی بخاتــە ژێرڕکێفی خۆیەوە، بۆ بـەهێزکردنی دەسـەڵاتی یارمـەتی ســەربازی لەحکومــەتی قاجــاری وەرگــرد و لەلایــەن ناسرەدین شای قاجار نازناوی ئێلخان و نـازم بـەختیاری (چاودێری بەختیاری) پێبە خشرا، بەڵام دوای ئەوەی بـۆ مــاوەی پــازدە ســاڵ پــارە و ســامان و هێزێکــی زۆری بەیەکـەوە نـاو حکومــەتێکی سـەربەخۆی پێکهێنـا، کارەکـانی حوسـێن قـولی خـان ناسرەدین شالێی کەوتەترس و دڵەڕاوکێ، بۆیە براکەی **ظل سولتان** کـە حـاکمی شـاری ئەسفەهان بوو ڕاسپارد بەناوی سەرانەوە چـاوێك بـەبارودۆخی بـەختیاری و دەسـەڵاتی حوسێن بخشێنێ، کوڕەکەی دوای سەردانەکەی لە ڕاپۆرتێك دا بۆباوکی نووسی تـەواوی ئەو ڕاپۆرتانەی پێشوو لەلایەن فەرهاد میرزا حـاکمی فـارس (شـیرازی ئێسـتا) لـەبارەی هێز و دەسەڵاتی حوسێن قولیخانەوە نوسـراون، نـەك هـەر ڕاسـتن بـەڵکو بەکەمیشـەوە نوسـراون، حوسـێن قـولی خـان دەسـەڵاتێکی سـەربەخۆی پێکهێنـاوە و بـۆ دوا ڕۆژی دەسەڵاتەکەی ئامانجی گـەورەتری هەیـە، ناسـرەدین شـا دوای خوێندنـەوەی ڕاپـۆرتی

کوڕەکەی بیری لەکوشتنی حوسێن قولیخـان کـردەوە، **ظل سـولتان** ی کـوڕی ڕاسـپارد بەهـەر شـێوازێك بـووە کێشـەی لوڕسـتان و حوسـێن قولیخـان بنبڕبکـات، پاشـان **ظل سولتان** بۆ سەردانێکی فەرمی حوسێن قولیخانی بانگهێشتی ئەسفەهان

کرد ئەمیش بانگهێشتەکەی قبوڵکرد و لەگـەڵ دوان لـەکوڕەکانی چـوو بـۆ ئەسـفەهان، لەلایەن کوڕی شا و دەستەودایرەی حکومەت پێشوازی گەرمی لێکرا، ئـەوجا بردنـی بـۆ



سەردار ئەسعەد

بینینی مەشقی سوپا، کاتێك حوسێن قولیخان چاوی بەمەشقی سوپای ئێران کەوت بەگاڵتەوە وتی بەشازدە ظل سوڵتان سەد سواری بەختیاری بەرامبەرە لەگـەڵ هـەزار شـەڕکەری سـوپای ئێوەدا، **ظل سـولتان** هیچـی نـەوت بـەڵام لـەدڵی خۆیـدا زیـاتر سـوربوو لەسـەر کوشـتنی، بـەناوی سـەردانی دامودەزگـای حکومەتـەوە هـەردوو کوڕەکـەی کـەناویان ئەسـفەندیارخان و عـەلی قولیخـان جیـاکردەوە، دوای لـەنێوبردنی پاسـەوانەکانی و دەسـت بەسـەرکردنی کوڕەکانی حوسێن قولیخان دەباتـە نـاو کۆشـکی خۆیـەوە، پێکـەوە خـواردن دەخـۆن، ئەوجا قاوەی بۆ دێنن کە ژەهرێکی کوشندەی تێکرا، حوسێن قولیخان بە خواردنـەوەی قاوەکـە تێکدەچـێ و توانـای بـەرگری نـامێنێ، سـەربازەکان بـەزنجیر دەیبەسـنەوە دەیخەنە نێو زینـدان، پـاش دوو ڕۆژ بـەدەم ئـێش و ئـازارەوە گیـان لەدەسـت دەدات، حوسـێن قولیخـان لـەماوەی ژیانیـدا دەژنـی هێنـا، لـەو دەژنـە هـەژدە منـاڵی هـەبوو، دوازدەیان کچ و شەش دانەیان کوڕ بوو، یەکێ لەکچەکانی نێونرا مەریم ، بی بـی مـەریم لەکاتی کوژرانی باوکی تەمەنی نۆساڵ بوو، هەر لەوتەمەنە سەرنجی بنەماڵەو

خزمان و هۆزەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا بوو بەهۆی سوارچاکی و تیرهاویشتنی خێـراو، بی بی لەتەمەنی پازدەساڵی بێ ویست و ئارەزووی خۆی لەجێ نیشـنی بـاوکی کـەناوی

ئیبراهیم خانی زەرغاموی بەختیاری مارەکرا، بەهۆی ناوبانگی بنەماڵەکەی و لەلایەکی تر ژنی حکومڕانی لوڕستان بوو، بۆ هەر شوێنێك بڕۆیشتایە هێزێکی ئازاو تەیار لەگەڵ دەچوو، ئەم هێزە بەماوەیەکی کەم کەوتە ژێرفەرمانی بی بی مەریەمەوە، ئەو شەڕ و پێکدادانەی لەدوای کوژرانی باوکی و براکانی لەنێوان سوپای ئێران و هێزەکانی بەختیاری دا بەرپا دەکران، مەریەم بەرە بەرە لەنێوجەماوەری لوڕستاندا وەك فەرماندەیەکی ئازا و لێهاتوو ناوبانگی دەرکرد، لەوسەردەمەدا ئینگلیز و ڕووس بەرێککەوتنێکی نهێنی ئێرانیان لەنێوان خۆیاندا دابەش کردبوو بۆیە ڕاستەوخۆ پشتگیری دەوڵەتی ئێرانیان دەکرد، بەلام ڕۆڵەکانی لوڕستان بەخۆینی خۆیان پارێزگاریان لەو هەرێمە دەکرد.

لەساڵی ۱۹۱۰زاینی بی بی مەریەم وەك بەشێك لەفەرماندەی هێزەکانی بەختیاری لەگرتنی شاری ئەسفەهاندا ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا، ئەم ڕووداوە هاوکات بوو لەگەڵ پەرەسەندنی شۆڕشی نوێخوازی گەلانی ئێران لەدژی حکومەتی قاجاری، بی بی مەریم هانی براگەورەکەی دا بۆ داگیرکردنی تاران بکەوێتە ڕێ، نەخشەی گرتنی تاران کێشکرا، بی بی بەنهێنی لەگەڵ دەستەیەك لەئازاترین هێزەکەی ژێردەستی فەرمانی خۆیەوە چووە نێوتاران لەنزیك باڵەخانەی پەرلەمانی ئەوکاتی تاران خۆیان حەشاردا، هێزەکەی دیکەی بەختیاری بەفەرماندەیی سەردار ئەسعەدی برای لەباشور و خۆرئاوای تارانەوە لەشکر و سەنگەرەکانی سوپای ئێرانیان تێکشکاند سەرکەوتووانە چوونە نێوتارانەوە، بی بی مەریەم و هێزەکەی لەحەشارگە هاتنە دەرەوە و لەنێوجەرگەی تاران هێرشیانکرد سەر دامودەزگاکانی ئێران، شاری تاران بەتەواوەتی کەوتە دەست هێزەکانی کوردەوە، فەرماندەی هێزەکانی ئێران ژنەراڵێکی ڕووسی بوو بە ناوی لیاخۆف بەچاودێری سەرکۆنسوڵی ڕووس و بەریتانیا چووە مزگەوتی سوپا

سـالار لەبـەردەم سـەردار ئەسـعەد چـۆکی دادا بەنیشـانەی تەسـلیم بـوون شمشـێر و چەکەکەی لەبەردەم سەردار ئەسعەد دانـا، دوای داگیرکردنـی تـاران ناوبـانگی بـی بـی مەریم لەهەموو ئێران دا بڵاوبووەوە، لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی بی بـی پشـتیوانی دەوڵەتی ئەڵمانی کرد دژبە دەوڵەتی ئینگلیز و ڕووس، لەساڵی ١٩١٩ز بـی بـی هێزێکـی لـەئازاترین چـەکدارانی خـۆی نـاردە کەنـداو بـۆ یارمـەتی ئەفسـەری ئـەڵمانی ویلـهۆم واسمۆس ئەم هێزەی کـوردی لـوڕ تـوانی تـەنگ بەسـوپای ئینگلیـز و ڕووس هەڵبچـنن، هەرچەندە هەندێك بەگزادە و بنەماڵەی بـی بـی مـەریم لایـەنگری ئینگلیـز بـوون، بـەڵام لێوەشـاوی ناوبـانگی بـی بـی مـەریم نـەیانتوانی ڕێگـری لێبکـەن، بـی بـی بێگوێدانـە ناڕەزایەتی گەورەکانی هۆزەکەی بڕیاریدا لەدژی ئینگلیز شـەڕبکات نـەك هەرهۆزەکـەی جەمارەی لوڕستان و ئیلام و بوویەرئەحمەدی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، ماڵەکـەی بـی بـی لەبـەختیاری بووبـە پەناگـە و مـاڵی هـەموو ئـازادیخوازانی ئێـران، بـی بـی لەسـاڵی ١٩٣٨ی زایـنی لەئەسـفەهان کۆچـی دوای کـرد لەشـاری ئەسـفەهان، پـێش مردنـی بیرەوەریەکانی خۆی نوسی و تێدا جگە لەگێرانەوەی ژیانی خۆی و بیرەوەری منداڵی و پەیوەندی بنەماڵـەی سـەرۆك هۆزەکـانی لوڕسـتان و هـەروەها ئامـاژەی بەنەهامـەتی و چارەڕەشی و چەوساندنەوەی ژنی کوردی لوڕ و ئێران بەگشتی کردووە[٢٣٢] .

---

[٢٣٢] سیروان کاوسی: ماڵپەڕی مالمۆکورد، لاپەڕیـەکی تـازە لەمێژوویـەکی ونبـوو ئەسـتێرەیەکی گـەش ئاسمانی گەلێکی نووستوو .

## هۆزی لەك :

لەك یەکێکە لەهۆزە گەورەکانی کورد خاوەن سەدان تیرەیە، ئـەم هـۆزە نیشـتەجێی دامـێنی زنجـیرە چـیای پـان و بـەرینی زاگـرۆس بـوون، لەشـەرەفنامەدا وەك هـۆزێکی گـەورەی کـورد نـاوی هـاتووە، فلادێمێـر مینورسـکی بـەهۆزێکی کۆچـەری کـورد نـاوی بردوون کە خەریکی بەخێوکردنی مەڕومالآت بوونە. ئەم هۆزە خاوەن کلتـورو شـێوەزار وجل وبەرگی تایبەت بەخۆیەتی، لەڕووی دینەوە زۆربەیان موسـڵمانن بەشـێکی زۆریـان شیعە مەزهەبن کـە لـەئێران و خـوارووی عێـراقن لـەکی فـەیلین. لەپاکسـتان و باشـوری کوردسـتان و هـەرێمی داغسـتانی ڕووسـیا هـەن، لەکـەکانی بـاکوری کوردسـتان سـونە مەزهەبن، لەئێران بەتایبەت شارەکانی (سحنە، نوراباد، نهاوەند) لەگـەڵ هەنـدێ لـەکی کوردستان پەیڕەی ئاینی یارسانن(ئەهلی حەقن).

لەك وشەیەکی کۆنەو لەدێر زەمانەوە بەکارهاتووە بەچەند واتایەك دێت لەوانە:

لەوانە بەمانای ژمارە هەر شتێك بگاتە سەد هەزار پێدەگوترێت (لەك)، لەزمانی هندی و پاکسـتانبش (لاك) سـەدهەزار هـاتووە (لکشـم)یش هـەر بەومانایـە دێـت، لـەزمانی بلوجستان بەمانای هەزار دێت .

١- بەو خێلە کوردانە وتراوە کە دانیشتووی دەشـت و سـەحرا بـوون و ئەسـپ سـواری زۆر بێشوماریان هەبووە کەزیاتر بووە لەهەزار پیاوی شەڕکەر .

٢-بەمانی سوپایەکی تاچاو بڕبکات ئەوەندە زۆر و گەورە، لەکتێبی فەرهـەنگی دکتـۆر ئیزۆڵی کوردستانی باکوردا هاتووە دەڵی هۆزی لەك ئەوەندە گەورە بـوون ڕوویـان ئەکردە هەر شـوێنێك ئـەیان ووت لـەك هـات، کـەریم زەنـد مێـژوونووس و گەڕیـدە

هـەمان بۆچـوونی هەیـە کەسـووپایەکی هـەزار پیـاوی بـەرەو ژوور بـەواتای لـەک دێت[٢٣٣].

مـیرزا شـکراولاّ سـنندجی لـەنێوان سـالآنی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵـێ: ئـەم هـۆزە پێشـتر خێوەت نیشین بوون و بەهەوارچیەتی ژیاون، بـەلاّم نزیکـەی هەشـتا سـالێك دەبـێ کـە نیشـتەجێ بـوون و هەنـدێکیان لەناوچـەی (اسـفند ئابـاد)ی کوردسـتان لەگونـدەکانی (چوارگا، عـەلی ویری)هتـد... دانیشـتوون، خـەریکی کشـتوکاڵن بەشـێکی دیکـەیان لـە گوندەکانی بەرزاب و هتد...نیشـتەجێن، زۆرێکیشـیان لـەکولیایی، کرماشـان، هەمـەدان دەژین، هەندێکی کەمیان بەهۆی بارودۆخی ڕۆژگارەوە کۆچیان کردووە بۆ ئەسـفەهان* لەوێ نیشتەجێن [٢٣٤]. ئەم هۆزە لـەپێنج تـیرە پێکهـاتووە (لالـەیی، دولفـان، تورهـان، دالۆەند) زۆربەیان شیعەن، لەخانەقین و خوڕەم ئاباد و ئەلشەتر و ناوچەکانی لوڕسـتان نیشتەجێن، لەکەلیایی، هەمەدان، ئیسفەهان، لەنێوان دەوڵـەت ئابـاد و سـوڵتان ئابـاد و کەنارەکانی سنە و لەیلاخیش دەبینرێت،دەسـتەیەکیان لەسـەڵماس نیشـتەجێن، ڕەنگـە لەشیرازەوە هاتبن[٢٣٥] .

---

٢٣٣ ڕێبین نامیق لەك: تۆڕی کۆمەلاّیەتی فەیس بووك هۆزی لەك، ٢٠١٨ .

٢٣٤ میرزا شکرولاّ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کـورد لەکوردسـتانی ئـەردەلاّن، و ئـەنوەر سـوڵتانی، چاپخانەی ژین–سلێمانی، چ١، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل ١١٣–١١٤ .

٢٣٥ شێخ محمەدی مەردۆخ: مێژووی کورد و کوردستان ،و زانەر محەمەد ،چ١ ،٢٠٠١ ،ل٨٧–٨٨ .

*ئەسفەهان: یەکێکە لـەپارێزگاکانی ئێـران، ناوەنـدی پارێزگـا شـاری ئەسـفەهانە، لـەباکوری لەگـەڵ پارێزگاکـانی مەرکـەزی و قـوم و سمنـان هاوسـنورو، لای ڕۆژهـەلاّتی پارێزگـای یـەزد، لەباشـوری پارێزگاکانی فارس و کوهگلیوویە و بویرەجمەدە، لەڕۆژئاوادا لەگەڵ پارێزگای لوڕستان و چوارمەحاڵ و بەختیاری و خوزستان هاوسنورە .

## هۆزی زەند :

زەنـد نـاوی یەکێکـە لەتایفـەکانی لـەك، ئـەم لەکانـە لەڕەگـەزی ئـەمیر زادەکـانی حەسنەوی کوردی بەئەسڵ شـارەزوور بـوون، بەهــەر هۆکارێـك بێـت کۆچـیان کـردووە، ئەمڕۆ زەندیەکان لەپارێزگاکانی خۆراسـان و لوڕسـتانی بـاکور و کوردسـتان بەتایبـەتی سنەو مەلایەر بڵاوبوونەتـەوە نـاوی زەنـدیان کـردووە بەشـۆڕەت و ناسـنامە و شـانازی پێوەدەکەن بۆ نموونە تایفەکانی (زەندی، پوورزەند، زەندوکیل، زەندکەریمی، زەندخان شەهری، زەندباقی، زەند کەریم خـانی، زەنـد لـەك)[٢٣٦]. مەیجـەر سـۆن دەڵێـت: زەنـد هۆزێکی کشتوکاڵکاری چاکن، لەهەرێمی خۆیاندا نیشتەجێن، حەمید ئاغا کە بە(حەمیـد ڕەش) ناسراوە سەرۆکیانە (حەمید ئاغـا و تـاهیر خـان) لەبنەماڵـە کۆنـەکانی (زەنـدن) حەمیـد ئاغـا پیـاوێکی بـەهێز و شایسـتەیە، دژی تورکـەکان بـووە، مـاوەی چوارسـاڵ لەلایەن تورکەکانەوە بەهۆی یاخی بوونیەوە زیندانی کرابوو، هۆزەکە سونەی شـافیعین و بەدیالێکتی کرمانجی خواروو قسە دەکەن، زەندییـەکان بـەوەفادری و پابەنـدبوونیان لەبەجێگەیاندی وادە و پەیمانیان ناسراون .

هۆزەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆزەی کە (کەریم خانی زەند) لەماوەیەکدا سەرۆکی ئێران بوو، دوای پەرت و بڵاوبوونەوەیان لەشیراز هەنـدێکیان گەڕانـەوە بـۆ صـلاحیە (کفـری) ئێستا، تیرەی عەلییان پێیان وایە وەچەی ڕاستەخۆی کەریم خانن[٢٣٧]. زەنـد هـۆزێکی کوردی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، لە(١٧٥١–١٧٩٤) زایـنی حـوکمی ڕۆژئـاوای ئێرانیـان کـردووە، زەنـد لەبنەماڵـەی لـەکن، (نادرشـا) لەسـاڵی (١٧٣٢) زایـنی، ئـەوانی لەزێـدی باپیرانیان لەچەقی کێوەکانی زاگرۆسەوە بۆ خۆراسان ڕاگوێزاوە، بەڵام پاشان کە (نادر شا) کوژرا، زەندەکان بەسەرکردایەتی (کەریم خانی زەند) *بەشەڕ توانیان ڕێـی خۆیـان پاك بکەنەوە و بـۆ زێـدی خۆیـان بگەڕێنـەوە، یـەکێك لەنەریتـەکانی زەنـد بـریتی بـووە

---

[٢٣٦] گۆڤاری مێرك: کەریم خانی زەند ،ومەحمود عومەر لە سایتی گەنجینە، ژمارە٦١،٢٠١٠ ،ل٢٣–٢٤.

[٢٣٧] مێجـەرئی .بـی .سـۆن: چـەند سـەرنجێك دەربـارەی هۆزەکـانی کوردسـتانی خـواروو، و نـەجاتی عەبدوڵڵا ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ،٢٠٠٧ ،ل٩٢–٩٤ .

لەوەی کە ژنەکانیان لەکاتی شەڕو هێرشدا بەشداری بکەن و یارمەتی مێردەکانیان بدەن، ناوبانگی زەندییەکان بەناوی (کەریم خانەوە) بەندە، کەریم خان توانی لەشکرێکی گەورە لەعەشایری زاگرۆس پێك بێنی و هاپەیمانی لەگەڵ بیورۆکرات و گەورە کەسایەتییەکانی شارە گرنگەکانی ڕۆژئاوای وڵاتی ئێران دابمەزرێنێ، ئەو هاوپەیمانییە شارەکانی (ئیسفەهان، شیراز، تەورێز، کرمان)ی لەخۆگرتبوو[٢٣٨] . پاش کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی زەندیەکان لەساڵی (١٧٩٤) لەئێران، بەشێکیان ڕوویان کردە دەوڵەتی عوسمانی و لەڕۆژئاوای ڕووباری سیروان نیشتەجێ بوون، پاش چۆڵکردنی شارۆچکەی (زەنگاباد) لەهۆزی قەرەلووسی لەلایەن شازادەی قاجاری(محەمەدعلی میرزا) و فشاری هۆزی جاف، ئەم هۆزە لەم شارۆچکەیەو دە گوندی دەورو بەری نیشتەجێی بوون[٢٣٩] . زەند عەشیرەتێکی نیشتەجێ و کشتوکاڵکارن، لەکۆتایەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەنزیکەی (٤٠٠) خێزان خەملێنراوە، پێش جەنگی یەکەمی جیهانیش ژمارەیان بەشەش سەد ماڵ مەزندەکراوە، بەشێکی تری ئەم هۆزە

---

* کەریم خان لەسەرەتادا سەربازێکی سوپای نادرشای ئەفشار ،دوای مەرگی نادرشا گەڕایەوە ناو هۆزەکە و خەڵکێکی زۆری لەدەوری کۆبووەوە، بەکەڵك وەرگرتن لەباروودۆخی ئالۆزی ناوچەکە هێزێکی باشی کۆکردەوە و لەگەڵ دووخانی بەختیاری بەناوەکانی (ئەبولفەتاح خان، عەلی مەردان خان) هاوپەیمانی پێك هێنا و یەکێکی نزیك لەدایکیەوە لەبنەماڵەی سەفەویەکان بەناوی (ئەبوتوراب میرزا) یان بەپاشا دانا، دوای ماوەیەکی کەم (عەلی مەردان خان) لەهاوپەیمانیەکە پاشکەز بووە و (ئەبولفەتاح خان)ی کوشت، کەوتە پلان بۆ کوشتنی کەریم خان بەڵام لێرەدا سەرنەکەوت، کەریم خان لەساڵی ١٧٥٣ توانی بناغەی حکومەتێکی میلی لەناوچەکانی (شیراز، ئەسفەهان) دابمەزرێت، پاشان تەواوی ناوچەکانی ئێرانی خستەژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، دوای مردنی کەریم خان لەساڵی (١٧٧٩) باری ناوخۆی وڵات تێك چوو، بەهۆی ئاژاوەی نێو بنەماڵەی کەریم خان، بنەماڵەی قاجاریەکان توانیان حکومەتی زەند لەناوبەرن لە ساڵی ١٧٩٤، بەمەش ژمارەیەکی زۆری عەشیرەتی زەند هاتن باشوری کوردستان بوون، لەژێر فشاری دەسەڵاتی قاجاریەکان .

[٢٣٨] ئاکام جمال محمد: مێژوو گۆڤارێکی مێژووی وەرزییە، ژمارە ١٦، ساڵی چوارەم، پایزی ٢٠١٠، ل٥٢.

[٢٣٩] **فؤاد حمة خورشيد: العشائر الكردية ، ط١ ، بغداد ، ١٩٧٩ ، ل١٤٥.**

لەکوردستانی ڕۆژهەلأت دەژین، سنوری جوگرافیای زەند لەباکورەو گـردی کۆشـك، لای ڕۆژئاواوە عەشـیرەتی پـالأنی، بـەدیوی ڕۆژهەلأتـدا ڕووبـاری سـیروان، لەرۆژهەتیشـەوە پێدەشـتی کفـری[٢٤٠]. سـەربە عەشـیرەتی لـەکی لـوڕن، ئەمانـە چـوار تـیرەن لەوانـە (تاهیرخـان، عـەلییان، محەمەدسـالح ئاغـا، غـەنی) کـەریم خـانی* زەنـد پاشـای ئێـران لـەتیرەی عـەلیان بـووە[٢٤١]. بنکـەی سـەرەکی هـۆزی زەنـد (زەنگابـاد)ی ناوچـەی قەرەتەپەیە، لەساڵی (١٨٥٠) هۆزی زەند لەنێوان باجالأنەکانی خانەقین و دەوری بـەری ژیاون لەپارێزگای (کەرکوك ،خانەقین ، سەر ڕێگەی کفـری، سـیروان ،خانـەقین، کـەلار) لەوێش نیشتەجێن و بونیان هەیە[٢٤٢]. لەگوندەکانی (کوڵەجۆ، کۆکس، قوبە، بانسنوق، حاجی لەر، هۆدەلی، خڕسجلە، تەپەعەلی، فەقێ مستەفا، قەرچخ قەرەخ هـتر..) نزیـك رووباری سیروان جێگربـوون و نیشـتەجێن، بەشێکیشـان کەوتنەتـە بـاکوری رۆژهـەلأتی قەرەتەپە. گەورەی ناوداریان (کۆیخا غەنی مەلا دەروێش عەلی ئاغای) زەند بووە[٢٤٣].






کەریم خانی زەند – کەریم زەند – کوێخا غەنی مەلادەروێش – نیزامەدین کوێخا غەنی

---

[٢٤٠] خالد مەحمود کریم : س، پ ،ل١٥٥ .

[٢٤١] هاشم عاسی کاکەیی : س ، پ ، ل ٢٩ .

[٢٤٢] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل١٠١ .

[٢٤٣] حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : س، پ ،ل ١٣٥–١٣٦ .

## هۆزی گەردی :

هێنری فێلد دەڵێت: گەردی هۆزێکی نیشتەجێیە، لەبنەڕەتدا لەناوچەی شەمزینان هاتوون، بەدووەم هۆز لەهۆزەکانی باشوری کوردستانی دادەنێت، لەدوای هۆزی جاف بەشەش هەزار خێزان مەزندەی دەکات [٢٤٤].مارك سایکس دەڵێ: گەردی خێڵێکی بەهێزن و سەرقاڵی بەخێوکردنی مەڕوماڵات و ئاژەڵداری و کشتوکاڵن، هەندێکیان جەنگاوەرن، جل و بەرگیان ئێرانیە و زۆر دەوڵەمەند و سوارچاکن[٢٤٥].هۆزێکی نیمچە کۆچەری بوون لەسەردەمانی پێشودا، هاوینان لەژێر ڕەشماڵ دا دەژیان و زستانانیش لەنێو گوندەکانی خۆیاندا بوون، واتا هەم کشتوکاڵیان کردووە و هەم ئاژەڵیانیش بەخێوکردووە بەمەبەستی لەوەڕاندن، هاوینان ڕان و مێگەلەکانیان بردوون (وەزنێ) . ژمارەیان بەپێی (مارك سایکس) لەسەرەتاکانی سەدەی بیستمدا نزیکەی بەشەش هەزار خێزان مەزندەکراوە، هەرلەو ماوەیەدا سەرچاوەیەکی عوسمانی بەحەوت هەزار خێزان خەملاندوونی. (عباس ئەلعزاوی) دەنوسێ لقێك لەگەردییەکان لەناوچەی (مەلاتیە، شەمزینان)دا دەژیان و لەبنەوانەدا دەچنەوە سەر نورەدینیەکانی پشدەر، لەقۆناغی جەنگی یەکەمی جیهانی ئەو لقەی (جەمیل ئاغای کاکل ئاغا) سەرۆکیان بووە، لەکەنارەکانی دۆڵی بەستۆرەدا ژیاون، هەرچی لقی (مەسجد ئاغا)یە لەناوچەی ڕەواندز دا لەنێوان دۆڵی باستورەو دیرەدا ژیاون، دووگوندیشیان لەناوچەی کۆیە (حەمەئاغا) سەرۆکیان بووە[٢٤٦].

---

[٢٤٤] حەمید گەردی: هۆزی گەردی لەبنەڕتدا ،چ١، بەرگی دووەم ،هەولێر ،چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ،٢٠٠٨ ،ل٤٨٧–٤٨٨ .

[٢٤٥] سایتی خەندان: مارك سایکس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،٢٠١٦/٥/١٦ .

[٢٤٦] خالد مەحمود کریم: س ،پ ،ل١٤٣–١٤٤.



**وێنەیەکی کۆنی هەندێك لەپیاوانی هۆزی گەردی لەسالآنی هەزار و هەشت سەدەکان**

## هۆزی براخۆیی :

هۆزێکی کوردن، ئەم هۆزە لەولاتی بەلوجستانن، هەروەها لەپاکستان لەشاری (ئیخ) لەسنوری باکور لەشاری (کەنتایەکلا) تا لاس بلاوبوونەتەوە، درێژی ئەم دەڤەرە (٢٥٠) میلە، ئەم هۆزە لەدووبەشی مەزن و پێنج تیرە پێکهاتوون کە ئەمانەنن (سراوان، برخۆیی ژووری، براخۆیی ژێری، جاهیلان) ئەم تیرانەش هەر بەشێکن لەهۆزی براخۆیی (کامبرانی، میروانی، گۆرکەناری، شۆمالآنی، قەلەندەرانی) ئەمانە بەکۆچەری لە حەلەبەوە هاتوو بوون لێرەگیرسابوونەتەوە، بەرلەبلوجەکان هاتووبوون بۆکرمان (سێ سەد) هەزار کەس زیاترن، لەهیندستان لەناوچەی سندی براخۆیی هەیە ژمارەیان (٥٠) هەزار کەسن، شەرەفنامە دەڵێت: هۆزی زەنگنە لەئەفغانستانەوە هاتوونەتە بلوجستان، لەئەفغانستان لەخۆرئاوای هەرات کورد هەیە، ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی دەڵێت دانیشتوانی هەرات کوردی خۆراسان یان تاجیکن، هەر لەئەفغانستان دوو هۆزی

کورد هەبوون بەناوی (لوین، تایر) لەکاتی هاتنی مەغۆلەکان کۆچیان کرد بۆ (سوریا و میصر)[٢٤٧] . براخۆیەکانی بەلوجستان دەوڵەتێکی گەورەیان دامەزراند، سێ سەد ساڵ لەبەلوجستان فەرمانڕەواییان کرد، ئیستایش هۆزی بەتوانای کورد لەبەلوجستانی پاکستان هەن، بە ناوی کورد خۆیان دەناسێنن[٢٤٨].ئەم هۆزە لەکەنارەکانی کەلات کە سنوری نیشتەجێ بوونی ئەوانە نیشتەجێن، حکومەتی ناوەندی بەلوجستان لەکەلاتە لەژێر سەرۆکایەتی ئەم هۆزەیە بووە لەتیرەی کامبرانی، ئەم هۆزە سونی مەزهەبن[٢٤٩] .

## هۆزی بەرواری:

هۆزێکی گەورەی کوردن لەدوو بەش پێکهاتوون، بەرواری بالا حەوت هەزار خێزانن، بەرواری ژێری هەزار خێزانن، خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارین[٢٥٠] . هۆزێکی نیشتەجێ بوون واتا (کۆچەر)ی نەبوون، لەڕووی نیشتەجێ بوونەوە دەبن بەدوو بەشەوە .

بەشی یەکەم: (بەرواری بالا)یەو دەکەونە باکوری چەمی گارا لەسنوری پارێزگای دهۆك.

بەشی دووەم: بەرواری ژێری دەکەونە باشوری گارا .

لەگرنگترین گوندەکانی بەرواری بالا وەك (تەروانش، بناڤی، هروو، ئایدە، ئاشووت) هەرچی بەرواری ژێرییە لەگوندەکانی (سوار تووکە، براش، خرابیە، ئیسپێدار)[٢٥١] .

---

[٢٤٧] کەریم زەند :جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٢٠ .

[٢٤٨] عەلی بانەیی: پێوستە کوردستانمان خۆش بووێت، ماڵپەری تەڤگەری ئازادی کۆمەڵگای کوردستان.

[٢٤٩] شێخ محمەدی مەردۆخ : مێژووی کورد و کوردستان ،و زانەر محەمەد ،چ١ ،٢٠٠١ ،ل٨٧–٨٨ .

[٢٥٠] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٢٣٤ .

[٢٥١] **عباس العزاوي: العمادية في مختلف العصور، مطبعة وزارة الثقافة،هةولێر ،١٩٩٨ ،ص٧٢–٧٣.**

## هۆزی شیروانی:

نزیکـەی هـەزار و پێـنج سـەد بنەماڵـەن لـەپارێگای هـەولێر، لـەکۆتایی بـاکوری شـاری ڕەواندز نیشـتـەجێن[٢٥٢] . هـۆزی شـیروانی هـۆزێکی کـۆن و ڕەسـەنی کـوردە و لـەزۆرێك لەسەرچاوە مێژوویەکان دا ناوی هاتووە، هەندێك لەمیژوونووسان ڕەچەڵەکی ئەم هـۆزە دەبەنەوە سەر بنەماڵەی (ساسـانیەکان) و خـودی شـا (ئەنوشـیروان) کـە (٢١) کـەمین پادشـای (ساسـانیەکان) بـووە، ڕەچـەڵەکی (ساسـانیەکان)نیش بـەگوێرەی هەنـدێك سەرچاوە کوردن لەکوردەکانی (بازرەنگی) بوون کە لەڕەگەزی (ئاری) بوون .

محەمەدی کوڕی جەریر تەبرستانی کەمێژوو نووسێکی ناوداری عەرەبـە، دەڵـێ ساسـان موغێکی گەورە بوو لەسەر ئاینی زەردەشتی سەرۆکی ئاگردانی شاری (ئستـەخر) بـوو، لەهۆز و تـیرەی (شـوانکارە)ی کـوردی بـوو. مێـژوونوس (سـعلبی، بـلازەری، حـەمزەی ئەسـفەهانی) هـەروەها (بەلعـەمی) وەزیـری ئـەمیری (سـامانی) وایـان نوسـیووە کـە (ساسان) موغێکی گەورە بوو لەهۆزی شوانکارەی کورد بووە.

ئەم هۆزە گەورەی کورد وەك زۆرێك لەهۆزەکانی تـری کـورد، لەکۆنـەوە تـا سـەردەمی شەڕی عوسمانی و ئێرانی و عوسمـانی و ڕووس تـا جـەنگی یەکـەم و دووەمـی جیهـانی زەرەروو زیانی زۆری بەرکەوتووە و ئەمەش بووەتە هۆی پەرتـەوازی و لێکـدابڕانی ئـەم هۆزەی کورد لەهەموو بەشەکانی کوردستان .

لەناوچـەی قـەفقاس شـوێنێك هەیـە بـەناوی (شـێروان)، ئـەم (شـێروانە) میرنیشـنێکی سەربەخۆ بـوو لـەنێوان ڕۆژهـەڵاتی ڕووبـاری (کـر) لەسـەر ڕۆژئـاوایی دەریـای قـەزوین، (یاقوتی حەمەوی) باسـی ئـەم شـارەی کـردووە ئامـاژەی بـەوەداوە کـە (ئەنوشـیروان) درووسـتی کـردووە، (ئـەبوو ئەسـوار)ی (شـەداد)ی سـێ جـار هێرشـی کردۆتـە سـەر

---

[٢٥٢] شێخ محەمەدی مەردۆخ: مێژووی کورد و کوردستان ،و زانەر محەمەد ،چ١ ،٢٠٠١ ،ل٨٧–٨٨ .

(شێروان)، پاشاکانی (شێروان) بە(شێروان شا) ناویان هاتووە، ئەو ناوچانەی نێوان ڕووباری (کر) تاڕێژکەی ئەم ڕووبارە لەڕووباری (ئاراس) لەسەرەتای سەدەی (١١) ز تا لێوارەکانی دەریای (قەزوین) لەژێر حکومڕانی ئەم هۆزەدا بووە[٢٥٣].هەندێك پێیان وایە هۆزی (حاربوختی) لەگەڵ هۆزی (شێروانیەکان) یەك ڕەچەڵەکیان هەیە .

هاتنی بەشێك لەهۆزی (شێروانی) بۆ (هەولێر) و دەوروبەری بەگوێرەی هەندێك لەقسەی شارەزایان و ڕیشسپیانی هۆزی (شێروانی) بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە لەوانە :

١– پەلامارەکانی (محەمەدی کوڕی مستەفا بەگ) پاشای کۆرەی (ڕەواندز)، لە ساڵانی (١٨٢٣–١٨٢٦) .

٢– بوونی دەسەڵاتی پڕ لەزوڵم و زۆری عوسمانیەکان لەناوچەکەدا، ئەو دەسەڵاتە سەرانەی لەخەڵکی وەردەگرت و بێکاری دەکردن. دەسەڵاتی عوسمانیەکان تەنگی بەزۆرێك لەبنەماڵەکان هەڵچنی، ناچاری دەکردن کۆچ بکەن بۆ ناوچەکانی تر، ئەوانیش ناچار دەبوون کۆچ بکەن بۆ ئەو ناوچانەی دەسەڵاتی عوسمانی تێدا لاوازە .

٣– ململانێی هۆزەکان هۆکارێکی تری کۆچ کردنی شێروانیەکان بوو[٢٥٤] .

ئەولیا چەلەبی زمانی کوردی کردۆتە (١٥) بەش بەم شێوەیە (زازا، لۆلۆ،هەکاری ، عوەنەیکی،مەحموودی ،شیروانی ، جزیرەیی، پسیانی، سەنجاری، ئەردەلانی، سۆرانی،

---

[٢٥٣] تەحسین شێروانی: هۆزی شێروانی لەمێژوودا ،چ١ ، ٢٠١٠ ،ل ٥٠–٦٠ .

[٢٥٤] تەحسین شێروانی: هۆزی شێروانی لەمێژوودا ،س ،پ ،ل ١٠٠ .

خالتی، چکوانی، عمادی ...) لەوانە ئاماژەی بەزاراوەی (شێروانیەکان)ی داوە وەك زاراوەیەکی سەربەخۆ[٢٥٥].

## هۆزی شوان

دەربارەی بنەچەی هۆزی شوان زۆر دیدو بۆچوون خراوەتە ڕوو، عەبدول جەلیل فەیلی دەربارەی بنەچەی شوان دەڵێت: هەندێك مێژوو نووس و هەروەها بەبۆچۆنی ئێمەش هۆزی شوان ڕەنگە بەشیٚ بێت لەهۆزی (شەوهانی) لوڕی هۆزی شوانکارە نیشتەجیٚ لوڕستانە،ئەمانە دەسەلآتدار بوون و میرنیشنیان هەبوو لەلایەن شا ئیسماعیلی سەفەوی کۆتای بەدەسەلآتیان هاتووە، ئێستاش هۆزی شوانی باکوری ڕۆژهەلآتی کەرکوك پاشماوەی ئەوانن، ڕۆژهەلآتناسی ناودار (سپایزەر) لەکتێبی ئەقوام میسۆپۆتامیا دەڵێت هۆزی شوان بەشێکن لەهۆزی گەورەی شکاك، بەلاّم خەسرەو ئەردەلآنی لەکتێبی هۆز و تیرەی کوردا هۆزی شوان لەبنەڕەتدا لەنەوەی گاوانن کە

---

دەوڵەتی ساسانی شا(ئەردەشێری کوڕی بابك کوڕی ساسان) دایمەزراندووە، (ئەردەشێر) بیٚ هێزی دەوڵەتی(پارسەکان) و ئەو سیاسەتە نەرمەی کە لەسەر بنەمایی پێدانی حوکمی فیدراڵی بۆ هەرێمەکان پەیڕەو دەکرا بەهەلزانی و دەسەلآتی خۆیی فراوان کرد و دەستی گرت بەسەرهەرێمی (فارس) ئەمەش بووە هۆی تورە بوونی (ئەردەوانی پێنجەم) و نامەیەك بۆ ئەردەشێر دەنوسێت و تیایدا هاتووە: تۆ سنوری خۆتت بەزاندووە و خۆتت لەبیرکردووە ئەی کورد، کە لەنێو ڕەشماڵ نشینەکانی کوردا گەورە بووی، کیٚ مۆڵەتی پێداوی تاجی شایەتی لەسەر بکەیت و پاشاو خەڵکەی بخەیتە ژێر دەسەلآتی خۆت . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە **(الطبري: تاريخ الامم والشعوب، تحقيق محمد ابو الفضل ابراهيم، ض٤، بيروت ،١٩٦٧،ج٢ ،ص٣٩)** .

[٢٥٥] حەبیبولآی تابانی: هاونەتەوەی قەومی کورد وماد، و/جەلیل گادانی، ٢٠٠٦،ل٢٥٥–٢٦٠ .

کوردی دەوروبەری کەرکوکن، سەرەڕایی ئەم بۆچوونانە یەکێك لەپیاوە ناسراوەکانی شوان (هابیل شەوکەت) دەڵێت: (شوان، بیانی،داودە) یەك بنەماڵە بوون لەئێرانەوە هاتوون، بەشێکی لەخوارووی کەرکوك و بەشێکی تریان لەنزیك پردێ نیشتەجێ بوون، بەشێکی تریان نیشتەجێ نەبوون و بەمەڕ و ماڵاتەوە بۆ باکوری ڕۆژهەلاتی کەرکوك ڕۆیشتوون، نیشتەجێ بووەکان هەمیشە بەکۆچەرەکانیان ووتووە شوانیەکان[٢٥٦].

هۆزێکی نیشتەجێ و دەوڵەمەندن، لەماوەی سالأنی جەنگی یەکەمی جیهانی دا بە هەزار و پێنج سەد خێزان مەنزندەکراون، لەدوای جەنگی یەکەم سەرچاوەی تربە (دوو هەزار) خێزان خەملأندوویەتی، سەرجەمی شوان جوتیار بوون و ئاغایان نەبووە، لەگەڵ هیچ هۆزێکی ناوچەکە دا لەژێر هیچ پەیوەندیەك پاشکۆی کەس نەبوونە، هۆزێکی سەربەخۆن[٢٥٧]. مەیجەرسۆن دەڵێت: ئەم هۆزە نیشتەجێ و دەوڵەمەند بوون، خەڵکی هۆزەکە کشتوکاڵکارێکی چاکن، هۆزەکە بەسیفەتی جەنگاوەریان بەناوبانگن، کە بەرگری لەهەموو هێرشێکی هۆزەکانی دەوروبەری خۆیان کردووەو کردوویەتی، ئێستا دەتوانێ پێنج سەد جەنگاوەر بەتفەنگە مارتینیەکانیانەوە کە لەسلێمانی دروستکراوە بنێرنە گۆڕەپانی شەڕەوە، هەمەوەندی دراوسێی باشوریان چەند ساڵێك دەبێ سەغڵەتیان ناکەن، هەندێك جار پەیوەندیان لەگەڵ هەمەوەندەکان زۆر خراپ دەبێت، کەچی دواتر دەبێتە دۆستایەتیەکی بەرفراوان، شوان کوردێکی پاکی سونین و مەزهەب شافیعین، بەدیالێکتی کرمانجی خواروو قسە دەکەن[٢٥٨]. بەشێوەکی گشتی شوان دووبەشە (شوانی خاسە، شوانی کیشك) ئەم دووبەش لەم تیرانە پێکهاتوون: تیرەی تاژەوەندی لەم بنەماڵانە پێکهاتووە (کوێخا ڕەجەب، حاجی بەیخان، دێی سمایل

---

[٢٥٦] بەهجەت ئەحمەد: لێکۆلینەوەیەکی مێژووی دەربارەی هۆزی شوان ،گۆڤاری زانستەکۆمەلأیەتیەکان ، ٢٠١٦ .

[٢٥٧] خالد مەحمود کریم : س ،پ ،ل١١٥–١١٦ .

[٢٥٨] مەیجەر . بی سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، و/مینە ،٢٠٠٧ ، ل٨٤ .

بەگی، خدرشیرین، قەرەبلاخ،ناروجەی حاجی جەرجیس ،ئەحمەد ڕەجەب یان تایفەی یاخی کەبنەماڵەی کوێخا ڕەجەبن) بەشێوە زاری شوانی کیشك

قسەدەکەن کە لەخانەقین و کرماشانەوە نزیکن دەچنە سەر لوڕ .

تیرەی ڕەشەوەندی: د.ڕەفیق شوانی دەڵێت بەلای منەوە خەڵکی گوندی قولی بەگ لەم تیرەیەن، چونکە زۆر لەیەکتریەوە لەڕووی دەربەڕینی قسەکردن وهەڵسوکەوتیانەوە نزیکن و دراوسێی یەکیشن، ئەمانە هەر بەزاری کیش قسەدەکەن .

تیرەی وڕام: لەم گوندانە نیشتەجێن (مۆرد، تورکە، تەپەکوڕە، تەرەقە، دووشوان، تورکمان باخ، براهیم زاڵە،کارێزەی خاڵخالأن) ئەم گوندانە لەڕووی شێوەزار و هەڵسوکەوتیان لەدووتیرەکەی تر جیاوازترن .

تیرەکانی شوان بەزۆری پێنج پشتی خۆیان دەزانن و کەمیان هەشت پشتی خۆیان دەزانن، سەرۆك هۆزی شوان (عەلی حەسەن) بووە، کەدەکاتە باوکی (کوێخا ڕەجەب) و باپیری (کوێخا ئەحمەد)ی سەرۆك هۆزی ئێستای شوان، ئەم هۆزە ئاغاو بەگ و خاوەن زەویان نیە، لەناوخۆیاندا کوێخایەکیان داناوە پێداویستیەکانیان بۆ جێبەجێ کردوون، ئەم کوێخایەیە تەنها وەك برا گەورەیەکی گوندە ڕاوێژیان پێی کردووە لەهەندێك کاروباری کۆمەڵایەتیدا، لەهەندێك گوندەکانی ناوچەی شوان کۆمەڵێك خەڵکی بەتوانا هەڵکەوتوون توانیانە جێی دەستیان دیار بێت لەبواری ڕامیاری و فەرهەنگی نەتەوەی کوردیدا ئەلقەی خزمایەتی و هۆزەکە یان ناوچەکەیان بڕیووە وەك (زەعیم ئیسماعیل علی، فازڵ محەمەد مەلامستەفای سمایل بەگ) .

پەیوەندی خزمایەتی زۆرێك لەگوندەکانی ناوچەی شوان گۆڕانیان بەسەردا هاتووە، بەهۆی دووری لەیەکتریەوە و ئاگادار نەبوون لەکێشەو گرفتی یەکتری و تێکەڵ بوونیان لەگەڵ خەڵکانی دەرەوەی بازنەی خزمایەتی و ناوچەیی پەیوەندیەکانیان کزتر بووە، جاران لەنێوان پیاوە دەوڵەمەندەکانی شوان پەیوەندی خزمایەتی زۆر پتەو بوو، زۆربەی کاتەکانی خۆیان تەرخان دەکرد و مەولودیان دەکرد خواردنیان پێکەوە دەخواردوو و خواردنیان دەبەخشی، پێشووتر زۆربەی هاوسەرگیریەکانیان ناوخۆیی

بووە، یان لەنزیك ترین دراوسێ ئەوانەی لەڕووی ڕەچەڵەکەوە دەچوونە سەر یەك بنەماڵە. دەربارەی ناوی شوان بۆچوونی جیاواز هەیە :

نوسەری ڕوسی ڤێلجێڤیسکی دەڵێت: لەسەرووتری کەرکوك خێڵکی کوردی لێیە ناوێکی تایبەتی هەیە کەشوانە، واتا شوانی مەڕو و مالآتی ورد، دراوسێی هۆزێکی بچووکی نیشتەجێن بەناوی بزێنی مەبەستی (شێخ بزێنی)یە، ئیدمۆنز دەڵێت: ئەم ناوچەیە لەوەڕگای زۆر باشی هەیە بۆ مەڕ و مالآت، مەیجەرسۆن دەڵێت: شوان خێلێکی بەهێزە بەلأم بێوەیە و خەریکی ئاژەڵدارین هەروەك لەناوەکەیدا هاتووە، جەمالْ بابان ناوچەی شوان دەگەڕێنێتەوە بۆ ناوی هۆزەکە، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی هۆزی شوان دەگەڕێنێتەوە بۆهۆزی شوانکارە کە لەسەدەی پێنجەمی کۆچی خاوەن دەوڵەتێکی بەهێز بوون، لەسەدەی یازدە و دوازدەی زاینی پەرتەوازە بوون، د.ڕەفیق شوانی هەمان بۆچوونی ڕۆژبەیانی هەیە هۆزی شوان دەگەڕێنێتەوە بۆ هۆزی شوانکارە، دەڵێت ووشەکە ڕەنگە لەووشەی (شوهان)ی هۆزی کوردی پشتکۆوە هاتبێت، حەمید ئیزد پەنا دەڵێت لەنێو فەیلیەکانی لوڕی بچووك هۆزی پەڕاگەندەی کوردی دیکە هەیە وەك شوان هتد....، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ناوی شوان وەك ناوچە، لەناوی هۆزی شوانەوە هاتووە[٢٥٩]. بەشێوەیەکی گشتی شوان لەم ناوچانە ژیاون: لەباکورەوە هۆزی شێخ بزێنی، لەباشورەوە ڕووباری خاسەو چەمچەمالْ، بەدیوی ڕۆژهەلأتدا زێی بچوك و تۆخمەداغ، لای ڕۆژئاواوە دیسان هۆزی شێخ بزێنی و بیانی، زۆربەیان لەگوندەکانی سەرگردی گوڕگوڕ لەنزیك کەرکوك نیشتەجێن. لەسەردەمی عوسمانیەکان لە چوارچێوەی ئەو ناحێیەدا بوون کە لەڕووی ئیدارییەوە بەناحێیەی شوان* ناسراوە، لەکۆتاییەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی شوان بەدەست پەشێوی و نەبوونی سەرۆکێکەوە کەبتوانێت یەکیان بخات توشی ناکۆکی و شپرزەیی بوون[٢٦٠] .

---

[٢٥٩] بەهجەت ئەحمەد: لێکۆلینەوەیەکی مێژووی دەربارەی هۆزی شوان ،گۆڤاری زانستە کۆمەلآیەتیەکان ، ٢٠١٦ .

[٢٦٠] مێجەرئی.بی .سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو،س ،پ ،ل ٨٤–٨٥

## هۆزی شێخ بزێنیّ :

مامۆستا سەعد شێخ بزێنی لەکتێبی مێژووی هۆزی شێخ بـزێنی دا دەنوسـیّ: هـۆزی شێخ بزێنی لەهۆزە نیشتەجیّ بووەکانـە لەگونـدی بچـوك بڵاوبووتـەوە لەهـەردوو بـەری زێی بچووك و ناوچەی بەستۆرە، ئەم هۆزە پێش ئەوەی نیشتەجیّ ببن و ببنە هـۆزێکی گەورە ژمارەیان دەگەیشتە چوارهەزار خێزان، زستانان لەگوندەکانی خۆیان نیشـتەجیّ دەبوون و لەبەهاران ئەندامانی ئـەم هـۆزە ڕەشماڵـەکانیان لەدەوروبـەری گونـدەکانیان هەڵدەدا، پاش دروێنەکردن لـەحوزەیران کۆچـی هاوینـەیان دەسـت پێکـرد بـۆ سـنوری قارس لەگەڵ مەڕ و ماڵاتەکانیان، پاشان گەڕاونەتەوە بۆ گوندەکانیان لەمانگی ئەیلول. بەشێك لەم هۆزە لە(کەورگۆسك، گاینج، کەلەك یاسینن) و بەشێکی زۆریان لەکەرکوك و دەوروبـەری و هەنـدێکیان لەکۆیـە و بەشـێکی تریـان لەتـەق تـەق و بەشـێکی تریـان لەچەمچەماڵ نیشتەجێن. بەشێکیشیان لەئێرانن لەنێوان خورم ئاباد و شـیراز و زۆریـان لەئەمرۆدا لەناوچەی(علی ئەلهیە) نیشـتەجێن. بەشـێکی هـۆزی شـێخ بـزێنی لەناوچـەی هایمانا لەپارێزگای ئەنقەرە نیشتەجێن. مارك سایکس دەڵێت: لەجیهت ئەنقەرە تووشی بـەعزیّ کـورد بـووم کـەجل و بـەرگ و قەڵافـەتیان لەبـەعزیّ تـورکی دەوری ئـەرزڕۆم دەچوو، هۆکاری ئەمەم لەو تورکانە پرسی ووتیان ئێمە لەنەتەوەی یەکترین ئەجدادمان لەلایەن سوڵتان سەلیمەوە لێرە ئەرزیان دراوەتیّ.

هـۆزی شـێخ بـزێنی سـەرۆکی بـاڵای نیـە، ئەمـەیش دەگەڕایـەوە بۆدابـەش کردنـی دەسەڵاتی کارگێڕی هۆزەکە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی .

خاوەنی شەرەفنامە باسی هۆزی شێخ بزێنی کردووەو بەهۆزێکی ناوچەی جـەزیرەی هەژمارکردووە و بەدووری نازانێت گەڕابنەوە بۆ ووڵاتیان لەکەرکوك و هەولێر.

لەتەنیشت شاری قارس هەندێك هۆزی کـوردی نیشـتەجێن میلانـی گەورەترینیانـە، جمالەدین، کاش خانی، گەلاڵی(جەلالی)، ئەمەی دواتر خزمایەتیان هەیـە لەگـەڵ هـۆزی گەلاڵی کەنیشتەجیّ باکوری ئێـرانن. هـۆزی شـێخ بـزێنی (٤٥٠) خێزانیـان لەسـەردەمی ڕێکەوتننامەی سایکس بیکۆ لەژمارەیەك گوندن لەئـەرزڕۆم و ناوچـەی تـر نیشـتەجێن .

هـۆزی شـێخ بـزێنی ئێسـتا لـەهۆزە شارسـتانیەکانن، لـەدوو زنجـیرە گونـد نیشـتەجێن لەلێواری زێی بچووك و نزیك لەئەو.

سەبارەت بەناوی شێخ بزێنی هەندێك ڕاوبۆچوون هەیە:

هەندێك دەڵێن ناوچەکانی دەوروبەری ئاغجەلەر عوسمانیەکان پێیان ووتوون بازیان، ئەم ناوچەیە شێخی دینی و پیاوچاك و لەخوا ترسی هـەبووە، خـەڵکی ناوچـەکە پێیـان وتووە (شێخ بازیانی)، دواتر لەسەر زمانی خەڵکەکە بووەتە شێخ بزێنی لەم ناوچـەیەدا هۆزی شێخ بزێنی هەبووە بەئێستایشەوە. یان هەنـدێکی تـر دەڵـێن نـاوی شـێخ بـزێنی لەوەوە هاتووە زۆرێك لەخێزانەکانیان نیشتەجێی بوون لەدەوری زێـی گـەورە و بچـوك، وا باس دەکرێت شێخێك یان پیاوێکی باش لەهۆزی شێخ بزێنی لەدورگەیـەك نیشـتەجێ بووە لەسەر زێ، لەم دوورگەیە ئاوەکە دووکەرت دەبێـت بەلەهجـەی شـێخ بـزێنی پێـی دەڵێن (دووبز)، خەڵکی ناوچەکە هاتووچۆی ئـەم پیـاو شـێخەیان کـردووە لـەنێوخۆیان وتووە شێخ بزێن لەجیاتی شێخ دووبز، دواتر لەنێوخەڵکەکە بووە بەشێخ بزێنی[٢٦١] .

ئیدمۆنس لـەزمانی ئاغاکـانی شـێخ بزەینیـەوە ئـەم چـیرۆکەی دەربـارەی بنجوبنـاوانی هۆزەکەیان گێڕاوەتەوە دەڵێت: هـۆزێکی نیشـتەجێیە و ئەنـدامانی لەکۆمەڵـە گونـدێکی هەردوو لای (زێ)دەژین و ناوچـەکەیان نزیکـەی چـل میـل درێـژە لـەباکوری ڕۆژهـەڵاتی کەرکوك هەڵکەوتووە، ئاغاکانی شێخ بـزەینی دەڵـێن: نـەوەی چـوار بـران بـەناوەکانی: حەسەن ئاغا، مەحمود ئاغا، حاجی حەمزە، مەلا عەباس، شێخ بزێنییەکان دەگێڕنـەوە سـەر بـاوك یـا بـاپیری ئـەم چوارکەسـە شـێخێکی زانـاو خۆپـارێز و خواپەرسـت بـووە، ڕێبەری کۆمەڵە دەروێشێکی زۆری بووە، ڕۆژێکیان بەسواری ئێسـترێ لەگـەڵ یـەکێ لـە نۆکـەرەکانی دا بەدەشـتێك دا ڕابـوردوە کۆمـەڵێ جـەردە ڕێیـان لێگرتـووە، شـێخ بەدارەکەی دەستی بەتوندی لەئێسترەکەی داوە تـاخێرا بکـا، هـەر جـارێ کـە داری لـە ئێســترەکەی داوە، کۆمــەڵی زەردەواڵــە لــەگوێی ولاخەکەیــەوە دەرهــاتوون بــە جەردەکانیەوە داوە، جەردەکان دەشتەکەیان پڕکردووە لەهاوارو ناڵە، نۆکەرەکەی کـە

---

[٢٦١] مامۆستا سەعد فاروق یوسف شێخ بزێنی: هۆزی شێخ بزێنی، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٦ .

ئەوەی دیوە بۆئەوەی شێخ هان بدات و زیاتر لەئێسترەکەی بدا بەفارسی وتویەتی: (شێخ بزن، شێخ بزن) واتە شێخ لێدە شێخ لێدە ئیتر ناوی شێخ بزێنی لەمەوە ناونراوە لەم هۆزە. زۆرێك لەناوچەکانی هۆزی شێخ بزێنی کەوتنە بەرشالاوی بەدناوی ئەنفال (٢٨٥٤) کەس بەرئەو شالاوە دڕندانە کەوتن[٢٦٢] .

تیرەکانی هۆزی شێخ بزێنی:

خۆڵەزەردی: ئەم تیرەیە بەرەبابی ئاغاکان دەگرێتەوە کەلەزۆربەی گوندەکانی شێخ بزێنی نیشتەجێن .

دەربەندی: ئەم تیرەیە زۆر تر لەناحیەی سێگردکان و گوندی ئۆمەرگومبەت نیشتەجێن.

جۆغە ڕەشی: ئەم تیرەیە زیاتر لەگوندەکانی چەمەزەردەڵە، قەرغەتوو، مەلحەوالی، قەرەبەگ و هتد... نیشتەجێن .

لەبەڵگەنامەیەکی فەرمی حوکمەتی بەریتانی دەربارەی هۆزی شێخ بزێنی لەساڵی ١٩١٩ دا نوسراوە: شێخ بزێنی شەش سەد ماڵێکن لەدەوری کەرکوك و خانەقین و لەخوارووی زێی بچووکن، بەشێکیان لەوڵاتی ئەرزڕۆم نیشتەجێن. بەپێی پەیمانی ساڵی ١٦١٢زاینی شارەزوور وەك بەشێك لەخاکی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان مایەوە، لەم سەردەمەدا شاعەباسی سەفەوی (١٥)هەزار لەهۆزە کوردیەکانی باکوری کوردستان وەك حەیدەرانلوو، زەعفەرانلوو، گەلاڵی هتد... گواسترانەوە خۆراسان بۆئەوەی لەپێش سنوری دەوڵەتی سەفەوی ڕێ لەکۆچەرە تورکمانەکان بگرێت بۆئەوەی شۆڕنەبنەوە بۆ ناوخاکی ئێران. عوسمانیەکانیش لەلایەن خۆیانەوە ئالۆگۆڕی جێ نیشنی ئەوهۆزە کوردیانەیان کرد کەسەریان بۆ تورك دانەدەنواند بوو وەك شێخ بزێنیەکانی ناوچەی کەرکوك کەگواستراونەوە بۆخوار ئەنادۆڵ[٢٦٣] .مەیجەر سۆن دەڵێت: هۆزێکی نیشتەجێی کشتوکاڵ و شوانکارەن، وێڕای ئەوەی کە هۆزەکە هیچ کات پەنا بۆ پەلامار

---

[٢٦٢] سیسیل جۆن ئید مۆندس: کورد تورك عەرەب،و حامید گەوهەری، چ٣، ٢٠٠٣ ،ل٦٥–٦٦ نەوشێروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی، س، پ ،ل ٥٠–٥١ .

[٢٦٣] م سەعد فاورووق یوسف شێخ بزێنی: هۆزی شێخ بزێنی، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٦ .

و ڕاو ڕووت نابەن لەدژی تورکەکان، کەچی لەئێستادا ژن و منداڵەکانیان ناردۆتە ناو چیاکان بەرەو باکور–ڕۆژهەڵات، هۆزەکە خزمایەتی زۆریان لەگەڵ هۆزی شوان هەیە، بەگزادەکانیان زۆر بەدەگمەن لەناو خۆیاندا دەبێت بەشەڕیان، لەبنەڕەتدا کرمانجی ناوەڕاستن، هەموویان سونەی شافیعین، بەکرمانجی خواروو قسەدەکەن[٢٦٤] . مارک سایکس دەڵێت: خێڵێکی مەزنن، لەشەڕدا زۆر توندو تیژو یاخین، ئەسپ سواری مەزنیان هەیە، زۆر زیرەکن و چەکی مارتینی هێنری دروست دەکەن، لەزستان دا لەگوند دەژین و لەبەهاردا لەژێر خێمەدا دەژین، دوای وەرزی دروێنە بەمەڕ و ماڵاتەوە دەڕۆن بۆ سنوری ئێران، لەمانگی ئەیلوول یان دواتر دەگەڕێنەوە، مۆدیلی جل وبەرگیان ئێرانیە [٢٦٥]. شێخ بزێنی یەکێکە لەهۆزە ناودارەکانی کورد، لەسەر ڕەگ و ڕەچەڵەکی ئەم هۆزە چەند بۆچونێکی جیاواز هەیە، هەندێك لەسەرچاوە عەرەبیەکان نمونەیان (خلیل ئەلدلیمی) پێی وایە ئاغاکانی شێخ بزێنی دەگەڕێنەوە بۆسەر تیرەی (ئەبولعامر) کە دەگەڕێنەوە سەرعەباسیەکان عەباسی مامی پێغمبەر (د.خ) بەلاّم ئەمە بۆچونێکی لاوازە شێخ بزێنی هۆزێکی ڕەسەنی کوردە بەپێی زۆرێك لەسەرچاوە مێژوویەکان، هەندێك تر پێیان وایە مێژووی ئەم هۆزە دەگەڕێتەوە بۆدوای شەڕی چالدێرانی ساڵی (١٥١٤) زاینی کە لەنێوان عوسمانی و سەفەویەکان ڕوویداوە، لەدەوربەری قەسری شیرین ژیاون لەدەوربەری ساڵەکانی (١٦٠٠) زاینی بەدواوە ئاوارەی ناوچەکانی کوردستانی باشور و باکور و شام دەبن، مەڵبەندی هۆزی شێخ بزێنی لەسەردەمی عوسمانیەکان بەسەر دوو زنجیرە گوندا دابەش بوون بەدووری ٤٠کم لەباکوری ڕۆژهەلاّتی کەرکوك، زۆرێکیشیان دابەش بوونە بەسەر قەزاکانی کۆیە و چەمچەماڵ و ناوەندی کەرکوك. سنوری ئەم هۆزە لەناوچەی ئاڵتون کۆپری تادەگاتە ناحیەی شوان، ناحیەی تەق تەق و تا دەگاتە ناحیەی ئاغجەلەری سەربەقەزای

---

[٢٦٤] مێجەرئی .بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و نەجاتی عەبدوڵلاّ، چ١، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ، ل٧٨ .

[٢٦٥] سایتی خەندان: مارك سایکس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،١٦/٥/٢٠١٦ .

چەمچەماڵ. نەوەکانی جوامێر ئاغـای قەسـرۆك بەسەرچـەند دێیـەك دا دابـەش بوونـە، زۆربـەیان لەناوچـەی تـەق تـەق نیشـتەجێن، ئەوانـەی بەشـی بـاکور مـەحمود ئاغـا و کوڕەکانی حاجی حـەمزە و تۆفیـق ئاغـای قەسـرۆك و نـەوەکانی مـەلا عـەباس نـەوەی براکانی تۆفیق ئاغا و فارس ئاغای سەرچنار دەکەوێتە بەشـی خۆرئـاوای ڕووبـاری زێـی بچوك، یوسف ئاغا کە بەفەقێ وەسو ناسراوە خاوەنی حـەوت گونـد بـووە، لەناوەنـدی شاری هەولێر و دەوربەری و ناوەندی شاری موسـڵ نیشـتەجێن، لەناوچـەی موسـڵ لای دەستەچەپی زێـی گـەورە لـەپێنج گونـد نیشـتەجێن گـەورەترینیان گونـدی کائێنجەیـە دەکەوێتە سەر ڕێگـای موسـڵ و هـەولێر، بەشـێکی تریـان لـەناو پارێزگـای دهـۆك دان، هەندێکی تریان کەوتوونەتە تورکیا لەخۆرهەلاتی (کاستامۆنو) کەنزیکە لەدەریای (قزیل ئیمریق) دەکەوێتـە خـوارووی ڕۆژهـەلاتی شـاری ئەنقـەرە، بەشـێکی تریـان ناوچـەکانی قەزای (ئایمانە) و شارچکەی گۆز گۆز و شارۆچکەی بازارحیسـار و گونـدەکانی، پیـاوی ناوداریـان تێداهەڵکـەوتووە وەك ئولوسـۆی سـەرۆك وەزیرانـی کـۆنی تورکیـا، عـەونی ئاکیول وەزیری پـەروەردەی کـۆنی تورکیـا، بـەدرەدین دلان سـەرۆك شـارەوانی بۆیـەل شەهیری ئەستەمبوڵ، سەلاحەدین دوما ڕۆژنامەنووس، دوریـن تانسوسـەرۆك شـارەوانی کۆنی عەنقەرە. بەشێکیشیان لەناوچەکانی سوریا دان. لەڕۆژگاری عوسمانیـەکان شـێخ بـزێنی لـەنێوان (کۆیسـنجەق، چەمچـەماڵ) و سـەنتەری قـەزای کـەرکوك دابـەش بـوو بوو[٢٦٦].لەسەردەمی دەسەلأتدارییەتی تورکەکاندا (شـێخ بزینیـەکان)ی باشـور دابـەش بوون بەسەر قەزاکانی (کۆیە، چەمچەماڵ، ناوەندی کەرکوك) سەرۆك هـۆزە گرنگـەکانی ئەم هۆزە لەڕۆخی باکور مەحمود ئاغای (سارتك) نـەوەی حـاجی هـەمزە کـە پیـاوێکی هۆشیارو بەئەزمون بوو. لەرۆخی باشور تۆفیق ئاغای (قەسـرۆك) نـەوەی مـەلا عـەباس لەگەڵ برازاکەی بەناوی فارس ئاغای سەرچنار[٢٦٧].

---

[٢٦٦] خالد مەحمود کریم: س ، پ، ل١٥٨ .

[٢٦٧] سیسـیل جـۆن ئیـد مۆنـدس: کـورد تـورك عـەرەب،و حامیـد گەوهـەری، چ٣، ٢٠٠٣ ،ل٦٥-٦٦ .

نەوشێروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی، س، پ ،ل ٥٠-٥١ .



یوسف ئاغا حاجی محمودئاغا – وەهاب مستەفا(وەهاب ئاغا) –جەلیل ئاغا حەسەن ئاغا– ڕەسوڵ ئاغا قادر ئاغا

## هۆزی کەشکی :

میرزا شکرولاّ سنندجی دەڵێت: ئەم هۆزە نزیکەی دووسەد و پەنجا خێزان دەبن، پایز و زستان لەهەندێك ناوچەی گەرمیانی (زەهاو، لوڕستان) هەوار دەخەن و مەڕو ماڵات دەلەوەڕێنن، بەهار و هاوینانیش (فەراجان، ڕەوانسەر، کامیاران) دەبێتە هەوارگەیان و بەمەڕ و ماڵات لەوەڕاندن و کشتوکاڵ ژیان دەبەنە سەر، مەزن و کوێخای ئێستایان بەکردەوە (فەتحولاّ بەگ) لەبەر ئەوەی لەدۆی ئاژەڵ کەشکێکی زۆر دەگرن و لەشوێنی تر دەیفرۆشن بەکەشکی ناسراون(٢٦٨).

---

٢٦٨ میرزا شکراولاّ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەڵان، و ئەنوەر سوڵتانی، چاپخانەی ژین–سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل١٠١ .

## هۆزی گاخۆر :

هۆزێکی نیشتەجێی بوون و بەوە ناسراون کە لەکشتوکاڵ کاریدا کارامەن، بەهەمان شێوە هۆزێکی شوانکارەش بوون، لەڕووی ئاینەوە سونی شافیعن، بەدیالێکتی کرمانجی خواروو قسەدەکەن وابەستەی جەمیل بەگی بابانی بوون، دووسەد ماڵ بوون پێش جەنگی یەکەمی جیهانی چل ئەسپ و دووسەد سوارەیان هەبوو. شوێنی نیشتەجێ بوونیان لەباکور چیمەنی ئیبراهیم سەمین، لەباشورەوە سەید ئالان، لای ڕۆژهەلاتی هۆزی پالانی، لەڕۆژئاوە قەرەتەپەیە(٢٦٩). لەئێستادا هۆزی گاخۆر لەگوندی گاخۆر لەسنوری ناحیەی قەرەتەپە بوونیان هەیە، زۆرێکی تریان لەناحیەی ڕزگاری و قەزای کەلار نیشتەجێن.

## هۆزی هەرکی :

مارك سایکس دەڵێت: هەرکی سێ هەزار خێزانن و خێڵێکی کۆچەری بەناوبانگن و زۆر پەرش و بلاون، هەندێکیان لە (ئەرزڕۆم) و هەندێکی دیکەشیان لە(وان) و نزیك (موسڵ) نیشتەجێن، ژنانی هەرکی زۆر ئازان(٢٧٠). بەشێکی هەرکی بەتایبەتی هەردوو تیرەی (سەیدە، مەندە) لەنێوان گۆمی ئورمێ* و بەرزایی تەرگەوەر و مەرگەوەر و شنۆدان،

٢٦٩ مێجەرئی .بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو ، و نەجاتی عەبدوڵلا ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ ، ل٤٩ .

٢٧٠ سایتی خەندان :مارك سایکس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،٢٠١٦/٥/١٦ .

*ورمێ: لەشارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستانە لەپارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوای ئێران، بەپێی سەرژمێری لەساڵی ٢٠٠٦ پێنج سەدوحەفتاوحەوت هەزار سێ سەد و حەوت کەس بوون، پەنجاو حەوت هەزار و شەش سەد و حەوت خێزان بوون، دانیشوانی ئەم شارەپێکهاتوون لەکورد٤٣٪ و ئازەری ٥٢٪ و کوڕەسوونی ٣٪ و مەسیحی ١.٣٥٪ و جولەکە ٢٤،٠٪ و بەهای ٢٠،٠٪ و ئەهلی حەق ٢٠،٠٪ .

هەندێکیان لەدەشتی هەولێرن، ڕەوەندن بەدوای ئاژەڵ و مەڕداریەوە ئەچنە کێوەکانی سنور، کۆچەری گەرمیان و کوێستان دەکەن، لەتەرگەوەر و مەرگەوەر خێڵی بەگزادە لەپازدە گوند نیشتەجێن، کە دەشتێکی بەپیت و بەرەکەت و بەروبوومدارە بۆ دانەوێڵە و بەخێوکردنی ئاژەڵداری[٢٧١]. باسل نیکیتین لەزمانی یەکێ لەهەرکیەکانەوە ئەم چیرۆکەی دەربارەی بنجوبناوانی هۆزەکەیان گێڕاوەتەوە:

باپیرە گەورەی بنەماڵەی فەرمانڕەوای هەرکی لەکەسێکەوە دەست پێ دەکا بەناوی بابەکر، بابەکر پیاوێکی ئازا بووە لەهیچ نەترساوە، بەتەنها دەرەقەتی بیست کەس هاتووە. دوژمنایەتی هەبووە لەگەڵ میر (زینەدینی) میری شەمزینان، پیاوەکانی میری ڕووت کردۆتەوە، جارێکیان بیست کەس لەپیاوەکانی میر بۆسەیان بۆناوەتەوە بەلآم هەر بیستی کوشتون و ڕوتی کردونەتەوەو چەك کەلوپەلەکانی لەدوو ئێستر بارکردوەو بردویەتی ڕاستەخۆ چوەبۆ خێوەتەکەی میر.

میر نیازی ڕاستەقینەی خۆی دەرنەبڕیوە، بەخێرهاتنی کردووە، وتویەتی پیاوەکانی من لەژن بێ دەسەلآتتر بوون تۆ پیاوێکی هەژارو ئازای ئەمەوێ لەلای من بمێنیتەوە و پیاوێکی وەکوتۆ بیێتە سەرۆکی نۆکەرەکانم. بابەکر بەدڵنیاییەوە ماوەتەوە و نوستوە بەو هیوایەی بۆ ڕۆژی دوایی بچێ خێزانەکەی بهێنێ، شەو لەخەودا داویانە بەسەریاو گرتوویانەو چوارپەلیان بەستۆتەوە .

---

[٢٧١] کەریم زەند :جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٥١-٥٢ .



**چەند پیاوێکی هەرکی پاسەوانی شوێنەوارناسی ئەمریکی (ڕاڵف سویلکی) دەکەن لەنزیك پردی ڕێزان .**

بۆ ڕۆژی دوایی هێناویانە بیکوژن کۆت و بەندیان لیٚ کردۆتـەوە، ئـەویش پـەلاماری خەنجـەری یـەکیٚ لـەپیاوەکانی مـیری دا، مـیر پشـتی بەدارێکـەوە بـووە وابـەهێز خەنجـەرێکی لەسـکی مـیرداوە لەپشـتیەوە دەرچـووە نـوکی خەنجەرەکـە چـەقیوە بەدارێکا، کەڕای کێشاوە تەنها دەسکەکەی بەدەستیەوە هاتووە، دەمی خەنجەرەکـەی لە لەشی میر و دارەکـەدا ماوەتـەوە. چـەکی پـیٚ نـەماوە گـیراوە داوای کـردووە پـێش کوشتنی ڕێگەی بدەن وەسێت بۆ کوڕەکانی بکات ڕێگەیان پێی داوە وتویەتی :

یەکەم: دەمی خەنجەر لەمشتۆکەی مەبەستن ئەگەر تاقی نەکەنەوە .

دووەم: با هەریەکێکتان چوار ژن بهێنی تا وەچەتان زۆربیٚ و تۆڵەم بسێنن .

سێیەم: هـەرگیز گۆیٚ لەقسەشـیرینەکانی بـەگزادەی شـەمزینان و خێزانـی فـەرمانڕەوا مەگرن. بابەکر چوار کوڕی هەبووە: مەندۆ، سەیدۆ، سەرهات، مام شێر، خێزانی هەرکی لەسیٚ برای یەکـەمن، لەمەنـدۆ تـیرەی مەنـدان، لەسـەیدۆ تـیرەی سـەیدان، لەسـەرهات تیرەی سەرهاتی کەوتۆتەوە[٢٧٢] . ئیتر لێرەو هـۆزی گـەورەی هـەرکی پێکهـات. هـەرکی هۆزێکی کۆچەری هەرەگەورە و پەرت و بلاٚون، بەشـی زۆریـان کەوتوونەتـە ناوچـەکانی

---

[٢٧٢] نەوشێروان مستـەفا ئـەمین: بـەدەم ڕێگـاوە گوڵچـنین چـەند بابـەتێکی کۆمەڵناسـی، چ١ ،کتـێبی یەکەم ،بەرگی دووەم ،٢٠١٥ ،ل٥١ .

نزیـك (موسـڵ)، لەناوچـەكانی (ئـەرزەڕووم، وان)یـش بوونیـان هەیـە، لەسـەرەتاكانی سەدەی بیستەم بەسێ هەزار خێزان مەزندە كراون، خـەڵكانێكی جـەنگاوەرن، هەنـدێك لەژنەكانیشیان توانای چەك هەڵگرتنیان هەیە وەك پیاو دەجـەنگن، بەشـێوەكی گشـتی حـەزیان لەكشـتوكاڵ كـردن نـەبووە. لقـەكانی پێـك هـاتوون لـە: (مەنـدان، زیرهـاتی (سەرهاتە)، زەیدا(سیدان)، حاجی).

سنوری جوگرافی هەركی بەم چەشنە بـووە: لـەوەرزی زسـتان لەناوچـەی (دیـرە) بـوون لەڕەوانــدز، لــەهاوینان ناوچــەكانیان بەجێهێشــتووە بــۆ لەوەڕانــدنی مێگەلــەكانیان شوانەكانیان بلاَوەی لێدەكەن و دەچونە هەرێمە فێنكەكانی شەمزینان، ئازەربایجان و ورمێ لەئێران[٢٧٣].

## هۆزی شەرەف بەیانی :

شـەرەف بـەیانی هـۆزێكی كـوردی لوڕیـە، وەك هەنـدێك دەڵـێن لەلوڕسـتانی ئێـران سەریان هەڵداوە، لەبنەچەدا دەگەڕێنـەوە بـۆ مـاڵی مـیرزا ئـەمانولاَ كەیـەكێك بـووە لـە فەرمانڕەواكانی لوڕستان لەسەدەی چـوارەمی كۆچـی كـە هاوكاتـە لەگـەڵ دامەزرانـدی دەوڵەتی بویهی، ئەمانولاَخان خاوەنی شەش كوڕ و كچێك بووە، شەرەف بەیانی دەڵێن لەنەوەی شاخۆشینی كچەزای ئەمانولاَخانە. عەبدولجەلیل فەیلی لـەكتێبی لـوڕ و فـەیلی لــەڕابردوو و ئێســتادا دەڵێــت كۆمــەڵێك هــۆز لەباشــوری كوردســتان نیشــتەجێ بــوون لەبنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆكەڵهوڕ و لەك و لوڕ لەوانـە شـێخ بـزێنی و شـەرەف بـەیانی و دەلۆ[٢٧٤]. شـەرەفبەیانی خێڵێكـی گـەورەی كـوردن، دەربـارەی نـاوی ئـەم هـۆزە دوو بۆچـوون هەیـە بـەم شـێوەیە: یەكـەم دەڵـێن بـاپیرە گـەورەیان كەسـێك بـووە بـەناوی

---

[٢٧٣] خالد مەحمود كریم: س ،پ ،ل١٣٩–١٤٠.

[٢٧٤] ئەندازیار نەبیل محەمەد : هۆزی شەرەفبەیانی ،گۆگڵ .

(شـەریف باینگـانی) هۆزەکـەش بـەناو ئـەوەوە نـاوی دەرکـردووە، پاشـان ناوەکـە کورتکراوەتەوە و بووە بەشەرفبەیانی .

دووەم هەندێك لەخـەڵکی هۆزەکـە پێیـان وایـە، شـەرفبەیانی لەگـەڵ هـۆزی شـەرف بەیانی لەبادینان دەچنەوە سەر یەك ڕەچەڵەك .

شـەرفبەیانی بـۆ مـاوەی پێـنج سـەدەیە لەناوچـەی (کـۆێرەك، هـۆرێن، شـێخان)دا نیشتەجێن، ناوچەکەیان بەگشتی شوێنی نیشتەجێ بوون و ژیاری دێرینـە، شـوێنەواری دێرین لەتەنگی دەربەنگ بێلوولە و دەربەند سەرتەك تا ئێستا بەئاشکرا دیارە .

شەرفبەیانی لەچەند بنەماڵە و بەرەباب پێکدێن بەم ناوانە:

بنەماڵـەی کـوێرەکی– بنەماڵـەی ئـەمیرخانی – بنەماڵـەی عـەزیز بـەگی– بنەماڵـەی گاخۆر–بنەماڵەی نادری .

هەموو بنەماڵەکان ڕیش سپی پیاو ماقوڵی خۆیان هەبووە، لەڕووی خێڵەکیـەوە لەلایـەن بەگەکانیانـەوە سـەرکردایەتی کـراون، ماوەیـەکی زۆر (عوسمـان بـەگی عەبـدولاّ بـەگ) سەرۆك هۆزیان بووە. ئەم هۆزە لەسنوری زێدی خۆیاندا لەناوچەکانی (هۆرێن، شێخان) گەرمیان و کوێستانیان کردووە، بۆ بەسەربردنی وەرزی هاوین و گەڕان بەدوای لەوەڕگە و سەرچاوەی ئاوەدا، ڕوویانکردۆتە هەوارگەکانی (بانی بەمۆ، بانی خشـۆك، کەرگـەمل) لەپێدەشتی هۆرێن و شێخان کشتوکاڵیان کـردووە، لـەهاوینان خۆیـان گەڕاونەتـەوە بـۆ ناوچیاکانی بەمۆ، بەگزادەکانیشیان ڕۆیشتوونەتە باخەکانی (بنگوێز، هێجلە، کانیکەڵ، سیرەکان) لەبناری چیای بەمۆ، شـەرەفبەیانی لەسـنوری باشـوری کوردسـتان لەسـی و یەك گوندیان ئاوەدانکردۆتەو، گوندەکانیان بەپیشەسازییە دەستیەکان و بەرهەمهێنانی کالاّی خۆماڵی بەناوبانگ بوون، زۆریان بـە(جۆلاّیی، هـەلاجی، خومگـەری، ئاسـنگەری، دروسـت کردنـی فـەرش و بـەڕە و مـەوج و جـاجم و بـەرماڵ ...) سـەرقاڵ بـوون . سەرچاوەیی بژێویان (کشتوکاڵ، باخداری، ئاژەڵداری، پەروەردەکردنی هەنگ و بەرهەم هێنانی هەنگوین)ە[٢٧٥] . هۆزەکە بەکرمانجی قسە دەکەن و سونەی شـافیعین، هـۆزێکی

---

[٢٧٥] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٨٧–٨٩ .

بێوەیی و ڕووخۆش و سەر ڕاستن، کەچی لەکاتی پێویست تا دوا ڕادە بەرگری دەکەن، تەمەن درێژی تایبەتمەندی ئەم هۆزەیە[٢٧٦]. لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی ژمارەی خێزانەکانیان بەحەوت سەد خێزان خەملێنراوە، سەرچاوەی دیکەیش لەدوای جەنگ بە هەزار خێزان دایناون. شەرەف بەیانی لەچەند لق پێك هاتووە کە بریتین لە(عەزیزبەگی، ئەمیرخان بەگی) هەرچی لقەکانی دیکەیانە لەبنچینەدا کشتوکاڵ کارن گرنگترینیان (کەورکی، کویرەکی)یە کەبەشی سەرەکی جەنگاوەرەکانیان پێك هێنابوو لە(گێخوار، نادریەکان) کەلەزەهاو دا بوون[٢٧٧]. مەیجەرسۆن دەڵێ: شەرەفبەیانی خێڵێکی بچوکن لەڕۆژهەڵاتی کوردستان لقێکن لەخێڵەکانی جاف بەڵام پەیوەندیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ جاف دا نیە، سەرۆکەکەیان پشتگیری لەحکومڕانی ئێران دەکات، خۆیان دەڵێن نزیکەی سەد و بیست سوارەیان هەیە و لەژێر فەرماندەی عەزیز بەگن، شەرەفبەیانی و باجەلان لەکێشە و ناکۆکیەکی خوێناویدان[٢٧٨].

سنوری جوگرافیان: ئەم هۆزە زۆرتر لەناوچە سنوریەکانی کوردستانی ڕۆهەلات و باشوردا نیشتەجێن، هەندێك گوندیان دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی کوردستانە، لەباشوری کوردستان لەڕووی ڕۆژئاواو باکوورەوە ڕوباری سیروان ودەربەندیخان، بەدیوی باشووردا ئەو سێگۆشەی دەکەوێتە نێوان گردەکانی شەوالدڕە و ئەزگلەیە، لەڕۆژهەلاتەوە دۆڵی پشتەو شاخی بەمۆیە هاوسێی (تاگۆزی و باوەجان)ین، لەسەر شەقامی جەلەولا و سلێمانی نیشتەجێن. ئەم هۆزە ناویان بەچەند شێوە هاتووە لەسەرچاوە ئێرایەکاندا وەك: (شەرەف خاینی، شەرەف باینی، شەرەف بەیانی، شەرەف بادینی) هەندێك لەشەرەف بەیانیەکان پێیان وایە ڕەگەز و باوو باپیرانیان دەگەڕێتەوە سەر پیاوێك بەناوی (ئیبراهیم ئیناخ) و بنەچەیان دەگاتەوە سەر

---

[٢٧٦] مێجەرئی .بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و نەجاتی عەبدوڵلا، چ١، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧،ل٧٨ .

[٢٧٧] خالد مەحمود کریم : س، پ ،ل١٥٢–١٥٣ .

[٢٧٨] مەیجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان، و مینە ،٢٠٠٧ ،ل٧١ – ٨٨ .

(پیرخدری شاهۆ). میرزا جەعفەر خانی موشیر لدەولە دەڵێت: شەمێران لەگەڵ سیروان دا لەڕۆژهەڵاتی شاخی بەمۆدایە، خانەشۆریش لەولاوە هەرهەمووئەوناوچانە لەژێردەستی (عەبدولاّ) بەگی شەرەف بەهادیندایە مەبەستی لە(شەرەف بەیانیە)کان بووە، لە سەردەمی سەرۆکایەتی وەزارەتی ئەمیر کەبیردا کەسەرۆك وەزیرانی (ناسرەدین) شابووە، عەبدولاّ بەگی شەرەف بەیانی نازناوی میری پێنجەمی پێدراوە، دوای مردنی (عەبدولاّبەگ) عەزیزبەگ جێگەی دەگرێتەوە لەدوای ئەویش سلێمان بەگ، بەلاّم (عەلی خان) کوڕی دووەمی عەزیزبەگ پیلانی کوشتنی (سلێمان بەگ) دادەڕێژێت و دەیکوژێت و دوای کوشتنی جێگای دەگرێتەوە. شەڕکەری سوارەی شەرەف بەیانی وەك سنوردار لەخزمەتی دەوڵەتی ئێرانی بوون. هەندێك لەوگوندانەی شەرەف بەیانی تێیدانیشتەجێین وەك: (قەیتول، پشتە، گمە، گڵەچاڵ، باوەیسی، هۆرێن، شێخان، بێلولە، ژاڵەناو، کوێرەك، بانی بی) لەم گوندانە هەندێك هۆزی تریش نیشتەجێین[٢٧٩]. ناوچەکانی نزیك دەربەندیخان تادەگاتە نزیك باوەجانی و تاوگۆزی و لەنێوان چیای شەوالّدڕە و سیروان نیشتەجێن، هەروەها بەشێوەیەکی گشتی لەم شوێنانەش هەیە (سلێمانی، کەرکوك، کەلار، دەربەندیخان)[٢٨٠] . سەرۆك هۆزەکانی شەرف بەیانی :

١- عەبدولاّ بەگی گەورە .

٢- عەزیز بەگی عەبدولاّ بەگی گەورە نازناوی (میر پەنج)ی پێدراوە لەلایەن قاجاریەکانەوە .

٣-وەسمان بەگی عەبدولاّ بەگی بچوك لەساڵی(١٨٩١ تا ١٩٦٨) ژیاوە کەسێکی ناودار بووە .

٤-مەحمود خانی وەسمان بەگ .

---

[٢٧٩] خوسرەو جاف: س، پ، ل ٤٦٤-٤٦٥ .

[٢٨٠] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل٢٧٢-٢٧٣ .





مەحمود خانی وەسمان بەگی شەرەفبەیانی – وەسمان بەگی عەبدولا بەگ - سەرتیب حەمەڕەشید بەگ

## هۆزی نانەکەلی :

**یەکێکن لەهۆزەکانی کورد، ئەم هۆزە لەزنجیرە چیای زاگرۆس و ناوچەکانی بەختیاری و کرماشانەوە دەرکەوتوون، (هێنری فیێڵد) و (ئی.جەی.ئار) لەپەرتووکی هۆزەکانی کورد لەساڵی ١٩١٩زاینی ئامـاژەی بەناوی هـۆزی نانەکەلی کردووە، بەشی زۆریان موسڵمانن و سوونەمەزهەبن، لەئێستادا بەشی زۆری بنەماڵەکانیان لەباشوری کوردستانن لەشاری هەولێر و دەوروبەری بڵاوبوونەتەوە .**

**دەربارەی ناوی هـۆزی نانەکەلی چەند بۆچوونێك هەیە بەم شێوەیە: نانەکەلی بەمانای پیاوی مەند و ئازا دێت، یان هۆزێکە کۆچ بۆچیا ناکەن، زۆریان نانیان کەل کردووە و دابەشیان کردووە .**

**دوای نەمانی دەسەڵاتی زەندیەکان نانەکەلیەکان پەڕاگەندە و لاواز بوون، لە سەردەمی فەتح عەلی شای قاجاری لەساڵانی ١٨٥١زاینی ڕۆڵی سوارچاکی و ئازایەتی**

نانەکەلی دەرکەوتەوە. لەلایەکی ترەوە لەباشوری کوردستان لەمیرنیشنی سۆران ئەم هۆزە ڕۆڵیان هەبووە، مێژوونووسی کورد گیوی موکریانی دەڵێت نانەکەلی بەبنەچە سۆرانن، چونکە میر محەمەدی گەورە کە لەساڵی ١٨٢٦ بووە میری سۆران و جاڕی سەربەخۆی لێدا، سوپایەکی گەورەی لەهۆزەکان درووستکرد، هۆزی نانەکەلیش لەو هێزەدا بەشداربوون. پاش کۆتای میرنیشنەوکە و کوژرانی میرمحەمەد لەساڵی ١٨٣٧ پەرتەوازەبوون، هۆزی نانەکەلی بەرە و ناوچەی دەربەند و زینوێ و ڕایات کۆچیان کرد، لەوێوە بەشێکیان بۆ ئێران و بەشێکی تریان بۆناوچەی هەولێر، ڕانیە، کۆیە، خۆشناوەتی کۆچ دەکەن، بەڵام بەشی زۆریان لەدەشتی هەولێر بەتایبەتی گوندی بنەسلاوەی گەورە گیرساونەتەوە لەساڵی ١٨٤٧زایینی. لێرەش عوسمانیەکان هەر وازی لێ نەهێناون هەردەم چاوی لەپەرتەوازە کردنیان بووە، ئەم گوندەش لەدەستیان دەردەهێنن هەرچەندە بەسەنەد و تاپۆ گوندەکە هی نانەکەلیەکان بووە، لێرەوە قۆناغێکی دی کۆچکردن بەرە و گوندەکانی دەوروبەری هەولێر دەست پێدەکات و هەندێکیان لەسەرەتای ساڵی ١٩٠٠زایینی دەچنە ناو شاری هەولێرەوە. لەگەڵ ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی هاتنی ئینگلیز بۆ عێراق دامەزاندنی دەوڵەتی عێراق لە ساڵی ١٩٢١ دووبارە هەمان سیستەمی چەوساندنەوە بەسەر ئەم هۆزەدا دەکرێت، بەتایبەت کاتێك دەست بەسەر گوندەکاندا دەگیرێت لەلایەن ئاغاکانەوە .

هەر هۆز و عەشیرەتێك گەورە و ڕێبەری خۆی هەیە، براگەورە و سەرۆك هۆز و ڕابەر لەناو هۆزی نانەکەلی مەرج نەبووە پشتاوپشت بگوازرێتەوە، هەر سەردەمێك یەکێك براگەورایەتی هۆزی نانەکەلی کردووە هەندێك لەکەسایەتیە دیارەکانی نانەکەلی وەك :

ئەحمەد سلێمان خدر (ئەحمەد تەیب): پزیشێکی ناسراوی میلی بووە .

کوێخا مەولود تەها سلێمان نانەکەلی: ئەم پیاوە ڕۆڵێکی مەزنی هەبووە لەناو نانەکەلیەکان.

ساڵەح ئەحمەد ڕەسوڵ نانەکەلی: ناسرابوو بەساڵەح سۆفی ئاغا خەمخۆر و ڕاپەڕێنەری کاروباری نانەکەلیەکان بوو .

مەلا ئیسماعیل ساڵەح نانەکەلی: مامۆستایەکی ئاینی لێزان و زیرەك و بەتوانا بووە، لەناو نانەکەلیەکان بەخەمخۆر و جێی پەنا ناسراوە .

عوسمان ئیبراهیم ئەحمەد نانەکەلی: ناسراوبوو بەعوسمان گچکە پیاوێکی ژیر و بەتواناى نانەکەلیەکان بوو .

حاجی حەسەن ساڵەح نانەکەلی: پیاوێکی ڕیشسپی و براگەورەی ناسراوی نانەکەلیەکان بوو .

مام کانەبی حەمەد نانەکەلی: یەکێك بوو لەپیاوە دیار و ناسراوەکانی ئەم هۆزە .

فاروق حەسەن نانەکەلی: فاروق چایەچی پیاوێکی خەباتکار و چاو و نەترس شوڕشگێڕ بووە .

بەپێی دوائاماری هۆزی نانەکەلی زیاتر لەپێنج هەزار خێزان دەخمڵێنرێت لەباشوری کوردستان، چەندین کەسایەتی سیاسی و زانا و ڕۆشنبیر و پیاوی ناودار لەم هۆزە هەڵکەوتووە، یەکێك لەوانە عومەر عوسمان ئیبراهیم نانەکەلی ناسراوە بە زەعیم عەلی، ئێستا براگەورە و خەمخۆری ئەم هۆزە دادەنرێت[٢٨١] .

[٢٨١] ئاری نانەکەلی: چەردەیەك لەمێژووی هۆزی نانەکەلی، گۆگڵ بەشی مێژووی کورد،٢٠١٨/٤/٤ .

## هۆزی دونبۆڵی:

دونبۆڵی هۆزێکی ناسراوی کوردە، پێکهاتن و سەرهەڵدانی ئەم هۆزە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی دیاربەکر، هەرلەوێ قەلایەك بەو ناوە هەبووە، لەسەرەتاوە ئەم هۆزە لەوێ ژیاون، پاشان دنبۆڵیەکان لەناوچەی جەزیرە و ولایەتی بۆتان نیشتەجێ دەبن، لەکۆتای سەدەی شازدە لەسەردەمی شەرەفخان دونبۆڵیەکان بەرەو ڕۆژهەلآت کۆچ دەکەن، تورکمانەکانی قەرەقۆینلوو و ئاق قۆینلوو سودیان لەهێزی سەربازی ئەم هۆزە وەرگرتووە، لەبەرامبەری ئەم خزمەتە سەربازیە ناوچەی سەلماس لەباشوری ڕۆژئاوای شاری خۆی پێدراوە، لەسەردەمی سەفەویەکان شاتەهماسب لەترسی زیاد بوونی دەسەلآتی دونبۆڵیەکان لەکوردستان دەست بەکۆمەڵکوژیی بەربلآوی ئەم هۆزە دەکات، ئەوانەی ڕزگاریان دەبێت بەشێکیان پەنا بۆعوسمانیەکان دەبەن، پاشان بەشێکی دیکەی ڕزگاربووان بەرلێبوردنی شاتەهماسب دەکەوێت، چارەنووسی دونبۆڵیەکان لەسنوری نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی دەکەوێتە دژواریەکی زۆر، بەلآم لەنێوان سالآنی (١٧٤٧ بۆ ١٨٣٨) دەسەلآتێکی نیوە سەربەخۆیان دەبێت، لەنێو ماڵباتی خانەدانانی دونبۆڵی میرانی مەزن و کەسایەتی حکومڕان سەریان هەڵداوە، سەردار و فەرماندەی سەربازی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە، عەبدولڕەزاق بەگی دونبۆڵی مێژوونوس و هەڵبەستوانی کورد نوسەری نزیکەی سی پەرتوکە[٢٨٢] .

دۆنبولی هۆزێکی بەڕەچەڵەك کوردی کرمانجن، دانیشتوانی ناوچەکانی خاناتی خۆی لەپارێزگای ورمێ و خاناتی تەورێز بوون، بەزمانی تورکی ئازەری قسەدەکەن، ئەمانە لەبۆتانەوە هاتوون کەناوچەیەکی کوردیە لەنێوان سێرت و جەزیرە لەباکوری کوردستان، یەکەم باپیریان عیسا بەگ بووە، کەبووبە میری ماکۆ کوڕەزایی شێخ ئەحمەد بەگ بوو کەلەخزمەت تورکمانەکانی ئاق قۆیونلوو بوو، ئەم بنەماڵەیە چەندین پۆستیان لەدەوڵەتی فارس بەدەستەوە بوو، ئەحمەد بەگ کوڕی حەجی بەگ بوو میری

---

[٢٨٢] یەڤگێ ئیلی نیچنا ڤاسیلی یەڤا: هۆزەکانی کورد لەڕوانگەی مێژوو نووسانی کورد، و مەسنور سدقی، ٢٠١٦،ل٤٧-٤٨.

سۆکماناوا و خۆی بوو، لەساڵی ١٥٣٠زاینی بنەماڵەی دۆنبەڵی لەناوچەکەدا توانی میرنیشنێکی نیمچە سەربەخۆ دابمەزرێنن کەهەرێمی چورس و سەڵماسی دەگرتەوە، لەسەردەمی شاعەباسی سەفەوی یەکەم ئەم بنەماڵەیە میرنیشنەکەیان بۆ چوورس و خۆی پەرەپێدا و هەندێکجار بۆ دەسەلاّتی زیاتر شەریان دەکرد، پاش کۆتایی هاتنی دەسەلاّتی سەفەویەکان میرانی دونبەلی لەساڵی ١٧٣٦ەوە بوون بەخانی میراتی خۆی و تەورێز، خێڵی دونبەلی وەك حاکمانی نیمچە سەربەخۆ بۆماوەی نزیکەی پەنجا ساڵ لەنێوان مەرگی نادرشای ئەفشار لەساڵی ١٧٤٧تابە پادشا بوونی ئاغا محەمەد خانی قاجار لەساڵی ١٧٩٦، حکومەتی خاتانی خۆی و تەورێزیان دەکرد. ئەوان هاوپەیمانی سێ خانەدانی (ئەفشار، زەندیەکان، قاجاریەکان) بوون لەولاّتی عەجەم .یەکەم میری هەڵکەوتەو دیاریان لەسەردەمی ئەفشاریەکان نەجەف قولی خان بوو، لەساڵی ١٧٣٤ نەجەف قولی خان وەك سەردەستەی چەکداران چووە خزمەتی نادرشای ئەفشار لەداگیرکردنی هندستان لەگەڵی بوو، نازناوی ئەمیر ئەلئومەرای (میری میرانی) پێ بەخشراو بوو بەمیری خۆی لەساڵی ١٧٤٢ بووبە بەگلەربەگ (حاکمی حاکمان)ی تەورێز، لەساڵی ١٧٤٧ بووبەخانی حاکمی تەورێز لقێکی تری دونبەلیەکان چوونەتە کاشان، ئەندامی بەرچاو و بەناوبانگی ئەوان فەتح عەلی خانی سەبای دونبولّی بوو[٢٨٣] . گەورەترین هۆزی کوردە لەشاری خۆیی* ئەوشارە بەدەستی ئەوان پێکهێنراوە، شەرەف خانی بەدلیسی ئەوا دەنوسێت ئەمیریەحیا یەکێکە لەشێخەکانی هۆزی دۆنبۆڵی نزیکەی هەزار و دووسەد تەکیەو خانەقای لەسوریا و کوردستان و ئازەربایجان هەیە کەزنجیرەی بەکاتشیەی پێکهێناوە، کوردانی دۆنبولّی دابەش بوونە بۆسەر چەند تیرە و تایفەیەك کە بریتین لەمانە (یەحیا کوڕی دونبۆڵی، شەمسکی، عیسابەگلوو، بەگزادە)

[٢٨٣] ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد، ٢٠١٨/٦/٢٠ .

*شاری سەڵماس: یەکێکە لەشارەکانی ڕۆژهەلاّتی کوردستان لەپارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا، بەپێی سەرژمێری ساڵی ٢٠٠٦ ژمارەی دانیشتوانی سەد و هەشتا هەزار وحەوت سەد و هەشت کەس بووە .

ئـەبا حەنیفیـە لـەکتێبی ئەنسـادو لئـەکراد نوسـیوویەتی سـەرۆکی تایفـەی عیسـابەگی دۆمبۆڵی ناوی ئەمیر عیسا بووە، یەکێك بووە لەکاربەدەسـتی حکومـەتی عەباسـیەکان، یەکـەمین حکومـەتی دۆنبـوڵی لەشـاری خـۆی لەسـەر دەسـتی سـەلمان خـانی ئۆباشـی کەیەکێك بووە لەبەهێزترین کوردانی دۆنبوڵی ئەم حکومەتە بۆماوەی بیسـت و دووسـاڵ بەردەوام بووە، ساڵی ١٢١٤ کۆچی بەهێرشـی قاجاریـەکان بۆسـەر ئـەم هـۆزە دەسـتی پێکـرد، پـاش کوشـتارێکی زۆر حکومـەتی دۆنبـوڵی لەناوچـوو، پـێش هێرشـی قاجـار شـەهبازخانی دۆنبـولی و مورتـەزا قولیخـانی دۆنبـولی لەشـاری خـۆی دەسـەلآتیان بەدەستەوە بوو، لەناو ئەو میرانەدا کەحکومـەتی خـۆی یـان بەدەسـتەوە بـووە، نـاوی ئەحمـەد خـان دونبـوڵی وەك ئەسـتێرەك دەدرەوشـێتەوە، ئەحمـەد خـانی دۆنبـوڵی سەرەڕای لێهاتووی و ژیری و بوێری، هـەموو هـەوڵی خـۆی بۆئاوەدانکردنـەوەی شـاری خۆی تەرخانکردبوو، وەك فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر لەناو خەڵکیدا ناسـرا بـوو، سـاڵی ١٢٠٠ کۆچی بەپیلانی ئاغا محەمـەد خـانی قاجـار بەدەسـتی برازاکـەی کـوژرا، کـەدوای ئەوەی تەنها پێـنج سـاڵ لەحکومـدا بـوو تـوانی حکومـەتی سـەربەخۆ پێکبهێنێـت دراو لێبدات، لەناو شاری خۆی دەیان شوێنەواری کوردی سەردەمی دونبوڵی هەیە[٢٨٤].

---

[٢٨٤] ماڵپەڕی ویکپیدیای فارسی، هۆزی دۆنبوڵی .

## هۆزی گەورك :

یەکێکە لەهۆزە گەورەکانی کوردستان، گەورك سێ هەزار خێزان دەبن، لەنێوانی مەهاباد و سەقز و سەردەشت و بانەدان، کەوتنەتە ڕۆژهەلاتی هۆزی مەنگوڕ[(٢٨٥)] . گەورك هۆزێکی کوردی پارێزگای ئازەربایجانی ڕوژئاوایە، بەشی هەرزۆری دانیشتوانی ئەم هۆزە لەشارەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان نیشتەجێن، ئەو ناوچەیە ئەم هۆزەی تێدا نیشتەجێیە بەناوچەی گەورك یان گەورایەتی ناسراوە، بەتایبەت لەم شارانە(ورمێ، سەلماس، سەردەشت، سەقز، مەهاباد، بۆکان، میراوە*، ڕەبەت) بلاوبوونەتەوە لەزیاتر لەدوو سەد گوند لەناوچانە نیشتەجێن، لەباکور و باشوری کوردستانیش بلاوبوونەتەوە، لەناوچەی خۆشناوەتی هەولێریش مالی گەورك دەبینرێن، هەروەها لەسوەیل لەسلێمانی، لەباکوری کوردستان لەپارێزگای وان و قەزای باشکالا و گۆڕپینار، بەلام زۆرتر گەورك لەمەلبەندی موکریان لەنێوان سەردەشت، مەهاباد، سەقز، بۆکان هەتا ورمێ، بلاوبوونەتەوە، بنەڕەتی ئەم هۆزە بۆشاری بەدلیس لەباکوری کوردستان دەگەڕێتەوە، بەهۆی بلاوبوونەوەی هۆزی گەورك بەسەر سێ بەشی کوردستان تائێستا نەیان توانیووە لەنێوخۆیاندا یەککگرتووبن و لەڕوداو گۆڕنکاریە سیاسیەکان دا ڕۆلێکی بەرچاو بگێڕن[(٢٨٦)] . هۆزی گەورەك خۆیان بەنەوەی عوسمان ئاغا و خزر ئاغا دەزانن، گەورەك لەناوچەی مەهاباد لەپێنج بەرەباب پێکهاتوون وەك (عەزیزی، حەسەنی، موحەمەدی، ئیبراهیمی، قادری) سەرۆکایەتی هۆز هەمووکات بەدەست بنەمالەی عەزیزی بووە، لەجەنگی یەکەمی جیهانی بایز ئاغای عەزیزی سەرۆك هۆز بووە، پاش

---

[٢٨٥] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٦١ .

*شاری خۆی یەکێکە لەشارەکانی پارێزگای ئازەربایجانی ڕۆژئاوا(ئورمیە)، کەوتۆتە باکوری کوردستانی ئێرانەوە، ئەم شارە دەکەوێتە سنوری نێوان کوردستانی ئێران و کوردستانی تورکیا .

[٢٨٦]سەعید مامەندی: هۆزی گەورك، مالپەری ویکیپیدیا، ئینسایکلۆپیدیای ئازاد، ٢٠١٨/٦/٥ .ئاژانسی کوردپیدیا: موحسین ڕەشیدی گەورك، باسێك لەسەرناسینی عەشیرەتی گەورك، موکریان سەردەشت، ٢٠١٣ .

*میراوە یەکێکە شارە بچوکەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان، لەباشوری گۆلی ورمێ هەلکەوتووە .

کۆچی دوای براکەی ئەحمەد ئاغا هاتۆتە شوێنی. لەناوچەی دێهستان و میرەدێ لەسەقز کە بەدۆڵی میرەدێ ناسراوە، بەرەبابی جەوانمەردی هەیە بەرپرسیارێتی ئەو بنەماڵەیە لەجەنگی یەکەمی جیهانی لەئەستۆی عەلی ئاغای جەوانمەردی بووە(287).



خدر ئاغای گەورك(ڕەبەت)–سەرۆك هۆزی گەورك



قادر ئاغا سەرۆك هۆزی گەورك–لەگەڵ حەسەن ئاغای برای و حەسەن ئاغای ئامۆزای



حاجی کەریم ئاغای جەهانگی شاری ڕەبەت–گوندی مەکلاوی

## هۆزی زێباری:

مارك سایکس دەڵێ: زێباری هەزار خێزانن، ناوچەکەیان نزیکەی سی گوند لەخۆ دەگرێت، زێباریەکان جوتیار و وەستا و ڕەزەوانی باشن و لەگەڵ بێگانەدا زۆر بەخشندەن(288). لەدێرینترین هۆزەکانی بادینانە، شەرەفخانی بەدلیسی لەکۆتاییەکانی سەدەی شانزەهەمدا وەك دووەم گەورە هۆزی بادینان ئاماژەی بۆکردووە، ناویشیانی بردۆتەوە سەر ڕووباری (زێ) کە خەڵکەکە لەکەنارەکانیدا نیشتەجێی بوونە. پ. لێرخ

---

287 کوردستان پۆست: هۆزی گەورك، ٢٠١٤/١/١٤.

288 سایتی خەندان :مارك سایکس چۆن باسی کوردەکان دەکات ،٢٠١٦/٥/١٦ .

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم وەك گەورەترین هۆزی ناوچەکە لەڕووی ژمارەوە ئاماژەی بۆکردوون، بەڵام (مارك سایکس) لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەهەزار ماڵ مەزندەی کردوون دەڵێت هۆزەکە نیشتەجێ بوون و سی گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە و کەوتوونەتە نێوان ئاکرێ و زێی گەورە .

زێبارییەکان لەیەکەمین عەشیرەتەکانن کە هاوکاری میرەکانی بادینانیان کردووە، بۆ گەیشتن بەحکومڕانی لەئامێدی و دەوروبەری، تائەوڕادەیەیی لەبەڵگەنامەکانی ئەم بنەماڵەیە بە(وەزیرەکانی زێبار) نێوبراون. ئۆستن هینری لایارد دەڵێ: لەناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ناوچەکانی نێوان ئاکرێ تا سنوری ڕۆژهەلاَتی کوردستان چەندین هۆزی کوردی تێدا بووە، هەر هۆزێك سەرۆکی خۆی هەبووە، بەڵام دەست ڕۆیشتوویان هۆزی (زێباری) بووە، لەمیانەی ئەوانەوە باجیان داوەتە عوسمانیەکان لەموسڵ .

لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، لەنێو زێبارییەکان دا سێ بنەماڵەی دەست ڕۆیشتوو هەبوون ئەوانیش: بنەماڵەکانی (موستەفا ئاغا، نیعمەت ئاغا، مەسیح ئاغا) بەڵام دوای ناکۆکیەکی درێژ بەرچاو لەگەڵ (بارزانیەکان)، ساڵی (١٩٠٦) بەرە و (نەهلە)ی نزیك ئاکرێ پاشەکشێ دەکەن[٢٨٩]. لەدەوروبەری هەکاری ژمارەیەك لە ئەندامانی هۆزی زێباری نیشتەجێن، لەسەر مەزهەبی سونی شافیعین[٢٩٠].

---

٢٨٩ خالد مەحمود کریم : س، پ ، ل١٣٤-١٣٦ .

٢٩٠ مەیجەرسۆن ، سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ ، ل٨٤

## هۆزی مزوری* :

هۆزێکی نیشتەجێ بوون، لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەهەزار و دووسەد خێزان خەملێنراون، شەرەف خانی بەدلیسی لەکۆتایەکانی سەدەی شانزەهەمدا وەك گرنگترین هۆزەکانی ئامێدی ناوی بردوون. ناوی هـۆزی مـزوری هـاوڕێ بـە(زێبار) لەسـەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەم لە(١٧٠٦) لـە بەڵگەنامـەکانی عوسمانیـدا هـاتووە، هـۆزێکی بـەهێز بوون و لەناکۆکی و کێشە نێوخۆییەکانی میرانـی بادینـان دا ڕۆڵـی بەرچـاویان گێـڕاوە، سەرۆکی مزوری لەکۆڕ و کۆبوونـەوەکانی مـیری بادینانـدا پـێش سـەرۆك هۆزەکـانی تـر کەوتووەو نزیك بەمیر دانیشتوون .

هۆزی مزوری دوو بەشن: مزوری ژێـری لەڕۆژهـەلاتی دهـۆك نیشـتەجێن، مـزوری ژووری کەوتوونەتە باکوری ناوچەی بـارزان، لقـەکانی بـریتین لـە (ئەلگوشـی، خازیـا، بـەنانی، شەمکان، شەرەفان، مانا)[٢٩١] .

## هۆزی خەیلانی :

یەکێکە لـەهۆزە بـەناوبانگ و ناسـراوەکانی کـورد لەباشـوری کوردسـتان، هـەروەها بەشێك لـەم هـۆزە لەباشـوری عێـراق و شـاری دیالـە و بەغـداد نیشـتەجێن، ئـەم هـۆزە بەشێکی زۆری کوچەری بوون  و بەشـەکەی تریشـی نیشـتەجێی شارۆچـکەی ڕەوانـدز، دەشتی هەریر، هـەولێر، دەڤـەری سـیدەکان لەگونـدەکانی (کبـۆر، ئـازەران، قاسـیمە، سەرکەند، قەراتە سور، شێراوە، ڕەزگە، گراو، ناویان، سـێوەکە، زێبـارۆك، کونـە قـیر، خەتیبیان، هیسکۆك،دۆنگزاوە، قەراتەجن، بابەجیجك، چارووك) نیشتەجێ بوون، زیـاتر

---

*محەمـەد ئـەمین زەگـی بـەگ دەڵـێ: هـۆزی مـزوری لەبنەچـەدا (مەیسـورین) کـە لـەڕۆژگاری پاشـا سەنحاریبی ئاشوریدا لەناوچەیە ژیاون مەبەست (ئامێدی) .

[٢٩١] خالد مەحمود کریم: س ،پ ،ل١٣٩–١٤٠.

لەسی وحەوت گوند خەیلانی تیادا نیشتەجێن لەدەشتی هەولێر جگە لەوانەی ناویان هاتووە، بەلأم گوندەکان ئەوانەی کەزۆرینەن ئەوانەن کەئاماژەمان پێی دا. ئەم هۆزە لەدێر زەمانەوە گەرمیان و کوێستانیان کردووە، بە بەخێوکردنی مەڕ و مالأت و مەبەست و ئامانجی تر چوونەتە سنورەکانی ئێران، عێراق لەهاوینیش گەڕاونەتەوە دەشتی هەریر و نزیکی زێی بادینان و شار و هەولێر، لەزستانیش گەڕاونەتەوە بۆ دەشتی هەریر، زێی بادینان، دەشتی هەولێر. هەوارەکانی هۆزی خێلانی زۆرن وەك (سولْتان، قەمتەرەی مامك ئاغا، سپی رێز، تازەجار، کانی چاوڕەش، تارەجار، مۆرەکور، سوارخەیلانی، دۆرەومەیدان، مێرگا سەید تەها، گرەزەرد، هەوارەشینکە).

هۆزی خەیلانی لەچەند تیرە و بەرەبابێك پێکهاتووە، بەهۆی زۆربوون و بلأو بوونەوەیان بۆ شوێنەکانی تر لەوانیشەوە چەندین تیرە و بەرەبابی تر دروست بوون بەتێپەڕ بوونی کات، زۆرینەیان ئامۆزا و کەسوکاری یەکن و دەگەنەوە یەك پشت، زۆرێکیان دەچنەوە سەر (مام سۆفی) نەوەکەی کە (مام سۆفی) بچوك بەجۆرێك ناسراون پێیان دەڵێن (شێخ زادە) .

هۆزی خەیلانی لەچەند تیرە و بەرەبابێك پێکهاتووە وەك: شێخ زادە، ئەفەندیەکان، حەنەدۆری، باباجیسکی، شەمساغەیی، ...) .

لەناو ئەم هۆزەدا کەسایەتی گرنگ و کاریگەر دەرکەوتووە لەهەموو بوارەکاندا، زۆرێك لەمەلابەناوبانگەکانی کوردستان لەڕەواندز خوێندویانە (مەدرەسەکە) وەك زانکۆیەك بووە بەسەر پەرشتی (حاجی مەلا عومەر ئەفەند)ی خەیلانی کە زاوای مەلای خەتێ بووە، ئەم مەدرەسەیە زیاتر لەدووسەدە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە. ڕۆڵ و پێگەی ئەم هۆزە لەشۆڕشەکانی کورد کاریگەرە لەمیرنیشینی سۆران (عەلی ئەفەندی)خەیلانی پلەی کارگێڕی بەرزی هەبووە، چەندین سەرۆك هۆز و ئەندامی ئەم هۆزە شەهید بوونە بەئێستایشەوە بەدانانە براوی لەپێناو مافەڕەواکانی کوردستان خەبات دەکەن، هەر لەکۆنەوە دوو سەرۆك هۆزی ناودار شەهید بوونە لەشۆڕشەکانی کورد وەك :

١– عەزیز محمود ئاغای خەیلانی دەکاتە باوکی میرکە ئاغا خـەیلانی نـەوەی حـاجی شێخە، بەرامبەر دوژمنانی کورد و کوردستان وەستابوو لەگـەڵ پۆلێـك لـەخزمانی، لەجەنگی یەکەمی جیهانی بەفڕۆکەی ئینگلیز شەهید کرا .

٢– کەریم خـان ئاغـا کـە دەکاتـە بـاوکی فـەرحان ئاغـا لەنـەوە و تـیرەی مـەلا عـەلی خەیلانی، لەشۆڕشی سمکۆی شکاك بەشداربووە لەڕۆژهەلاتی کوردستان، لە شاری شنۆ بریندار بوو لەڕووبەڕووبوونەوەی دووژمنان، کەهاتۆتەوە شەهید بووە .

هـەروەها لەشۆڕشـە یـەك لـەدوای یەکـەکانی کـوردا ڕۆڵـی کاریگـەر و بەرچـاویان هـەبووە، لەشۆڕشـی ئـەیلول دا لەسـاڵی (١٩٦٢) لـەبناری چـیای سـەفین پۆلێـك پێشمەرگەی هۆزی خەیلانی شەهید بوون، لەناودارترینیان شـەهید (عـەزیز میرکـە ئاغـا خـەیلانی، ڕەشـید بـەگ) و (سـوبگ بـەگ خـەیلانی) کەدەکاتـە ئـامۆزای کەسایەتی دیار و پێشمەرگەی دێرین (عەزیز ڕەحمان خەیلانی، حاجی میرۆ سەیدا خەیلانی) کەدوو کوڕ و هەندێك خزمـی نزیکـی شـەهید بوونـە. وەزۆرێـك لـەتیرە و بنەماڵەکانی خەیلانی خەباتی بەردەوامیان هەبووە بـەجۆرێك چـەندین بنەماڵـەیان بەژن و منداڵیانەوە دوورخرانەتەوە و بێسەر و شوێنکراون بۆ باشوری عێراق .

لەناو هـۆزی خـەیلانی چـەند بنەماڵـە و کەسـی ناسـراو بێسـەر و شـوێنکراون وەك کەسـایەتی ناسـراو (مـەعین ئاغـا خـەیلانی) بـەجۆرێك بنەماڵـە و کەسـەنزیکەکانی لەلایەن حکومەتی بەعس فاشی بێسەر و شوێنکران.

لەکۆنەوە تیرەکانی هۆزی خەیلانی گەرمیان و کوێستانیان کردووە، لەهەوارەکانی تایبەت بەخۆیان لەکوردسـتان، لەگـەڵ ئـەوەی خـەریکی چـاندن و کـار و پیشـە و بەخێوکردنی مەڕ و ماڵات بوونـە . لـەڕووی خوێنـەواری و سیاسـی و ڕۆشـنبیری دا کەسانی زۆریان تێدا هەڵکەوتووە کەهەڵگری بڕوانامەی جۆراو جۆر بـووە، لـەڕووی ئاینی و زانستی و سەربازی و سیاسیەوە، لەناو هۆزی خەیلانی زۆرینـەی کەسـانی خاوەن بڕوانامەکان لەنەوەی (حاجی مەلا عومەرئەفەندی) خەیلانیە لەشارۆچکەی ڕەواندز و هەولێر دانیشـتوون ناسـراون بەئەفەندیـەکان لـەناو خـەڵکی کورسـتان و

عێراق. بنەماڵەی ئەفەندیەکانی ڕەواندز هەردەم پێشەنگ بوونە و چەندین دکتۆر، بەڕێوەبەری جۆراوجۆر و، حاکم، ئەندازیار، ژمارەیەکی زۆر مامۆستایان هەبووە لەکوردستان و عێراق خزمەتیان کردووە، هەرلەکۆنەوە کەسانی خوێندەواری بەناوبانگیان تێدا هەڵکەوتووە، تەنانەت لەناو ئافرەتەکانیاندا، ناسراوترین مامۆستا و کۆنترین مامۆستایان (جودت ئەفەندی خەیلانی) بووە، هەروەها پرۆفیسۆر دکتۆر ئەسعەد خەیلانی کوڕی مەلا سەعید ئەفەندیە کەقازی بووە لەتیرەی مارە مەلا ئەفەندی ڕەواندز بووە لەنەوەی حاجی مەلا عومەر ئەفەندیە لەولاتی ئەمەریکا بڕوانامەی بەرزی بەدەستهێناوە دووبڕوانامەی ماستەرلەئامار لەزانکۆی سانت لویس، بڕوانامەی ماستەر لەزانست لەواشنتۆن، لەکۆتای شەستەکان بڕوانامەی دکتۆرای لەزانستی کۆمپیوتەر بەدەستهێناوە، لەساڵی ١٩٧٢بووە بەپرۆفیووسەر لەزانکۆی ئیستەرن مەشیگان، تاکە کەس بووە ئەوکات کەسەرۆکەکانی ئەمریکای دیووە، بەسەرۆك دامەزرێنەری گونگرەی نەتەوەی کورد Knc لەساڵی ١٩٨٨، لەولاتی ئەمەریکا باسی خراپەی ڕەوشی نەتەوەی کورد و کێشەی کوردی کوردستانی گەورەیان کردووە. بەگشتی خەیلانی موسڵمانن و لەسەر مەزهەبی سونەن[٢٩٢] .

---

[٢٩٢] دکتۆر بۆتان جودت ئەفەندی خەیلانی: زانکۆی سەلاحەدین، ئەم بابەتە لەلایەن د.بۆتان وەرگیراوە و پێداچوونەوەی بۆکراوە (مێژوو نوسی هۆزی خەیلانی و دروستکەری پەیجی عەشیرەتی خەیلانی ٢٠١٨/١٢/٤.

## هۆزی سورچی :

هۆزی سورچـی یەکێکـە هـۆزە کوردیـەکانی باشـوری کوردسـتان، بەیـەکێك لـەهۆزە گەورەکان دادەنرێت، لەبەر هەڵکەوتـەی شـوێنی جوگرافیـای کـە دابـەش بـووە بەسـەر ناوچەی (سۆران، بادینان) و زۆر لەناوچـەکانی باشـوری کوردسـتان، لەبەشـی ناوچـەی سۆران لەدەشتی هەریر لە (٥٥) گوند نیشتەجێن، بەشی بادینـان لەناوچـەی ئـاکرێ لـە نزیکەی (٨٠) گوند نیشتەجێن، سەرپەرشتیارو پیاوی ماقوڵی هۆزی سورچی لەناوچەی سـۆران (حوسـەین ئاغـا)ی سورچـیە، لەناوچـەی بادینـان سەرپەرشـتیار و سـەرۆکیان بنەماڵەی (ئەحمەد گەویلانی)ە کە لەگوندی گەویلانی سورچی کە سەربە قەزای ئاکرێیە نیشتەجێن[٢٩٣]. مێژووی سەرهەڵدانی ئەم هۆزە دەگەڕێتەوە بۆشاری (ئورفە) لەباکوری کوردستان، جگە لەوناوچانە ئاماژەمان پێی دا سورچـی لـەزۆر شـوێنی دیکـەش بونیـان هەیە وەك شارێك لەئێران بەناوی ماندواوە، لەوولاتی سرِبیا سوورچی هەیە، لەئیسرائیل یـازدە گونـدی سورچـی هەیـە هـەموویان موسـڵمانن، سورچـیەکان کـەلتوری تایبـەت بەخۆیان هەیە، هەڵکەوتەی شوێنی جوگرافیـای هـۆزی سورچـی لـەڕووی ئـاو و هـەواوە جیـاوازە، بـەروبوومی وەك (برنجـی کـوردی، هـەنجیر، کاڵەك،هـەنار، قۆخ،قەیسـی ،شووتی) بەرهەم دەهێنن، سورچـیەکان لەسـەر تەریقـەتی نەقشـبەندی مەولاناخالیـدی نەقشبەندین. ناوی هۆزی سورچی وەك هەندێك دەڵێن لە(سوارچـی)ەوە هـاتووە مانـای سوارچـاك دەگەیـەنێ، هەنـدێکی دیکـە دەڵـێن لـە (سـورچ)ەوە هـاتووە کەناوچـەیەکە لەباکوری کوردستان، لەم هۆزە چەندین زانـا و پیـاوی گـەورە هەڵکـەوتوون[٢٩٤].بـەپێی خەملاندنی مارك سایکس سورچی پێکهاتوو بوون لە سێ هەزار خێـزان، نزیکـەی هـەزار خێزانیـان تـەواو کۆچـەری بـوون، لەسـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەهـەم لقێکیـان بـەناوی (باومر) لەناوچەی ڕەواندزەوە گواستیانەوە بۆ ناوچەی (کلاز) نزیك مەرگەوەڕ و شنۆ .

---

[٢٩٣] تۆڕی کۆمەلأیەتی فەیس بووك: ٢٠١٤/٦/٢٧ عەشرەتی سورچی .

[٢٩٤] سەریاس ئەحمەد: کوردپیدیا، چەند زانیاریەك لەسەر عەشیرەتی سورچی، پێداچوونەوەی هاوڕێ باخەوان .

لقەکانی بریتین لە: (یوسف کاسکی، حەریر، کلو، مامە سام، بن، مالە باس، مام سال، کروو، پیربال یان پیریار، مام گرد) .

سنوری جوگرافیان بەم شێوەیە بووە :

لەهەردوو کەناری ڕووباری زێی گەورە دەژیان، ئەو بەشەی سورچی کە کەوتۆتە کەناری چەپی ڕووبارەکە، لەزەوی و زارەکانی بەستورەوە تا کانی وەتمان شۆڕ بووەتەوە، دەشتی (هەریر)یش بە زۆری سورچی تیادا نیشتەجێیە، هەروەها تەپۆڵکەکانی دەوروبەری (باباچیچك) تا شاخی قەندیل نزیك زێی بچوك، سەرباری ئەو شوێنانە هەندێ بنەماڵەی سورچی بەشێوەی پەرش و بڵاو کەوتوونەتە ڕووی چەپی زێ و شێروانە، هەندێك گوندیشیان لە شاخی بەرۆژی هەیە[٢٩٥] .

## هۆزی مەنتك :

هۆزێکی کوردن زیاتر لە (١٥٠) ساڵ لەمەوپێش لەناوچەی (شنۆ)وە هاتوون، لە دەشتی هەولێر و ناوچەی چیای دیدەوان یان دیدەبان نیشتەجێ بوون لە (٢٢) گوند گرنگەکەیان گوندی (دوو شیوان، بەلەبان، کانی بزرە، لورکە، ئاخورە، بەردبڕ) ژمارەیان زیاتر هەزار و پێنج سەد خێزانن، پێنج بەرەبابن (سەفیان، ئاری، بەگزادە، نەپیلە، ملیوری) ئەم هۆزە بەئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریکن، پێشووتر زۆربەی گوندەکانیان لەترسی ڕژێمی بەعس چۆڵکردوو ڕوویان کردە شاری هەولێر لەگەڕەکی مەنتکاوە لەڕێی کەرکوك نیشتەجێ بوون[٢٩٦] .

---

[٢٩٥] خالد مەحمود کریم: س ، پ ،ل١٤٠-١٤١ .

[٢٩٦] کەریم زەند :جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٢٣٨ .

## هۆزی کۆچەری :

هۆزێکی کوردن نزیکەی دەهەزار خێزانن، لەناوچەکانی سیواس و زازا نیشتەجێن، دەستەیەکیان لەئەرزەنجانن لەوپەڕی باکوری کوردستان، لەچوار تیرە پێکهاتوون وەك ئینولەڕ، بارلولەڕ، سارولەڕ، گارولەڕ[٢٩٧] .

## هۆزی دۆم :

دۆم هۆزێکی کوردی ڕەسەنن، دۆمەکان لەبنیادنانی شاری سلێمانی بوونیان هەبووە، بەشدار بوون لەگەڵ دارەشمانیەکان دژی سوپای ڕووسی، دۆم هاوشێوەی هەورامیەکان دەست ڕەنگین بوون، بابانیەکان ڕێزی ئەم هۆزەیان گرتووە، ئەم هۆزە لەگەڵ هەورامیەکانی سنە ژن و ژنخوازی زۆر لەنێوانیاندا بووە، دۆمەکانی سلێمانی کلاشیان چنیووە و هێلەکیان درووستکردووە و عەرەبانەی تریشقە کە پێکهاتوو بوو لەدوو تایە ئەوان درووستیان کردووە، هەروەها مەشکە و زۆرێکی تر لەپێداویستی خەڵکی ئەو سەردەمە .

دۆمەکان بەگشتی خەڵکێکی دیندار و ئازا و چاونەترس بوون، زۆربەیان سۆفی بوون و دەنگیان خۆش بووە و دەفیان دروستکردووە ژەندویانە، لەبۆنە ئاینیەکاندا هەمیشە ووجودیان هەبووە، لەناو شاری سلێمانی ئەم هۆزە یەکێك بوون لەپێکهاتەکانی .دۆمەکان لەماوەی جەنگی یەکەمی جیهانی لەکاتی نەهامەتی سەفەربەلەك (گرانی گەورە) خزمەتێکی باشیانکرد، لەڕاپەڕینی بەردەرکی سەراو و خۆپیشاندانی ساڵانی پەنجاکان دا چالاکی زۆریان هەبووە، یەکێك لەکوڕە ئازاکانی ئەم هۆزە بەناوی

---

[٢٩٧] محەمەد مەردۆخی: مێژووی کورد و کوردستان، س ، پ ، ل١١٢ .

عوسمـانی حـاجی عومـەر کەناسـرابوو بە(عوسـە دۆم) دای لەحەسـەن سـاقی تورکمـان کەمیری ئەو سەردەمە وەك قۆمیسەر لەسـلێمانی دایاننـابوو، لەگـەڵ جولەکەکانـدا دژی خەڵکی سلێمانی بوون لە کاتی خۆپیشاندانەکاندا .

هەندێك لەدۆمەکان گەرمیان و کوێستانیان کـردووە، لەئێسـتادا دۆمـەکان لەناوچـەکانی سەیدسـادق و خـودی شـاری سەیدسـادق بوونیـان هەیـە، لەناوشـاری سـلێمانی لەگەڕەکەکانی جولەکان و سەرکارێز و دەستاڕەکە نیشتەجێن، خەڵکی دیندار و خاوەن زانستیان زۆرە لەناو ڕابـوونی ئیسـلامیدا، هـەروەها بازرگـان و مامۆسـتا و خوێنـدکاری زانکۆ و پێشمەرگە و فەرمانبەر لەهەموو توێژەکان بوونیان هەیە .

هەندێك پێیان وایە دۆمەکان قەرەچن، لەڕاستیدا ئەمە چەواشـەکاری ڕژێمـەکانی عێـراق بوو، هەندێك لەڕۆشنبیرە عەلمانیەکان ئەیانخەنـەوە سـەر هـۆزی کـاولی لـەنزیك شـاری بەغداد گوایە لەوانن!، ئەمەش هیچ بنەمایەکی نیە، هەرچەندە ئەم هۆزە بەناوی کاولی ئێسـتا بوونیـان نـەماوە لـەدوای ڕووخـانی ڕژێمـی بـەعس لەسـاڵی ٢٠٠٣ شـارەکەیان و مەنزڵگاکەیان تێکـدرا لەلایـەن سـوپای مەهـدی بـەبیانووی ئـەوەی بەدڕەوشـتن هـەموو کۆچیان کرد بۆ دەرەوەی وڵات[٢٩٨] . هۆی ناونانی هۆزی دۆم ڕوون نیـە، مـیرزا شـکروڵا سـنندجی لـەنێوان سـاڵانی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵـێ: نزیکـی دوو سـەد خێـزان دەبـن و بەمەزندە(پێنج سەد) کەسێك دەگرێتـەوە، ئـیش و کاریـان تـەنها (کـڵاش) کـردن بـوو، بەشێکیان دانیشتووی شاری (سنە)ن و لەوێ ماڵیان هەیە، بەشێکی دیکـەیان زسـتانان لەگوندەکان دەمێننەوە و بەهار و هاوین و بەگوێرەی کات دەگەڕێن و باجی دیوەخان و بژیووی خۆیان هەر لەو پیشەی کڵاش کردنە پێـك دێـنن، لەناویانـدا تـا ئێسـتا کەسـانی ناسراو هەڵنە کەووتووە[٢٩٩] .

---

[٢٩٨] ماکوان کەریم : تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك ،٢٠١٥ .

[٢٩٩] میرزا شکروڵا سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئـەردەڵان ، و ئـەنوەر سـوڵتانی ، چاپخانەی ژین–سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،٨٥.

## هۆزی نەدری :

هۆزی نەدری یەکێکە لەکۆنترین تیرەکانی کورد، لەو هۆزانەیە کەلەدێر زەمانەوە نیشتەجێی ڕۆژئاوای ئێرانن، مێژوونوسی ئێرانی د. مەسعود کەیهان لەبارەیانەوە دەڵێت: لەسەد و پەنجا خێزان پێکهاتوون و لەناوچەکانی مێرگەسار، ئاب دەلال، جوانڕۆ، ماهی دەشت نیشتەجێ بوون، هەوارگەی هاوینەیان ناوچەکانی گمشتر، پیرۆزە، نهرئابی، گراب، دەوڵەت ئاباد، ڕوانسەر، قەڵای جوانڕۆ، تورەکبان، کەلی بیاشوش، کانی گوڵە. ئینسکلۆپیدیای ئیسلام پێش (٩١٦) باسی کردوون، لەئێستادا ئەم تیرەیە بەتێکەڵاو و تواوەی ناو هۆزی جاف دەژمێردرێن.

هەوارگەی زستانەیان: پشتیلکە، بەمۆ، لەناوچەی کامێرانەوە تا چروسانە، زویە، قەڵای داراخان، باری ئابوریان باشە، لەئێستادا لەسەدا ٢٠٪ دانیشتوانی قەڵای جوانڕۆ لەم هۆزەن، ژمارەیان زیاترە لەهەزار خێزان، هەندێك دەڵێن نەدریەکان پاشماوەی تیرەی نایرین ناویان بۆ نەدری گۆڕاوە، سەرۆکیان مەلا عەبدولمەجید موەحید نەدریە، لەکەسایەتیە دیارەکانی خەلیفە حوسێن بانچیا، مەلا ئەحمەد نمایندە[٣٠٠] .

---

*دۆم بە(کلاّشکەر) دەگوترێ لەسنە، ئێستا گەڕەکێك بەناوی گەڕەکی دۆمەکان هەیە، کە هەموو کلاّشکەر بوون (مچەی سەرمەس) لەدێڕە شعرێکدا دەڵێ: لەناو دۆمەکان دۆمی کزم ڕۆ لەجووتێ کلاّش چوار لنگ دزم ڕۆ .

[٣٠٠] ماڵپەری مێژووی کورد: تیرەکانی عەشیرەتی جاف، ٢٠١٨/٧/٨ .

## هۆزی حەسەنلو :

یەکێکە لەگەورەترین هۆزەکانی کوردستانی باکور، بەخۆیان دەڵێن (کرمانجی) و بە سەخترین دەنگی زمان دەدوێن، هەموویان موسڵمانن و لەسەر مەزهەبی سونەن، ئەمانە لەگەڵ (حەیدەرانلو، سپیکانلو، خۆراسانلو، جبرانلو، ئادەمانلو، زیلانلو) خێڵە سەرەکیەکانی بەشی باکوری ڕەگەزی کوردەکان پێکدەهێنن، کە بەئاشکرا لەگەڵ کوردەکانی باشوردا، حاڵەتەکانی هاوشێوەیی و جیاوازی لەسیما و ڕوخساری نمونەیەی هەر هەموویان دا دیارە. سوڵتان عەبدولحەمید چەند تیپێکی سوارەی حەمیدیەی لەم هۆزە پێکهێنا، بەهێرش و تالآنی بەرفراوان بەناو بانگن، سوارەکانیان هێرشیان دەکردە سەر گوندەکانی ناو خاکی ئێران .

سپیکانلو کە لقێکە لەحەسەنانلو بەدەوری بایەزیدا درێژدەبێتەوە بۆ ڕۆژهەلاّتی کوردستان، ئەم خێڵە سێ تیپی هێزی حەمیدیەی پێکهێنابوو .

خۆراسانلو ئەمانە خێڵێکی بچوك بوو لقێکە لەحەسەنانلوو، ناوەکەیان لەبنەڕەتەوە لە ناوی شوێنەکەیانەوە هاتووە، ئەم خێلە لەناوچەی ئێراندان، بەفرمانێك لەخاکی ڕوسیا گواسترانەوە، وەك باسکراوە لەهێزی ڕووس هەڵهاتون .

حەیدەرانلو یەکێك بوو لەبەهێزترین خێلەکانی حەسەنانلو لەسنوری ئازەربایجانن، بنکەکەیان لەخاکی تورکیا بوو (باش قەلاّ) لەناوچەی تورکیان پەناگەی سەرۆکی ناوخۆی حەیدەرانلو بوو، خێڵەکە بەپەلاماردەر و هێرشکردن ناسراوە، چەند تیپێکی لەسوارەی حەمیدیە پێکهێنا. ئەم هۆزانە هەموویان لە بنەڕەتدا بەشێك بوون لەهۆزی گەورەو ناسراوی کورد گەلاڵ (جەلالی)[٣٠١] .

---

[٣٠١] مەیجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ ،ل ٨٠–٨١ .

## یەکێتی هۆزەکانی بلّباس :

بلّباس لەبنەڕەتدا کۆنفیدراسیۆنێکی هۆزەکیە، وەك لەوەی هۆزێکی دیاریکراوبێت، لەکاتی شەڕو تەنگانەدا پشتی یەك دەگرن، بلّباس لەگەلّ هـۆزی ئـاکۆ پێشـتر سـەر بـە ویلایەتی شارەزوو بوون[٣٠٢]. لەبەلگەنامەیەکدا هاتووە هەردوو هۆزی ناوبراو باجیان بـە دەولّـەت نـەداوە، والـی شـارەزووریش بـۆ وەرگـرتنی باجەکـە، دەسـتەیەك سـەربازی ئینشکاری ناردۆتە سەریان، ئەمان کەژمارەیان هەشت سـەد سـوار بوونـە، بەشـێوەیەك هاتونەتە دەست لێیان سەربازەکانیان تووشی شۆك کردووەوە لەئاکامدا نائومێدانە بـێ وەرگرتنی باجەکە گەڕاونەتەوە[٣٠٣]. بلّباس ئێلێکی دەولّەمەند بوون، خـاوەنی ئـاژەلّ و گا ڕان و ڕەوەی زۆر گەورە بوون، هەروەها خاکێکی بـەپیتی فراوانیـان لەبەردەسـت دا بوو، کاربەدەستانی (عەجـەم) چـاوی تـەماحیان بـڕی بـووە سـامان و دارییـان، ئـەیان ویست بەزەوت کردن و تالاّنی مالّ و دارایی ئەوان خۆیان دەولّەمەند بکـەن، مەزنـەکانی (بلّباس)یش ئەیان ویست کەم ترین باج و سـەرانە پێشـکەش بکـەن، هـەر ئەمـەش بـوو بەهۆی ململانێ و تێکهەلّچوونی خوێناوی لەنێوان (ئەفشار)ی عەجەم و بلّباس. لـەدوای پەیماننامەی ئاشتی زەهاو لەنێوان (سەفەوی، عوسمانی) عەجەم توانی شـان و شـکۆی هۆزەکانی(موکریان) کەهاوسـنوری (عوسمـانی) بـوون بشـکێنێ و نـەهێلّی جـارێکی تـر ڕاست ببنەوە، بەلاّم هۆزی(بلّباس) تـوانی لـەلای خـواروی ناوچـە عەجـەم نیشـینەکانی مەلّبەندی (ورمێ) گەشە بکات وبەهێز بێت .

هۆزی بلّباس لەو سەردەمەدا پێکهات بوو لەیەکگرتنی چوار هۆزی سـەرەکی: (مـەنگوڕ، مامەش، پیران، بالّەك) هۆزەکانی ئەم ئێلّە ڕەوەندی تەواو نەبوون، ئەگەر چی هاوینـان بۆ لەوەڕاندی ئاژەلّ ئەچوونە چیای(قەندیل)، بەلاّم بنەیان لەبناری (قەندیل، دەشتی ، لاجان، موکریان، سـلدوز) بـوو (کشـتوکالّ)یان تێـدا ئـەکرد، مەزنایـەتی ئێلـی (بلّبـاس) لەدەست ئاغاکانی (مەنگوڕ)دا بوو، تا(باپیر ئاغا) و هەزار کەس لەپیاوە هەلّبژاردەکانی

---

[٣٠٢] خالد مەحمود کریم: س ، پ ، ل١٢٤.

[٣٠٣] عیماد عبدالسلام رؤوف: دراسات و ثائقیة في تاریخ الکرد الحدیث وحضارتهم ،ص٢٤٠ .

ئێلەکەی لەمیواندارییەکدا لە(مەراغە) کوژران لەساڵی(١١٩٨)کۆچی[٣٠٤]. پێدەچێ بڵباس لەڕۆژگاری سولتان سولەیمانی قانوونی دا لەساڵانی (١٥٢٠–١٥٦٦) نائارامی لە ناوچەکانیان دا ڕوویدابێت و بەناچاری دابێتیانە پاڵ وڵاتی ئێران[٣٠٥].

لەئاکامی شەڕو هێرشە نابەرامبەرو بەردەوامەکانی بنەماڵە فەرمانڕەوا یەك لەدوای یەکەکانی (سەفەوی، ئەفشاری، قاجاری کەهەندێك جار بۆ پەلامارەکانیان لەگەڵ عوسمانی ڕێکدەکەوتن، دەرئەنجام زۆرێك لەلقەکانی ناچارکراون کۆچ و ڕەو بکەن بۆ ناوچەکانی(کوردستانی ڕۆژهەڵات، هەولێر، شارەزور، پشتدەر، بیتوێن هتر ...)[٣٠٦].

لقەکانی ئەم کۆنفیدراسیۆنە بریتین لە: کابیز: کەبنەماڵەی حوکمڕان بوون لەدووسەد کەس پێکهاتووبوون. (مەنگوڕ، مامەش، پیران، ڕەمك، سن) ئەمانە پێکەوە هۆزەکە پێکدێنن، سەرۆکی هۆزەکان بەمەزن ناسراوە[٣٠٧]. کۆمەڵی بڵباسەکان بریتین لەپێنج عەشیرەتی (مەنگوڕ، مامەش، پیران، سین، ڕەمەك). مەنگوڕ: لەنێوانی بەرزایی خورئاواو باشوری مەهابادن تا ناوچەی سەردەشت ،خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بوون، بەشێکیشیان لەڕانیە نیشتەجێن[٣٠٨].

سنوری جوگرافیای لقەکانی بڵباس بەم شێوەیە بووە :

---

[٣٠٤] نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردو عەجەم ، چ٣ ، سلێمانی ، ٢٠٠٧ ،ل٣٩ –٤٠ .

[٣٠٥] عباس العزاوی: عشائر العراق الكردیه ، ص٦١ .

[٣٠٦] خالد مەحمود کریم: س ، پ ، ل١٢٩.

[٣٠٧] خالد مەحمود کریم : س ، پ ، ل١٢٤.

[٣٠٨] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٦٠ .

## مەنگوڕ :

مـەنگوڕ یەکێکـە لـەهۆزە کوردیـەکانی ناوچـەی موکریـان کەلـەنێوان سەردەشـت، پیرانشار، میراوە، ڕەبەت، مەهاباد لەڕۆژهەلاّتی کوردستان، لەقەلاّدزێ و حاجی ئاوا لـە باشـوری کوردسـتان نیشـتەجێن. ئەوناوچـانەی مـەنگوڕەکان تێـدا نیشـتەجێن بـە مەنگوڕایەتی* ناو دەبرێ، جیـا لەشـارەکانی پیرانشـار و مـەهاباد زۆربـەی مـەنگوڕەکان لەدوو ناوچەی مەنگوڕی ڕۆژئـاواو مـەنگوڕی ڕۆژهـەلاّت نیشـتەجێن، ناوچـەی مـەنگوڕی ڕۆژهەلاّت سەربە قەزای پیرانشارە، ناوچەی مەنگوڕی ڕۆژئاوا سـەربەقەزای مـەهابادە . ئەم هـۆزە لەشـەش تـیرە پێکهـاتووە وەك: مـروەت، ئامـان، زێـن، شـەم، زێـرن، خـدر زۆرینـەیان تـیرەی مەروەتـە کـە لەمـەهاباد نیشـتەجێن(٣٠٩) . مـەنگوڕە چیانیشـینەکان یەکێکن لەهۆزە گرنگەکانی ئێران کە لەبەشی باکوری ڕۆژهەلاّتی ناوچـەی سـەر سـنوور لەهەردوو لای (لاوێن) دەژین، لاوێن ناوی بەشی سـەرووی زێ یـە بـەلای ئێراندایـە. دوو گروپـی مـەنگوڕی دەشـت نشـین لـەعێراق دەژیـن (مـەنگوڕی زودی) لـە(٢٦) گونـدی ڕوژئاوای ڕوباری (ژاراوە) نیشتەجێن و بەشێکی کـەمیان بـەناوی (مـەنگوڕە ڕووتـە) لـە چـوار گونـد لـەڕۆخی ڕۆژهـەلاّتی زارکـی ژارەوەن، دەشـت نیشـینەکان لەلایـەن ئـەو بنەمالاّنەوە سەرۆکایەتی دەکران کە لەگوندەکانی نێوان چیاکان دان و سەرۆکی گشـتی ئەم هۆزە هەموو سالّێ بە پێی دابو شـوێن یـەکێك لەئەنـدامانی ئـەو بنەمالّـە سـەرەکیە چیانیشـینانە دەکاتــە ســەرۆکی مــەنگوڕە دەشــت نشـینەکان(٣١٠) . شـوێنی ژیـانی ڕاستەوخۆی مەنگوڕ لەناوچەی باشوری ساوجیلاّخی موکری لای موکریانەوە دەست پێ دەکات هەتا زنجیرە شاخەکانی وەزنێ کەبەدرێژای مەودای سـالّ بـە بـەفر داپۆشـراوە، لای ڕۆژئاوای لەگەلّ مامەش هاوسنورن، مەنگوڕەکان بەزمانی کوردی بـەزارەی مـوکری موکری قسەدەکەن(٣١١) . سەرۆکی پێنج لەتیرەکان ئافرەت بوون، تائێستا ژن لەناو ئـەم

---

٣٠٩ هۆزی مەنگوڕ، لەویکپدیای فارسیەوە وەرگیراە .

٣١٠ کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٦٠ .

٣١١ سایتی وشە: عەشیرەتی کوردی مەنگوڕ، ٢٠١٣/٣/١٦ .

هۆزە پێگەیەکی گەورەی هەیە، لەناو هۆزی مەنگوڕدا دیاردەی کوشتن لەسەر ناموس و بەزۆر بەشودان و ژن بەژن زۆر بەدەگمەنی ڕویداوە، بەهۆی ئەوەی ژن لەپەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا دەوریان هەبووە. لەسەر هاوسەرگیری لەناو هۆزی مەنگوڕدا دوای ڕەزامەندی کوڕ و کچ، لەدەستی دایکدایە، هەردوو دایکی کوڕ و کچەکە بەیەکەوە بڕیار لەسەر چۆنێتی هاوسەر گیری و بڕی مارەیی دەدەن لەڕێوڕەسمی خۆزبێنی دا ئەو بڕیارانە لەلایەن باوکی هەردوو لاوە ڕادەگەیەنرێت کەپێشتر بڕیاری لەسەر دراوە و پەسەند کراوە، ڕەنگە هەندێك جار دایکی کوڕ یان کچ ڕازی نەبن بەهاوسەرگیری، بەڵام زۆر بەدەگمەن بڕیاری شوکردن بەسەر کچ دا سەپاوە(٣١٢). دەرویش پاشا* دەڵێت: مەنگوڕ هۆزێکی کۆچەری بوون، لەناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم دوو بەش بوون (کادەروێشی، زودی)، تێکڕا ژمارەیان بەهەزار و دووسەد ماڵ مەزندە کردووە(٣١٣). سەرچاوەی تر لەهەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بە پێنج هەزار ماڵ خەملاندوونی، هەرچی (مارك سایکس)ە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم بە دوو هەزار ماڵ دایناون(٣١٤). ئەم هۆزە زیرەکترین و جێ بایەخترین هۆزەکانی کوردستانی (ئێران، عوسمانی) بوون، لەڕۆژئاواوە لەگەڵ (مامەش) هاوسنورن، کە ئەو ناوچەیە ناوچەیەکی سنوری نێوان (عوسمانی، ئێرانی)بووە(٣١٥). بارەگای حکومڕانی مەنگوڕەکان کە ئاغاوەتەکانیانی تێدایە لەبەرەی مێرگان (ترکەش)ە کە کەوتۆتە نێوان لاجان و

---

٣١٢ هیدایەت جان: سایتی وشە، مەنگوڕ هۆزێکی ژنسالار لەکوردستان دا، ٢٠١٦/١٢/٦ .

*دەرویش باشا: سەرۆکی کۆمسیۆنی عوسمانی بوو بۆ دیاری کردنی سنوری عوسمانی– ئێرانی، لە ماوەی ساڵەکانی (١٨٤٨–١٨٥٢) هەموو ناوچە سنوریەکان گەراوە، زانیاری وردی لەبارەی عەشیرەت و سەرۆك عەشیرەتە کوردیەکان و ناوچە جێناکۆکەکانی نێوان هەردوو دەوڵەت کۆکردۆتەوە، لەڕاپۆرتێکدا بۆ دەسەلاَتدارانی عوسمانی بەرزکردۆتەوە .

٣١٣ **درويش باشا : تقرير درويش باشا لتحديد الحودود الائيرانية– العثمانية سنة ١٨٥٣، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٣ ، ص ٣٦ .**

٣١٤ خالد مەحمود کريم: س ،پ ،ل١٢٤.

٣١٥ خالد مەحمود کريم: هـ ،س ، پ ، ل١٢٤.

سەردەشت، ناودارترین سەرۆکیان (هـەمزەئاغا)بووە، کەیـەکێك بـووە لەسـەرکردەکانی شۆڕشی ساڵی (١٨٨٠)، بەسەرکردایەتی شێخ عوبەیدوڵای نەهری[٣١٦]. ژیانی هـەرتاکێك لەمەنگوڕەکان ئاوێتەی ئەسپ سواری و تفەنگ و تیرهاوێژی بـوو، لەتەمـەنی دەسـاڵیدا خۆیان لەزینی ئەسپەکە دەبەستنەوە، لەکاتی غارغارێن و هەڵبـەز و دابـەز دا ئەسـپەکە ئەوەندە ماندوو دەکـەن لـەحاڵێك دا خـۆی ڕادەوەسـتێ، ئـیتر ترسـی سـوارکاری گـەنج وردە وردە لەناو دەچێت، هێزی خۆی بەسەر ئەسپەکەدا دەسـەپێنێت، لـەکاتی شـەڕدا هەر هۆزێك لـەژێر ئـاڵای خۆیـدا چـووە بـۆ شـەڕ، زۆرتـر تفـەنگی دەسـتیان مـاوەزەری ئەڵمانی و دەمانچە و خەنجەر بوو، چەند ڕیـز فیشـەکیان لـەخۆیان دەبەسـت، هەنـدێك جار ژنانی مەنگوڕ بەشداری شەڕیان کردووە، ئەو ژنانە لەچاو ژنانی تردا هەندێك ئـازاتر بوون، هەندێك جـار شـەڕ لـەنێوان دوو هـۆز ڕویـدەدا شـەڕی دەسـتەو یەخـەی سـەرۆك هۆزەکانی لێدەکەوتەوە وەك لەنێوان دووسەرۆك هۆزی مـەنگوڕ و مامـەش هـەردووکیان ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە و یەکتریان کوشت بێ ئەوەی شەڕەکە یەکلای بێتەوە .

لەبواری ئاینی دا مەنگوڕەکان موسڵمانن و لەسەر مەزهەبی سونەن، باوەڕێکی زۆریان بـەقورئان هەیـە و داب نـەریتی خۆیانیـان پاراسـتووە، بۆچارەسـەرکردنی گیروگـرفتی کۆمەڵایەتی پابەندی یاسای ئیسلام و شەریعەتن، مەنگوڕەکان هەرچەند کۆچبەر بـوون و بەڵام لەزانست و زانیاری ئاینی دانەبڕاون لەناو مزگەوتەکاندا وەك وانە دەگوترایەوە .

لەسەردەمی بایز ئاغا مەنگوڕەکان بەکۆچەری ژیانیان بەسەربردووە بەدوای لەوەڕدا دەگـەڕان بـۆ ئاژەڵـەکانیان گـەرمیان و کوێسـتانیان کـردووە، لـەکاتی شـەڕی نێـوان عوسمـانی و ئێرانـی بـایز ئاغـا لایـەنگیری عوسمانیـەکان بـوو، عوسمانیـەکان نازنـاوی پاشـایان پێـی داوە[٣١٧]. ڕەنگـە هۆکـاری نـاودەرکردنی هەنـدێك لـەتیرەکانی مـەنگوڕ بەناوی ئافرەتەوە بگەڕێتـەوە بۆئـەوهۆکارەی کەهەنـدێك لەسـەرانی مـەنگوڕ لەمەراغـە دوچاری کوشت و لەناوبردن بوونەوە، لەساڵی ١١٩٧کۆچی باپیر ئاغا و سەرانی مەنگوڕ

---

[٣١٦] ڤلادیمێر مینورسکی: بنچینەکانی کوردو چەند وتارێکی کوردناسی ، س ، پ ،ل٩٤ .

[٣١٧] هیدایەت جان: سایتی وشە: عەشیرەتی کوردی مەنگوڕ، ٢٠١٣/٣/١٦ .

و پیاوە جەربەزەکانیان بەناوی دەعوەتەوە بانگ کران بۆ شاری مەراغە، بۆ میوانداری دابەشیان کردوون بەسەرماڵەکاندا، لەکاتی شەودا مەنگوڕەکانی دەکەونە بەرهێرشی خاوەن ماڵەکان سەرۆك هۆز و چەند کەسێك لەهاوڕێ کانیان کە زۆری پیاوەکانیان بەتایبەتی گەورەی بەرەباب و تیرەکانیان کوژراون، چەند کەسێکیش دەربازیان بوو ئەو ڕووداوە تاڵەیان بەهۆزی مەنگوڕ گەیاند، مەنگوڕەکان ئەوکات لەبارودۆخێکدا نەبوون تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، هەمزە ئاغا کوڕی باپیر ئاغا تەنها کەسێك بوو بتوانی ئەو تۆڵەبکاتەوە. دوای کوژرانی زۆرێك لەسەرانی هۆزی مەنگوڕ ژنەکانیان بەڕێوەبردنی کاروباری بەرەباب و تیرەکەیان و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان گرتە ئەستۆ، بەم بۆنەیەوە پیاوانی تازەپێگەشتووی مەنگوڕ کەسەر لەنوێ خێزانیان پێکهێناوە و بەرەباب و تیرەکانیان دروست کردۆتەوە، بەناوی دایکیانەوە ناسراون*.[318] لەساڵی ١٨٨٠ هەمزە ئاغای کوڕی باپیر ئاغای مەنگوڕ لەگەڵ شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ عوبەیدولڵای نەهری بەشداری شەڕێك دەبن لەدژی دەسەڵاتی قاجاریەکان لەئێران، مەنگوڕەکان بێ بەزەیانە ناوچەی ئازەربایجان دەخەنە ژێر دەسەڵاتیان خۆیان لەکوشتن و تاڵانکردن خۆیان نابوێرن، لەماوەیەکی کورتدا شاری میانداو و بناو دەخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، ئەوناوچانە دەکەونە بەر ڕقێکی کۆن و بێڕەحمانە، ناسرەدین شای قاجار لەزووترین کاتدا هەتا ئەو جێگایەی بۆی کرا هێزی بۆ بەرنگار بوونەوەی کوردەکان ڕەوانە کرد، بەڵام بەوشێوەیە کێشەکان چارەسەر نەدەبوون کوردەکان لە داواکاری خۆیان پاشگەز نەدەبوونەوە، هەمزە ئاغا لەحاڵێدا نەیتوانی بەئامانج بگات بەرەو چیاکان پاشەکشەی کرد، دوای ساڵێك ئەمیر نیزام گەرووسی کە لەڕابردوودا

---

[318] نەوشیروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی، س،پ،ل٥٣–٥٤.

* لەکوردەواری دا شتێکی ئاسایی بووە پیاوێ کەمردبێ یا کوژرابێ، لەوکاتەدا منداڵێکی کوڕ لەسکی هاوسەرەکەی دا بوبێ، دوای لەدایك بوونی بەناوی باوکیەوە ناونرابێ، تاگەورەش بوبێ لەباتی باوکی هەربەناوی دایکەوە ناسرابێ، دووکەس لەگەورەپیاوەکانی کوردحاجی مستەفا پاشای یاملکی و جەنەڕاڵ شەریف پاشای خەندان، نازناوەکانیان لەنەنکیانەوە: یاملکی و خەندان بۆ ماوەتەوە .

نوێنەری ئێران بوو لەهەندێك پایتەختەکانی ئەوروپا کرایە حاکمی سابلاغی موکری، نوێنەری ناردە لای سەرۆك هۆزی مەنگوڕ تادەستی دۆستایەتی برایەتی، سوێندی خوارد تازیندووە مویەك لەسەری هەمزە ئاغا نەبێتەوە، ئەو لەبەر ئەوەی نەیدەویست درۆبکات پەنای بردە بەرکلاوی شەرعی، لەژێر پاڵتاوەکەی چۆلەکەیەکی شاردبووە کاتێك دەستی گەیشتە هەمزە ئاغا سەرەتا چۆلەکەی کوشت، ئەمری دا تیربارانی چادرەکەی هەمزە ئاغا بکرێ، پاشان سەری بڕی سەرەکەی نارد بۆشای ئێران[٣١٩] .

لەناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم مەنگوڕ لەهاوینان لە(میانداو، بناو) دەژیان لە زستانان ڕویان کردۆتە (پشتدەر، کۆیسنجەق) کە سەربەسلێمانیە، بەلآم دواتر دوای ئاڵۆزبوونی کێشەکانی سنور و ناچار بوونی عەشیرەتەکان بەنیشتەجێ بوون، بەشی هەرە زۆری مەنگوڕ کەوتنە سنوری کوردستانی ئێران، تەنها دوو لەلقەکانی کەوتنە سنوری باشوری کوردستان. یەکەمیان زوودی: لە(٢٦) گوند لەڕۆژئاوای ڕووباری ژاراوە نیشتەجێ بوون. دووەمیان مەنگوڕە ڕووتە: لەکەناری ڕۆژهەلآتی سەرچاوەکانی ڕووباری ژاراوە لە(٤) گوندا نیشتەجێ بوون.[٣٢٠]

---

[٣١٩] سایتی وشە: عەشیرەتی کوردی مەنگوڕ، ٢٠١٣/٣/١٦ .

[٣٢٠] درویش باشا: تقریر درویش باشا لتحدید الحودود الایرانیە– العپمانیە سنە ١٨٥٣ ، المصدر السابق ، ص٣٦ .

[٣٢٠] سی .جی . ادموندز: کرد و ترك و عرب سیاسە و رحلات و بحوپ عن الشمال الشرقی من العراق ١٩١٩ – ١٩٢٥ ، المصدر السابق ، ص٢٠١ .

## مامەش :

مامەش: دوو تیرەن حەمەدئاغایی و مام قادری[٣٢١] . (مامەش)ەکان یەکێکی ترن لەم پێنج هۆزە گرنگانەی ئێران، کە ولاتەکەیان لەڕۆژهەلاتی لاوێن و باکوری ناوچەی مەنگوڕەکان هەلکەوتووە. ئەوانەش گرووپێکی بچکۆلەیان هەیە کەبە (مامەشە ڕەشکە) دەناسرێت و لەچوار گوندی عێراق لەڕۆخی ژاراوە لەسەرووی مەنگوڕە ڕووتەکان نیشتەجێن[٣٢٢] . مەردۆخی دەلێت: مامەش نزیکەی هەزار و پێنج سەد خێزانن، لە کەنارەکانی سابلاخ نیشتەجێن، چەند خێزانێکیان لەلاهیجانی نوێ نیشتەجێن، ناوەندەکەیان سووە، لەسەلدۆز و شنۆیش دەبینرێن[٣٢٣] . هۆزێکی کۆچەری بوون، لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا ژمارەیان بە چوار سەد مال خەملێنراوە، بەلام سەرچاوەی تر لەهەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بەسێ هەزار خەملاندوونی، بەگوێرەی (مارك سایکس)یش لەسەرەتای سەدەی بیستەم بەدووهەزار مال مەزندەی کردوون[٣٢٤] هەموو ژمارەکان مەزندەکراون، ئامارێکی ڕاست و دروست لەبەردەست نیە، ژمارەی هۆزەکان پشت ڕاست بکاتەوە. لەزستانان لەناوچەی (پێنجوێن، کۆیسنجەق، پشدەر) ژیاون، وەرزەکانی تری سال لەدیوی ڕۆژهەلاتی لاهیجانی سەر بە مەهاباد ژیاون. لەگرنگترین دێهاتەکانیان لەو ناوچەیە بریتی بوون لە(پەسوێ، ئەلۆس، جەلدیان، دێ شەمس، کێلەشین) ئەمانە لەباری زۆری ئەندامان و سامان و توانابیەوە لە عەشیرەتەکانی دەوروبەری خۆیان زیاترن[٣٢٥] .

---

[٣٢١] کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ ،ل٦٠ .

[٣٢٢] سیسیل جۆن ئید مۆندس: کورد تورك عەرەب،وحامید گەوهەری، چ٣، ٢٠٠٣،ل٢٧٠–٢٧١.

[٣٢٣] محەمەد مەردۆخی: مێژووی کورد و کوردستان، س، پ، ل١٢٠ .

[٣٢٤] خالد مەحمود کریم: س ، پ ، ل١٢٦.

[٣٢٥] میرزا محەمەدی جەوادی قازی: نامیلەی دەست نیشان کردنی خێلاتی دانیشتووی دەوروبەری سابلاخی موکری ،ل٦٤ .

## پیران :

هۆزێکی کۆچەری بوون، ژمارەیان تاناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەهەزار ماڵ مەزندەکراون، لەوەرزی هاویندا لەچەند گوندێکی ڕۆژئاوای لاهیجان کە بەکۆنە لاهیجان ناودەبرێ نیشتەجێ بوون، لەوەرزی زستانیشدا لە ناوچەی (بیتوێن، کۆیسنجەق، قەرەچۆغ، هەولێر) دەژیان[٣٢٦].لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەم دا بەهۆی ناکۆکییەك لەگەڵ (مامەش)ی دراوسێیدا لەبەردەم بەرپرسانی ئێرانیدا وەك سەرپێچیکەر دران لەقەلەم، بەو بۆنەوە ئاوارەی ناوچەی خۆشناوەتی بوون، بەلاّم دوای چەند ساڵێك سەرلەنوێ گەڕانەوە هەرێمی لاهیجان[٣٢٧]. پیران لقی چیانشینی لەئێران هەیە، لقی دەشت نیشنیان لەباکوری مەنگوڕەکان و ڕۆژئاوای لاوێن لەدە تا دوازدە گوندی بتوێن نیشتەجێن، ئەوان بەتەواوی سەربەخۆن و لەژێر فەرمانی چیانشینەکاندا نین. سەرۆکی دەشت نشینەکان سوار ئاغا بوو، کە لەسەردەمی لاوییەتیدا بەم پلەیە گەیشتبوو و خەڵکەکە بەتەواوی باوەڕیان پێی هەبوو و فەرمانیان بەجێ دەگەیاند[٣٢٨].

---

[٣٢٦] درویش باشا: تقریر درویش باشا لتحدید الحودود الایرانیه— العپمانیه سنه ١٨٥٣،المصدر السابق ، ص٣٧ .

[٣٢٧] میرزا محەمەدی جەوادی قازی : نامیلەی دەست نیشان کردنی خێلاتی دانیشتووی دەوروبەری سابلاخی موکری ،ل ٦٤—٦٥ .

[٣٢٨] سیسیل جۆن ئید مۆندس: کورد تورك عەرەب،وحامید گەوهەری،چ٣، ٢٠٠٣، ل٢٧٠—٢٧١ .

## سن

سین و ڕەمەك کەسەردەمێك سەرگوڵی سوپای نادر شا بوون، تووشی ڕۆژگارێکی ڕەش بوون، هەرکام پێنج گوندی فەقیر و هەژاریان لەناوچەی بتوێن لەنزیکی زێ هەبوون[٣٢٩]. ئەمانە پێکهاتوون لەدوولق، یەکەمیان (سن) دووەمیان (تافا) بەلاّم هەردووکیان بە(سن) ناودەبرێن و زۆر بەکەمی ناوی تافا دەبرێت، ژمارەیان لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەچوار سەد خێزان خەملێنراون، لەزستاندا لە قەزای بتوێن دەژیان، لەوەزی هاوین دا لەناوچەی سەردەشت و نلین فەقێ عیسا و دەشتی وەنێ دەژیان[٣٣٠].

## ڕەمەك

ئەمانیش لەدوو بەش پێکدێن: ڕەمەکی فەقێ وەیس و ڕەمەکی فەقێ عەبدولاّ ئاغا، ژمارەیان تێکڕا لەناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم بە(١٢٠) خێزان خەملێنراوە، لە وەرزی هاوین و زستاندا لەقەزای بیتوێن دەژیان، بەلاّم لەهاوینان ڕان و مێگەلەکانیان بەشوانەکان دا ڕەوانەی لاهیجان و کوێستانەکانی قەندیل دەکرد[٣٣١].

---

[٣٢٩] **درويش باشا : تقرير درويش باشا لتحديد الحودود الايرانية– العثمانية سنة ١٨٥٣، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٣ ، ص ٣٦ .**

*مەنگوڕایەتی مەڵبەندو ناوچەیەکی جوگرافیە بەسەر سابلاّخ و خانێ دا دابەش بوو، بەشی زۆری ئەومەڵبەندە سەربەشاری پیرانشار یان خانێ یە، ناوچەیەکی سەخت و شاخاوی و کوێستانیە، هەوایەکی سازگاری هەیە، بەهاران زۆر جوان و ڕازاوە و دڵڕفێنە، زۆربەی خەڵکی ئەوناوچەیە بەکشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریکن .

[٣٣٠] خالد مەحمود کریم: س، پ ،ل٢٧–١٢٨.

[٣٣١] محمود ئەحمەد محەمەد: میژووی هۆزی بلباس لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ،ب١،چ١،سلێمانی ١٩٨٩ ،ل٢٠٩

## هۆزی ئۆمەربل :

هۆزی ئۆمەربل یەکێکە لەهۆزە ناسراوەکانی کورد، بەئازایەتی و میوان دۆستی و ناسراون پێشووتر (حەوت)برا بوون، لەدوای ئەوەی کێشە کەوتۆتە نێوانیان لەسەر دابەشکردنی میراتی باوکیان، سەر ئەنجام دانەیەکیان لێ دەکوژرێت، (موراد، ڕەشید، محەمەد) کە دەبنە کوڕی (ئیسماعیل کوڕی عوسمان) ئۆمەری لەهەردوو شوێنی (ماردین، دیاربەکر) لەباکوری کوردستان گیرسانەوە. دواتر ئەم سێ برایە بەم شێوەیە دابەش بوون :

ڕەشید ئاغا: لەناوچەی ڕەشیدە نیشتەجێ بوو کە دەکەوێتە باکوری موسڵ، نەوەکانی ئێستا لەوێ نیشتەجێن ژمارەیان زیادی کردووەو بوونەتە چەند تیرەیەك قورسای خۆیان هەیە لەم ناوچەیەدا .

موراد ئاغا: لەچیای (مەقلوب) نیشتەجێ بوون لەناوچەی (شێخان) کە نەوەیەکی زۆری لەخۆی جێهێشت، ئەوانیش قورسای خۆیان هەیە لەناوچەکە .

محەمەد ئاغا: لەناوچەی مەخمور نیشتەجێ بوو، ئێستایش نەوەکانیان لەم ناوچە بلاوبوونەتەوە، کاریگەری خۆیان هەیە. خێزانی هۆزی(ئۆمەربل) لەم ناوچانەش دەبینرێن وەك (نەینەوا، قەزای سنجار، کفری، تلکێف، ئاکرێ) ناوی هۆزە لە (عومەری)یەوە هاتەوە بەلأم کورد ناوەکە کورت دەکاتەوە(هۆمەر، یان ئۆمەر) دواتر بە (ئۆمەربل) ناسران. سەرۆکی هۆزی (ئۆمەربل) کۆن (شێخ عومەر کوڕی ئیسماعیل ئاغا) بوو پاش کۆچی دوای سەرۆکایەتی بۆ(ئیسماعیل ئاغا)ی کوڕی بووە بەسەرۆك هۆز .

ئەم هۆزە لەچەند تیرەیەك پێك هاتووە:

١- تیرەی (ئال شەمام): شێخ ڕاشد حەسەن ئیسماعیل سەرۆکایەتی کردووە .

٢- تیرەی(بابا): موستەفای حاجی عەلی سەرۆکایەتی کردووە .

٣- تیرەی (بەرازی): ئەحمەد سەعید سەرۆکایەتی کردووە .

٤- تیرەی بەرازی گەورە: موحسین تۆفیق سدیق سەرۆکایەتی کردووە .

٥- تیرەی (ڕاشیدی): خالید عەبدولڕەحمان جومعە سەرۆکایەتی کردووە .

٦- تیرەی (محەمەد ڕەشان): ئیسماعیل عومەر ئیسماعل سەرۆکایەتی کردووە .

٧- تیرەی (کودار): شاکر خورشید محەمەد سەرۆکایەتی کردووە .

٨- تیرەی (هەنجیرۆك): ئیبراهیم ئەحمەد ئیبراهیم سەرۆکایەتی کردووە .

٩- تیرەی (شەمسەخر): محەمەد ئەمین محۆ سەرۆکایەتی کردووە[٣٣٢].

بەپێی قسەی ڕیش سپیانی هۆزی ئۆمەربل لە(گەرمیان)باس لەوە دەکەن دەچنەوە سەر یەکێتی هۆزەکانی بلّباس، ئەم هۆزە پێشتر لەخۆرهەلاّتی کوردستان بوون بەلاّم بەهۆی هۆکارێك کۆچ دەکەن بۆ باشوری کوردستان، بەچەند قۆناغێك هەر قۆناغێك لەناوچەیەکی کوردستان بۆماوەیەك دەگیرسێنەوەو پاشان کۆچ دەکەن بۆناوچەیەکی تروەك بە کورتی ئاماژەی پێدەدەین وەك سەرەتا بۆماوەیەك لەدەڤەری ڕانیە لەبناری شینی لەگەڵ خێڵی (عەباس ئاغای خێڵی مامەند ئاغا) کەئامۆزان دەمێننەوەو پاشان بۆ ناوچەی گۆخەلاّن لەخۆرهەلاّتی شاری پێنجوێن نیشتەجێ دەبن، چەند ماڵێکیشیان ڕویان کردۆتە ئەودیوی ئێران لەخۆرئاوای شاری کرماشان نیشتەجێ دەبن و ئێستاش نەوەکانیان ماون و بەهۆزی هۆمەربلی دەناسرێن، پاشان چەندین کۆچی تردەکەن و بۆماوەیەك لەسەیدسادق لای دێی شانەدەر نیشتەجێ دەبن وپاشان بۆ قرگەی سلێمانی کەئێستا گەڕەکێکە لەسلێمانی، تادواجار لەگوندی(ئۆمەربل) لەناوچەی گەرمیان لە ساڵی (١٧٨٥) زاینی لەلایەن (حەسەن کوڕی ئەحمەد کوڕی خەسرەو کوڕی وەسمان کوڕی ڕۆستەم) کەبەحەسەن ئۆمەربلی ناسراوەئاوەدانکراوەتەوە[٣٣٣].ئۆمەربلی هۆزێکی نیشتەجێی و کشتوکاڵ کارو شوانکار بوون، لەگەرمیان ناوچەی سەرەکیان قەزای (کفریە)، نزیکەی (٢٥٠) ماڵ بوون و لەتەنها گوندێکدا دەژین، ئەم گوندەش ناوی

[٣٣٢] گفتۆگۆی نوسەر لەگەڵ www.fasbook ڕووداوی ئۆمەربل ٢٠١٦/٤/١٥ .

[٣٣٣] ئەکبەرحاجی ڕۆستەم ئۆمەربلی:دانانی بناغەی دێ ئۆمەربل ،چ١، بەشی دووەم، ٢٠١٠،ل١_ ٣ .

(ئۆمــەربل)ە، ئــەم هــۆزە لەســنورەکانی هــەولێرو موســڵ هــەن و هــەر بەئۆمــەربلی ناسراون(٣٣٤).

---

٣٣٤ حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : س ، پ ، ل١٩٠ .

کورتەیەك لەمێژووی هۆزی گەورەی جاف :

جاف* لەماوەی سەردەمی عوسمانیەکاندا گەورەترین هۆزی کوردی کوردستانی باشور و ڕۆژهەلاّت بووە، لەهەموشیان زیاتر تیرە و لق و پۆپی هەبووە، بەلاّم وەکو دەردەکەوێت بەر لەهاتنی عوسمانیەکان بۆ کوردستان و دەست بە سەردا گرتنیان بۆ ئەو ولاّتە بەهەمان ئەو ناوەی ئێستا نەناسرا بێت، چونکە ئەوەتا نە (ئبن فزل ئەلعمری) لە(مسالك الابصاری، ٧٣٩ ك/١٣٣٨ز) و نە(مامون بیك کوڕی بیگە بیگ) لەیاداشتەکانی خۆی لەسالّی (٩٨٥ك ١٥٧٧ز) باسیان نەکردووە بەلاّم وەکو دەگوترێت:



**ئێل بەگی جاف***

شاعیرێکیان بەناوی ئێل بەگ هەبووە کەپێی بۆچوونەکان لەسەدەی شازدە ژیاوە[٣٣٥]. مەردۆخی دەڵێت: جاف نزیکەی دوانزە هەزار بنەماڵە بووە، شوێنی هەمیشەیی ئەوان لەپارێزگای سلێمانیە، زستانان لەبانی خێلاّن تا سنوری قزلّەبات ڕۆیشتوون لەبەهاریش ڕوویان کردۆتە شارەزوور و ناوچەکانی سنە ئەم تایفەیە دوولقن، جافی مورادی سی و دوو تیرەن و جافی جوانرۆ هەژدە تیرەن[٣٣٦].

---

[٣٣٥] زرار سدیق تۆفیق(د): هۆزو دەسەلاّتە هۆزەکیە کوردەکانی چاغی ناوەڕاست ،و ئیدریس عەبدولا مستەفا، چ١ ،چاپخانەی هاوسەر، هەولێر ، ٢٠١٠، ل٧ .

*ئێل بەگی جاف هەندێك سەرچاوە باسی دەکەن لەسالّی ٨٩٨زلەدایك بووە، لەسالّی ٩٦١ز کۆچی دوایی کردووە، هەندێك دەڵێن لەناوچەکانی سنجاوی لای کرماشانی ڕۆژهەلاّت ژیاوە، هەندێکی تر دەڵێن لەدەوروبەری شارەزوور و گەرمیان لەباشوری کوردستان ژیاوە، پاشان لەتەمەنی گەنجێتی چووەتە هەورامان بەهۆی خۆشی و دلگیری و ناوچەکە لەوێ بەیەکجاری ماوەتەوە و ژنی هێناوە .

[٣٣٦] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل٩٢

*شێخ محەمەد مەردۆخی کوردستانی ناسراوە (بەجەمال الدین) نوسەرێکی گەورەی ڕۆژهەلاّتی کوردستانە لەشاری (سنە) لەماوەی ژیانیدا (٤٩) پەرتووکی بەزمانی (کوردی، عەرەبی، فارسی) بەچاپ گەیاندووە .

مەیجەرسۆن دەڵێت: جاف یەکێکە لەهۆزە گەورەکان، بەگشتی ڕەوەندن و نـەفرەت لـەژیانی نیشـتەجێی قزڵڕەبـات (سـعدیە) دەکـەن تـا ئـەو پـەڕی بانـە، ئـەم هـۆزە بەشێوەیەکی گونجـاو بەخاکـە پـان و بەرینەکـەی خانـەقین دا لەگـەڕان و جوڵـەدان بـۆ بەری باشوری ڕۆژهەلآت بەدرێژایی دۆڵی ڕووبـاری دیالـە دەڕۆن، هـۆزی جـاف هەمیشـە سەرچـاوەی نائـارامی و دڵـەڕاوکێ دەوڵەتـەکانی ئێـران و تـورك بـووە، هۆکـارێکی ڕاستەقینەی سیاسەتی باشوری کوردسـتانن[٣٣٧]. هـۆزی جـاف وەك هـۆزێکی کـورد لـە پەیمانی زەهاو لەساڵی (١٦٣٩) زاینی نێوان دەوڵـەتی(عوسمانی، سـەفەوی) ئاماژەیـان پێکراوە، ئەم پەیمانە بووە هۆی دابەشکردنی هۆزی جاف، هەندێکیان کەوتنـە سـنوری ئێران و زۆرێکیان کەوتنە سنوری دەوڵەتی عوسمانیـەوە بـەجافی مـورادی ناسـران، ئـەو سنورەی کە ئەم پەیمانە بۆهۆزی جاف دیاری کرد بوو بۆئەوە ئـەبوو کـە ڕێگربێـت، لـە گەرمیان و کوێستانی ئەم هۆزە، کەزۆر جار بووبووە هۆی کێشـە بـۆ هـەردوو دەوڵـەت، سـەرنجام لە(پـەیمانی ئـەرزەڕۆم) لەسـاڵی (١٨٤٧) ز هـەردوو دەوڵـەت لەسـەرئەوە ڕێککەوتن، بەلآم ئەم پەیمانە نەیتوانی وا لەهۆزی جاف بکات واز لەگەرمیان و کویستان کردن بهێنێت چ بە بەرتیل دان بێت یان بەشێوازی قاچاخ و ملهوری جافەکان بێت[٣٣٨].

---

*جافی مرادی: ئەو تیرانەی جاف بـووە کـە لەئـەنجامی پـەیمانی زەهـاودا کـە لەسـەردەمی (سـوڵتان موراد) عوسمانی مـۆرکراوە، بۆجیاکردنـەوەیان نازنـاوی مرادیـان دراوەتـێ، مەڵبەنـدی ژیـانی جـاف مرادی کەوتووبووە ناو قەڵەمڕەوی میرایەتی بابانەوە، زۆریـان ڕەوەنـد بـوون، کـەمێکیان نیشـتەجێ بوون .

*جافی جوانرۆ: پێك هاتووە لەو هۆزو تیرەو بەرەبابانەی لەسنوری دەسەلآتی ئێران ماونەتەوە، سـەر بەئەمارەتی ئەردەلآن بوون، والی ئەردەلآن سەرۆکەکانی دیاری کردوون، ئەمانە زۆریـان نیشـتەجێ بوون، کەمێکیان ڕەوەند بوون، سەرۆکایەتی جافی جـوانرۆ و جـۆری پێکهاتـەی خێڵایـەتیان جیـاواز بووە لەجافی مرادی. نەوشێروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین .

[٣٣٧] مەیجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ ،ل٨٧– ٨٨ .

[٣٣٨] شوکریە کریم سەعید : هـ، س، پ، ل ٢٣١

کلودیوس جێمس ڕیچ: لەساڵی١٨٢٠چاوی بە(کەییخەسرەو) سەرۆك هـۆزی ئـەوكاتی جاف دەکەوێت دەڵێت: هۆزی جاف کە کەیخەسرەو سەرۆکیانە، لەبەرزایی قەڵەم ڕەوی والی (سنە)دا دەژین، سەرو سیما جوان و ئازان، تەنانەت لای کوردەکان خۆیشیان، لـە خێڵە هەرەجەربەزەو دواکەوتوەکانن، شـێوە زمانیـان جیاوازیـەکی زۆری لەگـەڵ شـێوە زمـانی کـوردانی بابـان هەیـە، سـیمایان ئەوەنـدە جیـاوازە، بەئاسـانی ئـەتوانرێ بناسـرێتەوە، ئـەم هـۆزە بەئاسـانی دەتـوانێ چـوارهەزار پیادەیـان چـەك هـەڵبگرێ، چـاکترین جـەنگاوەری ناوسـوپای کـوردانن[٣٣٩]. ناوچـە بنچـینەکانی تیرەکـانی جـاف هەرێمـەکانی (جـوانڕۆ، زەهـاب، قەسرشـیرین) بـووە، لەسـەردەمی سـوڵتان مـورادی چـوارەمی عوسمـانی، ژمارەیـەك لـەتیرەو لقـەکانی جـاف بـەرەو باشـوری کوردسـتان هاتوون، ئەم سوڵتانە جێ کردنەوەو لەوەڕگای بۆدابینکردن، یەکێك لەوانە گەلاڵی بووە چونکە لەکاتەدا گەلاڵی لەگەڵ جاف گەرمیان و کوێستانی کردووە، ئـیتر ئـەم بەشـەیان هەر لەو ڕۆژگارەوە بەجاف مورادی دەناسـرێن، ئـەو تـیرەو لقانـەیان، کەلەهەرێمـەکانی خۆیـان مانـەوە، بـەجاف جـوانرۆ دەناسـرێن .عـەباس ئـەلعزاوی دەڵێـت: جـاف مـورادی لەعیراقـدا مێژوویـەکی کۆنیـان هەیـە، مێـژوویان بۆبـەر لەسـەردەمی سـوڵتان مـورادی چوارەم دەگەڕێتەوە[٣٤٠]. باسـیل نیکـتین لـەو بڕوایـەدا (گـەلاڵی، هـاروونی) هاوبەشـیی هێرشەکەی سوڵتان مورادی چـوارەمیان بـۆ سـەر بەغـداد کـردووە و نازنـاوی موراديـان وەرگرتـووە[٣٤١]. ڕیـچ لەکتێبـەی خۆیـدا لەگەشـتنامەی ڕیـچ بۆکوردسـتان دەڵێـت: لـە ١٣/ئابی/١٨٢٠ تێپەر بووم بەناو کاروانی خێڵاتـی کۆچـەر، یـان بـەناو هـەواری بچـوکی خێڵی جافی کوردا دەڵیت: پـێش ئـەوەی بچـنە شـارەزوور لێـرە هـەڵیان داوە، بەڕاسـتی

---

*کلودیوس جێمس ڕیچ: گەریدەیـەکی ئینگلیـزە لەسـاڵی ١٨٢٠ سـەردانی کوردسـتانی کـردووە، وەك خۆی دەڵێ یەکەمین ئەوروپیە سەردانی کوردستانی کردبێ، بە تێروتەسەلی باسیان کردبێ.

[٣٣٩] کلودیوس جێمس ڕیچ: گەشتنامەی ڕیـچ بۆکوردسـتان، و محەمەدحەمـەباقی،چ٣، هـەولێر ،٢٠٠٢ ، ل١١٩ .

[٣٤٠] زرار سدیق تۆفیق: هۆزو دەسەلاتە هۆزەکییە کوردییەکانی چاغی ناوەڕاست ، س، پ ، ل٧٦ .

[٣٤١] کەریمی فەتاح بەگی جاف: تەئریخی جاف ،چ١ ، ١٩٩٥، ل ٢٨ .

دلگیر و گەش و خۆش بوو، چونکە ڕەشماڵ وکەلوپەل وباروبنەیان زۆر بە ڕێکوپێکی پێچرابووەوە زۆر ڕێکیش لەسەر پشتی گاو مانگا بار کرابوون، دیارە بەکارهێنانی ئەم جۆرە ولاخانە بەمەبەستی باربردن، تایبەتە بەگەلی کورد، لەیادمە ئەم جۆرەنەریتە لەناوکوردانی (رەشوان) دا، لەئاسیای ناوەڕاست دیووە، ئەوا ئێستا ئەم جافانەش بەیادیان هێنامەوە، ژنان و پیاوانیان بەپێ ڕێیان دەکرد، ئای کەخەڵکێکی لەش تۆکمەن، پڕن لەجوانیی و شیرینی، ئافرەتیان کراس و شەروالی شین لەبەردەکەن، سەربەستی بچوکیش دەبەستن، چارۆکەش بەکۆڵدا دەدەن، کەبەڕەنگی شین و سپی دەچێنرێت[342] .دیسان ڕیچ دەڵێت: هۆزی جاف دوازدە تیرەن و جافە ڕەسەنەکان لە شەش سەد خێزان زیاترنین، بەلاّم پاشماوەی زۆری هۆزەکانی لوڕستان و کوردستانی ئێرانی تێدایە، لەژێر سێبەری جافدا دەژین لەبەرئەوەی ئێستا تێکڕای هێزی خێڵەکە، چەند هەزار خێزانێك دەبێ، ئەم هۆزە لەکاتی پێویستدا بۆبەرگری کردن لەخۆی دەتوانێ هەزار پادە و سێ سەد سوارەو بخاتە ژێر چەکەوە، بەلاّم کۆکردنەوەیان بۆ پێویستی میرناتوانرێ، خێڵەکە قایل بکرێ و ئەم هەموو هێزە کۆبکاتەوە، خێڵەکەش بەردەوام سالاّنە سێ سەد تورەکە یان جاروبار کەمتر بە میرنیشینی ئەردەلاّن دەدات، بەلاّم خێڵەکانی تر لەچاو ئەماندا باجێکی زۆر زیاتر دەدەن، چونکە نە وەکو جاف بەهێزن ونە وەکوجاف خۆیان پێ دەپارێزرێت[343] .



عێلی جاف لەناوچەی زەهاو, لەسەردەمی ژیانی کۆچەری دا .

---

[342] کلودیوس جێمس ڕیچ: س ، پ ، ل١٧٨.

[343] کلودیوس جێمس ڕیچ: ھ ، س ، پ ، ل ٢٥٦ .

## ڕەچەڵەکی بەگزادەی جاف :

بەگزادەکانی جاف وەکو بنەماڵەیەکی دیار لەڕوداوەکانی ناوچەکەدا، لەسەردەمی پیاوێکەوە دەسپێ ئەکا کەناوی زاهیر بەگە (زاهیر بەگ) بەباپیرە گەورەی هەمووی بەگزادەی جاف و دامەزرێنەری یەکێتی تیرەو و هۆزە جیاوازەکان دائەنرێ کەئێلی جاف مرادیان پێك هێناوە. بەگزادەی جاف لەگەڵ هیچ کام لەهۆزو تیرەکان کە ئێلی جافیان پێك هێناوە، خزمایەتی هاوخوێنی نەبووە و ژن و ژنخوازیشیان نەکردووە، هیچکام لەهۆزە سەرەکیەکانی جاف نەوەو وەچەی ئەوان نەبوون، بەڵکو هەریەکەیان هۆز یا تیرەیەکی سەربەخۆ بوون، زاهیر بەگ وەك هەندێك سەرچاوە ئەگێڕنەوە لەڕوداوێك دا کوژراوە، هۆی کوژران وشێوەی کوژرانەکەی لەسەرچاوە جیاوازەکاندا بەچەندین چیرۆکی ئەیگێڕنەوە[٣٤٤] .

هاتنی هۆزی جاف بۆ ناوچەکانی ژێردەسەلاتی میرنیشنی بابان :

سەبارەت بەهۆزی جاف و سەرەتای دەرکەوتنیان لەناوچەکانی شارەزوور و دەوروبەریدا، مێژوونوسان و شارەزایان ئاماژەیان پێ کردووە، ئەویش بەڕووداوی کۆچ کردنی (زاهیربەگ)ی سەرکردەی هۆزی جاف لە(جوانرۆ) لەسەدەی هەژدەی زاینی لەساڵی (١٧٧٢) ز بۆ کوردستانی باشور، لەم ڕوانگەیەوە بۆچوونی جیاواز هەیە بەکورتی ئاماژەی پێ دەدەین: بۆچونی یەکەم دەڵێت: هۆزی جاف تاساڵی (١٧٠٠) زدا لەژێر فەرمانڕەوای ئەردەلانیەکان بوونە و لەجوانرۆ نیشتەجێ بوونە، بەڵام بەهۆی هێرشی ئەردەلانیەکان بۆ سەرناوچەی جاف، سەرکردەی هۆزی جاف ئەکوژرێت وکوڕێك و براکەشی بەدیل ئەگرن، لێرەوە زۆرێك لەجافەکان هەڵدێن و پەنا دەبەنە بەر میرنیشینی بابان، هەندیکیان هەر لەجوانرۆ دەمێننەوە، هەندێکیان پەنایان بردە لای گۆرانەکان و پێیان وترا جاف گۆران[٣٤٥] .

---

[٣٤٤] نەوشێروان مستەفا ئەمین: بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێکی کۆمەڵناسی، چ١ ،کتێبی یەکەم ، بەرگی دووەم ، ٢٠١٥ ،ل٧٢–٧٤ .

[٣٤٥] شوکریە کریم سەعید : س، پ،ل ٢٣٢–٢٣٣ .

بۆچوونی دووەم: کەریم بەگی فەتاح بەگ پێی وابووە هەموو ساڵ هەندێ جەردەو پیاوخراپ لەئێرانەوە هاتووە، بۆ ناوچەکانی (دزیایش، پێواز، بانی خێلان) تالانی ناوچەکانی کردووە، لێرەوە میرەکانی بابان هانایان بردووە بۆ (زاهیربەگ )بۆئەوەی ئەو جەردانە لەناو بەرێت، ئەویش بەچوارسەد ماڵێکەوە هاتۆتە ئەم ناوچانە و توانیەتی لەجەردەو پیاوخراپ پاکی بکاتەوە بۆیە میرەکانی بابان لەپاداشتی ئەم کارە ئەو ناوچانەی سەرەوە ئاماژەمان پێی دا بە(زاهیربەگی) بەخشیوە .

بۆچوونی سێیەم: هەندێکی تر دەڵێن هۆزی جاف بەهۆی زۆربوونی ژمارەیانەوە، ناچاربوون لەساڵێکدا چەند مانگێك بەرەو لەوەڕگاکانی (زەهاو) کۆچ بکەن، بەشێکیان وازیان لەکۆچ کردن هێناو نیشتەجێ بوون، بەشێکیش لەهۆزی جاف بەڕێبەرایەتی زاهیربەگ کۆچیان کرد بۆناوچەی شارەزوور، لەسەردەمی دەسەلاتی (سوڵتان مورادی چوارەم) بۆیە بەناوی سوڵتانەوە خۆیان ناوناوە(جاڤی مورادی). سەبارەت بەهاتنی (زاهیربەگ) و ڕەشماڵەکەی بۆشارەزوور بیروڕای جیاواز هەیە، بەلام زۆربەیان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کەساڵی (١٧٧٢ز) هاتوون[٣٤٦].بەلام ڕای پەسەند ئەوەیە دەسەلاتی ئەردەلان* بەسوپایەکی تۆکمەی گەورە و گرانەوە پەلاماری جوانرۆ و دەڤەرەکانی دەداو هەندێکی زۆر لەتیرەکانی جاف بەسەرۆکایەتی (زاهیەر بەگی جاف) کۆچێکی گەورە دەکەن بۆ ژێر دەسەلاتی عوسمانی (ئیماراتی بابان) ئەو کۆچکردنە وردە وردە تەنگ بەزۆرێك لەهۆزە نیشتەجێیەکانی دەشتی شارەزوور هەڵدەچنن و جێگەیان دەگرنەوە[٣٤٧]. مەیجەرسۆن دەڵێت: هۆزی جاف لەو دیوو یاسا دەژین، کێوی

---

*ئەردەلان بریتی بوو لەهەرێمەکانی (سنە، سەقز، هەورامان، ژاوەرۆ، لەباشوری قەسری شیرین تاسنوری کرماشان، رۆژهەلاتی کۆلیایی، ئەسنفدئاوا، جوانرۆ، گەڕوس) ئەم هەرێمانە پاشان پێیان دەگوترا کوردستان، لەچوارچێوەی سنوری ئێران تێکڕای دانیشتوانی کوردن، لەژمارەیەکی زۆر هۆزی کورد پێکهاتووە، کە لەکۆنەوە لەو هەرێمانەدا نیشتەجێ بونە. حسن ئەرفەع : کوردەکان، و سامان عەبدولا ،چ١ ،چاپخانەی گەنج –سلێمانی، ٢٠٠٩ ل٤٣ .

[٣٤٦] شوکریە کریم سەعید : س، پ، ل٢٣٨ .

[٣٤٧] خوسرەو جاف: مێژووی جاف ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی– هەولێر ، ٢٠١٣، ل ٢٥٠–٢٥١ .

و دڕندە و شەڕفرۆشن، دەتوانن لەکاتی پێویستدا بەتوندی شـەڕبکەن، فراکسـیۆنەکانی لەناوخۆیان دا هێندە پارچە پارچەن ناتوانن هیچ کاری هاوبەش بەیەکەوە بکـەن، سـەر لەبەری هۆزەکە نێچیری تۆڵەسـەندنەوەیە، سـەرلەبەریان سـوونین و لـەڕووی ئاینیـەوە هێندە ئاین پەروەرنین. بەپێی گێرانەوە هۆزەکیەکان و مێژووی ئەردەلان ئـەوەمان بـۆ دەردەکەوێت کە لەبنەچەدا هۆزەکە زۆر لەوە بچوکتر بووە و لەناوچـەیەکی جـوانڕۆ لـە هەرێمی ئەردەلان نیشتەجێ بوون، تانزیکی دوو سەد ساڵ کە ئێسـتا دەکاتـە زیـاتر لـە سێ سەد ساڵ پێش ئێستا، لەبەر دوژمنایەتی لەنێوان بنەماڵەی ئـەردەلان و بەگـەکانی جاف دا، ئەردەلانیەکان لە لەشکر کێشیەکدا لەسنەوە بۆ سەر جوانڕۆ بـەڕێخرا کـە لـەو لەشکرکێشیەدا سەرۆکەکانی جاف و برایـەکانی و کوڕەکـانی بـەدیل گـیران و کـوژران . لەدوای ئەمە ژمارەیەکی زۆری سەرۆکی تیرەکان کە مابوونەوە هەڵهاتن و پەنایان بـردە بەر پاشای سلێمانی، لەکاتێکدا ژمارەیـەکی کـەمیان لـەولاتی بـاو و بـاپیران لـەجوانڕۆ مانەوە و کوڕەکەی والـی ئـەردەلان بـوو بـەحاکمی جـوانڕۆ. لقـی بنـەڕەتی جافـەکان و هەروەها ئەوانەی کە سەرۆکەکانیان کوژران پێیـان دەڵـێن مورادیـەکان کـە گـەورەترین بەشی هۆزەکە دەگرێتەوە و نزیکی دە هەزار بنەماڵە بوون، پەڕیوەی ناوخاکی باشوری کوردستان بـوون و بەرێککـەوتن لەگـەڵ دەوڵـەتی عوسمـانی، ڕێگـەیان پێـدرا هاوینـان لەناوچە بەرزاییەکانی سنوری ئێران لەدەوروبەری پێنجوێن و لەزستانانیش ئەو زەوی و زارانەی کە سەربەجکومەتی کەرکوکن، لەپایزان و بەهاران پێدەشتی شارەزوور، لەگـەڵ ناوچـەی گوڵعەنبـەر (خورمـاڵ)بن، بـەم شـێوەیە هـۆزی جـاف فراکسـیۆنێکی گـەورەی پێکهێنـا. ئەوانـەی لـەجوانڕۆ دەژیـان، هەنـدێکیان نـەیانتوانی ملکەچـی حـوکمی شازادەکانی ئەردەلان بن بۆیە پەڕیوەی نـاو هـۆزی گـۆران بـوون و خۆیـان خسـتە ژێـر پاراستنی سەرۆکی گۆرانەکان و بـە جـاف گـۆران ناسـران. ئـەم پەلانـە بـریتی بـوون لـە تیرەکانی(قادر وەیسی، تایشەیی، یوسف یارئەحمەدی، کیوك، نیرزەهـی، گورگـەکێش) ئێستاش هەر تێکەڵن لەگەڵ گۆران. بەشێکیان لەژێر دەسەلاتی سنە ماونـەوە کـەبریتی بـوون لـە(قوبادی، باباجـانی، وەلەدبـەگی، ئینـاخی، ئیمـامی، دەروێشـی، میربـەگی،

نامداربـەگی، هەنـدێك لەوانـە نیشـتەجێ بـوون و هەنـدێکی تریـان لەزسـتانان بـەرەو پێدەشـتی زەهـاو کۆچـڕەویان دەکـرد[٣٤٨]. جـاف بەشـێوەیەکی چـڕو پـڕ لەدەڤـەری شـــارەزوردا بەدەردەکـــەوێت، جاف(تـــەلان) لەناوچـــەی دوکـــان و ســـورداش دان، جافەڕەشکەش بەزۆری لەناوچەی پشدەرن لەباکوری سلێمانی نیشتەجێن[٣٤٩].

ژمارەیەکی زۆر لەتیرەکانی (جاف) لەگەرمیان نیشـتەجێن، بەتایبـەتی (قـەزای کـەلار، دەربەندیخان) ناحیەی (ڕزگـاری، بـاوەنور، سـەرقەلاّ) بەسـەدەها گونـدی ئـەو ناوچـانە لەسەر جاف ئەژمارکراون و هۆزی جاف لێی نیشتەجێیە. دوای شەڕی یەکـەمی جیهـانی (١٩١٤–١٩١٨) و تێکشـــکاندنی دەوڵـــەتی عوسمـــانی بـــارودۆخی ناوچـــەکان گـــۆڕانی بەسەردا هات، ئەم هۆزەش بەم هۆیەوە گەلێ گیروگرفت و کۆسپی ڕووبەڕوو بووەوە لە ڕووی گەرمیان وکوێستان کردنیانەوە، کەنەیان توانی بەئاسانی لەسنور بپڕنەوە، بەڵکو کاربەدەستانی ئێران بـاج وسـەرانەیەکی زۆریـان دانـا بـۆ پەڕینـەوەی مـەڕومالأتیان بـۆ ناوچەکانی کوردسـتانی ئێـران، تەنانـەت لەسـاڵی (١٩٣١) ز بـەدواوە حکومـەتی ئێـران نەیهێشت بەهیچ جۆرێ جافەکان لەسنور بچن بەو دیودا، کە ئەمانە هۆکارێك بوو بـۆ واز هێنـانی جافـەکان لـەژیانی کۆچـەری، لەسـاڵی (١٩١٨) بـەدواوە هـۆزی جـاف لەگـەڕان بەدوای ئالیکی ئاژەڵـەکانیان ڕویـان کـردە کوشـتوکاڵ کـردن، تاسـاڵی (١٩٢٢) ز پێـنج هـەزار ماڵـە کۆچـەری* مـابوو، تـاوای لـێ هـات لەسـاڵی (١٩٧٠) ز ژمـارەی خێزانـە کۆچەریەکان لە(١٠٠) خێزان تێ نەدەپەڕی، بەم شێوە لـەژیانی کۆچـەریەوە نیشـتەجێ

---

[٣٤٨] مێجەرئی .بی . سۆن: چـەند سـەرنجێك دەربـارەی هۆزەکـانی کوردسـتانی خـواروو ، و نـەجاتی عەبدوڵلا ، چ١، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ،٢٠٠٧ ،ل٦٥–٦٨ .

*جافەڕەشیدەکان ئەم نازناوێك بووە میری گەورەی ڕواندز (محەمەد پاشای گەورە) لەپایی ئازایـەتی بەم جافانەی ئەم ناوچەی بەخشیووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە تاهیر سـاڵح امـین: جـاف و میکایـەڵی، چ١ ،٢٠٠١ ، ل٤٦ .

[٣٤٩] د. مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، چ١، هەولێر، ٢٠٠١ ، ل٥٧ .

بوون و دەستیان کرد بەکشتوکاڵ[٣٥٠]. ئەم هۆزی جافە کە لەکوردستانی باشوردان بۆ پێیان ئەڵێن جاف مورادی؟ ئەمانە لەپێش (زاهیربەگ)دا، لەزەمانی سەڵتەنەتی سەفەویەکان و خەلافەتی سوڵتان (موراد)ی چوارەم هاتوونەتە کوردستانی بابان، ماوەیەك لەخاکی بابان و شارەزوردا دەمێننەوە، پاشان تێکڕا ئەچنەوە بۆ جێگەی خۆیان، گەلاڵی ئەمێنێتەوە لەشارەزوور ناگەڕێتەوە، جافەکانی جوانڕۆ و ئەیالاتی کرماشان بەمان ئەڵێن جافی مورادی. لەشارەزور (گەلاڵی، مەنمیی، گەڵباخی، کەڵهوڕ، تیلەکۆ، بڵباس) تێدا ئەبێت[٣٥١]. بەپێ سەرچاوە مێژوویەکان گەلاڵیەکان زیاتر لەسی و پێنج ساڵێك بەر لەکۆچی جافە مورادییەکان هاتوونەتەوە باشوری کوردستان، سەرەتا لەشارەزووردا نیشتەجێ بوون لەگەڵ ژمارەیەك لەهۆزەکانی تردا هاوپەیمانییەتێکی خێڵەکیان دامەزراندوو لایەنێکی بەهێزی ئەوهاوپەیمانێتییە بوون، پاش هەڵوەشاندنەوەی هاوپەییمانێتیەکەیان هاتوونەتە ناو (مورادی)یەکان، بەمەرجێك کاروباری خێڵەکیان لەلایەن ئاغاکانی خۆیانەوەبەڕێوەبچێت، بەلام لەشەڕو ئاشتی دا هاوڕازی مورادییەکان بوون. کۆزی زستانەی ئەم هۆزە لەخۆرهەلات و باشوری کفری و ناوچەی (قەرەتەپە)دا بووە، بۆ کۆچی ئێلاخیش چوونەتە هەوارگەکانیان لە (خورخورە)ی نێوان سەقزو دیواندەرە[٣٥٢]. ناوچە سنوریەکانی کوردستان دابەش کرابوو لەنێوان دەوڵەتی (عوسمانی، ئێران)ی کەکێشەیان لەسەربووە، لەبەیاننامەکانی

---

* کۆچەری: ئەمە بریتیە لەو هۆزو عەشیرەتانەی کە لەزستاندا لەدۆڵ شێوەکاندا دەژین، مەڕو ماڵات بارگەو خێوەت ڕەشماڵیان دەپێچنەوە، لەهەوارێکەوە بۆ هەوارێکی تر کۆچ دەکەن، هەرچەند دورتر بڕوانینە مێژووی کورد زیاتر ژیانی کۆچەری لەناو هۆزە کوردەکان دەبینرێت، بەلام هەرچەند بۆ خوارتر تەماشا بکەین، دەبینین ژیانی کۆچەری کەم تردەبێتەوە، تاپاش جەنگی یەکەمی جیهانی و دەوروبەری دووەم جەنگی جیهانی ژیانی نیشتەجێی باڵ بەسەر هۆزەکانی کوردا دەکێشێت، بەتایبەتی هۆزی جاف .

[٣٥٠] شوکریە کریم سەعید: س، پ، ل٢٣٨ .

[٣٥١] کەریم فەتاح بەگ: س ، پ ، ل ١٤٨ .

[٣٥٢] ئەیوب رۆستەم: هۆزی وەڵی لە ڕابوردوو و ئێستادا، چاپخانەی بابان، چ١ ، ٢٠٠٨ ،ل٢٨-٢٩ .

ئـەم دوو دەوڵـەت دا ڕێککـەوتووبن ئەگـەر ئـەم هـۆزە وابەسـتەی هـەرکام لـەم دوو دەوڵەتـە بـوون، ئـەوی تریـان مـافی قسـەکردن و ڕەخنـەگرتنیان نـەبێ. هـۆزی جـاف ساڵەهای ساڵ درێژەیان بە کۆچەکانیان دا بۆ ڕۆژهەلاتی کوردستان، لەپایز و زستان دا دەچوونە ناوچـە گەرمـەکانی باشـوری کوردسـتان و لـەوێ نیشـتەجێ بـوون، لـەوەرزی بەهارو هاوین دا دەهاتنە کوێستان وکێوەکانی کوردستان وخێـوەت و ڕەشماڵیـان هـەڵ دەدا دەسـت و پێوەنـدەکانی گەیشـتە سـێ فرسـەخی شـاری سـنە، بـەناوی حـەقی لەوەڕگاوە سالأنە برێك پارەیان دەدا بەحاکم و خەزنەداری کوردستان[٣٥٣] .

---

*سوڵتان مورادی عوسمانی لەساڵی ١٦٣٨، لەدوای داگیر کردنی بەغداد لەگەڕانەوەیدا بەگـەرمیان دا تێپـەڕبووە، هەنـدێك لـەزەوی و زارەکـانی ڕۆژئـاوای کفـری و باشـوری ڕۆژئـاوای کفـری، بـە (بـەیات) بەخشیوە، هەرلەناو کفری زەوی بـە وەنداوییـەکان بەخشـیوە، وەکـو پاداشـتێك بەرامبـەر بەشـداری کردنیان لەشەڕ و داگیر کردی بە غداد .بڕوانە محەمەد شاکەلی : گـەرمیان ڕابـردووی نزیـك و ئاینـدە، ٢٠٠٣ ،ل٥٣ . هەروەها مارف ئاغایی گەلاڵیش دەڵێ: سوڵتان موراد لەگوندی گەلاڵ هاتۆتە ناو هـۆزی گەلاڵی پێش ئەوەی ببێتە سوڵتان کەوەك جاسوس لـەولاتی سـەفەوییەکان بـووە، کـە ئاشـکرا بـووە شای سەفەوی بەشوێندیدا گەڕاوە، هۆزی گەلاڵی کە ئەوکات (کوێخا عەباس) سەرۆکی بووە، ڕزگـاری کردووە، ئەویش لەپاداشتدا (ئالان و حاسڵ) لەمەلاعەلی بەغدادی دەکڕێ و پێشکەشی هۆزی گـەلاڵی کردووە، شایەنی باسە گەلاڵی بەشـێکی سـەرەکی بـوون لەسـوپای سـوڵتان مـوراد بـۆ هێرشـی سـەر بەغـداد. گفتوگـۆی نوسـەر لەگـەڵ مـارف ئاغـای گـەلاڵی لـە٢٠١٤/٢/١١. سـوڵتان مـوراد لەسـاڵی (١٦٣٩ز)دا ڕێکەوتنی (زەهـاو)ی لەگـەڵ شاصـفی سـەفەوی مـۆردەکرد، لەئـەنجامی ئـەم ڕێککەوتنـە بەشێك لەهۆزی (جاف) کەوتنە سنوری دەوڵەتی عوسمانی و پێیان وترا (جافی مورادی) ئەوانەی هـەر لەجوانرۆ مانەوە پێیان وترا (جافی جوانرۆ).

[٣٥٣] عەلی نەقی ئەلحوسێنی: مێژووی٦٤١ساڵەی فـەرمانڕەوای ئەردەلانیـەکان لەناوچـەی کوردسـتانی ژێر دەسەلاتی ئێران، و ئاسۆس هەردی ،چ١ ،سلێمانی ، ٢٠٠٢ ،ل ٩٢–٩٣.



حەمەپاشای کەیخوسرەو بەگی جاف –



زاهیربەگی جاف



قادر بەگی زاهیر بەگی جاف



مەحمود پاشای جاف




کەریم بەگی جاف .



داود بەگی جاف




مستەفا بەگی جاف



سەردار بەگی جاف




ئەحمەد موختار جاف

## هەندێ لەتیرە ناسراوەکانی هۆزی جاف .

### تیرەی میکایەڵی :

میکایەڵی گەورەترین تیرەیە لەناو جاف مورادی، دەربارەی ناوی مورادی دوو بۆچوون هەن بەم شێوەیە:

بۆچوونی یەکەم پێی وایە ئەم تیرەیە دەچنەوە سەر پیرمکایەڵی شەش ئەنگوست، لە گوندی (دەودان)ی سەر بەناوچەی جوانرۆ نزیك ڕووباری سیروان ژیاوە و بەڕێنمایکردنی خەڵکەوە خەریك بووە، پاشان نەوەکانی هاتوونەتە باشوری کوردستان و لەناوچەکانی (قەرەداخ، سەنگاو، شارەزوور) نیشتەجێ بوون، لەم بوارەدا مامۆستا (مەلا عەبدولکەریم مودەرس) نووسیویەتی میکایەڵی تیرەیەکن لەجاف کۆچەری لەنەوەی (پیرمیکایەڵی دەودان)ن، کە بەپیر میکایەڵی شەش ئەنگوست ناسراوە.

بۆچوونی دووەم پێی وایە باپیرە گەورەی ئەم تیرەیە، کەسێك بووە بەناوی (میکایەل) و مەرج نیە ئەو کەسە (پیر میکایەڵ) بووبێ، هەروەك چۆن ناوی زۆربەی بنەماڵە و تیرە و هۆزە کوردیەکان بەناوی کەسێکی هەڵکەوتوویان یان ڕیشسپییەکی دیاریانەوە ناونراون[٣٥٤] . ئەم تیرەیە بەگەورەترین تیرەی ئێلی جاف دەژمێرێت، جاران کۆزی زستانەیان ناوچەی (سەنگاو، قەرەداخ) بووە هەندێك جار تا ناحیەی (قادرکەرەم) ڕۆیشتوون، کەبەرەو کوێستانیش بوونەتەوە لەڕێگای (سەگرمە، دەربەندی باسەرە)ەوە چونەتە. قەرەداغ و ئینجا تا ناحیەی (تانجەرۆ) و لەڕێگای ( پوشین)ەوە ڕۆیشتوونەتە (سرۆچك) و لەوێشەوە ڕۆیشتوونەتە کوردستانی ڕۆژهەلآت، لەناوچەکانی (نەکەرۆز، کەلی خان)ی نێوان بانەو سەقزدا هەواریان خستووە، ئەم تیرەیە بە تیرەیەکی هێمن و تێگەیشتوو دادەنرێت، بنەماڵەی(حەمەلی وەیسی) سەرۆکایەتی

---

[٣٥٤] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٤٨– ٤٩ .

تـیرەی میکایـەڵی کـردوو[٣٥٥] . سـەبارەت بەسـەرۆکایەتی سـەرۆکی هـۆزی میکایـەڵی لەپێشدا (حەسەنی حاجی قادر) کە لەبنەماڵەی (حەمەلی وەیسـی یـەکان) بـووە، دوای مردنـی رۆسـتەمی کـوڕی بووبـە سـەرۆك، دوای مردنـی رۆسـتەم (حـاجی حەمـەتالیبی فەرەجی مستەفا) بوو بەسەرۆك، دوایی مردنی ئـەویش حـاجی جـەزایی کـوری بـوو بـە سـەرۆك هـۆز، ئێسـتاش(دیاری حـاجی جـەزا) سـەرۆکایەتی ئـەم تیرەیـە دەکـات، ئـەم تیرەیە پیاوی زاناو خواناسی وەك (مـەولانا خالیـدی کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی حوسـێن) تێدا هەڵکەوتووە کەلەهۆزی ئالیبـەگی میکایەلیـە، کەڕابـەر و پیـاوێکی ئـاینی پایەبـەرز بووە، لەسـاڵی (١١٩٣ك) لەشـاری (زەردی یـاوا) ی ناوچـەی (قـەرەداخ) لـەدایك بـووە، لەساڵی (١٢٤٢ك) بەنەخۆشی تاعون کۆچی دوای کـردووە، لەشـام بـەخاکی دەسـپێرن، هەروەها شاعیری هەڵکەوتەی کورد (نـالی) کـەناوی تـەواوی (خـدری کـوڕی ئەحمـەدی شاویس)ە لەهۆزی ئالیبەگی میکایەڵیی لەساڵی(١٧٩٧) لەدایك بووە و لەسـاڵی (١٨٥٥) کۆچی دوای کردووە[٣٥٦] . ئەم تیرە لەناوچەی تانجەرۆ(عەربـەت) هەنـدێکیان نیشـتەجێ بوونە لەو ناوچە خانویان هەیە، پیشەیان کشتوکاڵ کردن و بـەخێوکردنی ئـاژەڵ بـووە [٣٥٧] . تــیرەی مکایــەڵی بەتایبــەت (ئــالی بــەگی) لەگــەڵ بــەگزادەکانی (جــاف) دا دەگەڕێنەوە سەر یەك بەرەباب (پیر خدری شاهۆ، پیر میکایل) برا بوونە، بـەگزادەکانی جاف، بەرەبابی ئـالی بـەگی، تـاوگوێزی، قوبـادی، باوەخـانی، وەڵـەد بـەگی، جـوانرۆ) بەشـێك لـە (ئینـاخی) ئەوانـە هـەموو لـەدوو بـرا کەوتوونەتـەوە[٣٥٨].تـیرەی میکایـەڵی لەناوخۆیاندا لەچـەند بنەماڵـە و بـەرەباب پێـك دێـن دیارترینیـان ئەمانـەن (حەمەعـەلی وەیسی، ڕەشوبۆری، شوانکارە، ئالیی بەگیی، میرەیی): هەریەك لـەم چـەند بنەماڵـە و بەرەبابانەش سـەرۆك و ڕیشسـپی خۆیـان هـەبووە، بـەڵام لـەناو خۆیانـدا سـەرۆکایەتی

---

[٣٥٥] ساڵح هارونی: س ، پ ، ل ١١٥

[٣٥٦] محمود عەزیز حەسەن: س ، پ ،ل٤٦–٥٦.

[٣٥٧] کریم فتاح بەگ: س، پ ،ل١٢٥–١٢٦.

[٣٥٨] خسرەو جاف: س ، پ ، ٨٥ .

بنەماڵـــەی (حەمەعـــەلی وەیســـی) یـــان بۆتیرەکـــەیان قبـــوڵکردووە، ســـەرۆکایەتی بنەماڵەکانیش لەلایەن ئەو کەسانە ناویان هاتووە لەلایەن کوڕ و کوڕەزا دیارەکانیانـەوە بەڕێوەبراون [٣٥٩].

لەچەند بەشێك و کۆمەڵێك پێکهاتوون وەك:

کۆمەڵەی یەکەم: محەمەد ئەلی وەیسی، دانیشتوو و کۆچەریان هەزار مـاڵ ئـەبوون، حەوت سەد یان کۆچەری و سێ سەدماڵیان دانیشـتوو بـوو، ئـەم کۆمەڵەیـە سـێ سـەد سوارو سێ سەد پیادەیان هەبوو جاران، سەرۆکیان (حەسەنی حاجی قادر) بـووە [٣٦٠]. ئەمانە لەناوچەکانی ژاڵـەو ڕەبـات و کـارێزە و ناحیـەی عەربـەت نیشـتەجێن و چـەندین کەسایەتی و پیاو ماقولأیـان تێـدا هەڵکـەوتووە وەك (ڕۆسـتەم حەسـەن، حـاجی قـادر، میرزا حاجی حوسێن، عەلی حاجی قادر)[٣٦١].

کۆمەڵەی دووەم: کەڕەش و بۆریە ئەم تایفەیـەش کۆچـەریان دووسـەد مـاڵ ئـەبوو دانیشتوویان سێ سەد تا چوارسـەد ماڵێـك ئـەبوو[٣٦٢]. ئەمانـە نیشـتەجێی ناوچـەکانی قیتور و ئیمام شاسوارن، چەندین کەسـایەتیان تێـدا هەڵکـەوتووە وەك (محەمـەد خـان سلێمان، مەجید مەردان، محەمەد یوسف[٣٦٣]. ڕەش و بۆری بە بەشێکی گرنگی تـیرەی مکایەڵی دەژمێردرێن، خەریکی کۆچەری بوون، خاوەنی مـەڕو مـالأتی زۆر بـوون لەچـاو تیرەکانی تردا دەوڵەمەند تر و خاوەنی مالأتی زۆر بوونە، زۆرێکیان نیشتەجێی دەڤەری سەنگاون، ڕەش و بۆریەکان بۆ خۆیان لایان وایە باپیرە گەورەی ئـەم تیرەیـە سـەرەتا لەناوی دوو کەسـەوە هـاتووە بـەناوی (حەمەڕەشـید، حەمـەبۆر) سـەرئەنجام بـووە بـە (ڕەش و بۆری) سەرۆکیان پێشتر(کەرەم وەیسی ئالی وەیس، فارسی عەزیزی مـەردان،

---

[٣٥٩] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٤٨– ٤٩ .

[٣٦٠] محمودعزیز حەسەن: س ، پ ، ل١٦

[٣٦١] ئاراس جاف: تۆڕی کۆمەلأیەتی فەیسبووك، ٢٠١٩.

[٣٦٢] محمودعزیز حەسەن: س ، پ ، ل١٦

[٣٦٣] ئاراس جاف: تۆڕی کۆمەلأیەتی فەیسبووك، ٢٠١٩.

حەمە خانی سلێمان، حاجی عـەزیزی حەمـەخانی سـلێمان، تۆفیـق حـارس) بـووە، لـە ئێستادا (محەمەد ئەحمەد قاسم) بەبراگەورەی ئەم تیرەیە ناسراوە، هەروەها (ئیبراهیم فارس فەقێ قادر) لەناو خەڵکدا بەدەم ڕاست و قسە بیستراو دەناسرێت[٣٦٤].

کۆمەڵـەی سـێیەم: شـوانکارەیە ئـەم بەشـەیان سـەدو پـەنجا کۆچـەریان هـەبوو، دانیشتوویان سەدو پەنجا ماڵ زیاتر ئەبوون، ئەم کۆمەڵەیە لەناو میکایەڵی دا زۆر ئـازاو بـوێرن. جـاران سـەرۆکیان (ڕەمـەزانی بەخشـە) بـوو، ئەمانـە لـەناو شـاری سـلێمانی دەوروبەری نیشتەجێن[٣٦٥]. ئەمانە کەسایەتی ناوداریان تێدا هەڵکـەوتووە وەك (ناسـر مـەحمود، فـەقێ عـەلی ....)، ئەمانـە لە(سـلێمانی، کفـری، کوڕەکچـینە، گۆبتەپـە، سەنگاو، ژاڵە) نیشتەجێن[٣٦٦].

کۆمەڵەی چوارەم: ئاڵی بەگییە ئەم کۆمەڵەیە کۆچەریان سەدوو بیسـت مـاڵ ئـەبوو، دانیشـتوویان لەسـەنگاو و تانجـەرۆ سـەدو پـەنجا مـاڵ ئـەبوو، حـەفتا سـوارو هەشـتا تفەنگداریان هەبوو، مەولانا خالیـدی نەقشـبەندی و شـاعیری گـەورەی کـورد نـالی لـەم کۆمەڵەیە بوو. سەرۆکیان (کاکەولای قازی) بوو ئەمانـە لـەزۆر دەڤـەر هـەن و بـڵاون لـە سورداش و دۆڵی جافایەتی و بێستانسوری شارەزوور نیشتەجێن[٣٦٧]. ناوی ئەم تیرەیـە لەناوی ئالی بەگی باپیریانەوە هاتووە، بەگوێرەی قسەی پیـاوە بەساڵاچـووەکانی ئـەم تیرەیە، دایکی لەبەگزادەکانی جاف بووە بۆیە ناوی بەگ لکاوە بەناوەکەیـەوە. لـەپاش کاکـەولای قـازی، حـاجی مسـتەفای کـوڕی لەگونـدی ترشـاو لەناوچـەی سـەنگاو بـوو بەسەرۆك. لەکەسایەتیە دیارەکانیان (حەمەساڵەح حـاجی نـادر، حەمەخورشـید حـاجی شاسوار، حەمەتالیب و حاجی جەزای کوڕی)[٣٦٨]. زیاتر لەسـێ سـەد خێزانـی مکایـەڵی

---

[٣٦٤] خسرەو جاف: س، پ ،ل ١٢٣ — ١٢٨ .

[٣٦٥] محمودعزیز حەسەن: س ، پ ، ل١٦

[٣٦٦] ئاراس جاف: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك، ٢٠١٩.

[٣٦٧] محمودعزیز حەسەن: س ، پ ، ل١٦

[٣٦٨] ئاراس جاف: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك، ٢٠١٩.

لەناو شاری موسڵدا دەژین کە بە بەرەبابی مەلاموسا ناسراون، بەڵام جێگەی سەرەکی نیشتەجێ بوونی تیرەی میکایەڵی لەم دەڤەرانەدا بوونەو هەن: (شارەزوور، ناحیەی عەربەت، قەزای هەڵەبجە، تانجەرۆ، وارماوە، قەزای قەرەداخ، ناحیەی سەنگاو، قەزای کەلار، ناحیەی ڕزگاری، دەربەندیخان، چەمچەماڵ، ئاغجەلەر، ناحیەی تاسلۆجە، گەڕەکی خەباتی ناو شاری سلێمانی، بەکرەجۆ، سەرچنار، ناحیەی سورداش، ناحیەی پیرەمەگروون، چوارقوڕنە، حاجی ئاوای ڕانیە. لەکوردستانی ڕۆژهەڵات دا لەزۆر جێگە و شوێن تیرەی مکایەلی هەیە وەك :(بانە، سەقز، دیواندەرە، سەردەشت، کرماشان، قروە، کامیران، سنە، جوانرۆ)[٣٦٩] .



شاعیری مەزن نالی ــ



حاجی جەزا حەمەتالیب



کوێخا تۆفیق حارس ڕەش و بۆری ــ



حاجی سەعید ناسر شوانکارە

## تیرەی شاتری :

شاتری بەیەکێك لەگەورەترین و سەرەکیترین تیرە دادەنرێت لەهۆزی گەورەی جاف، سەبارەت بەناوەکانیان (عەباس ئەلعزاوی) دوو بۆچونی هەیە :

یەکەم: ئەوترێ شاتری نەوەی کەسێکن ناوی (کوێخا شاتر) بووە کەگەورەی ئەم هۆزە (شاتر) لای شایی ئێران بووە کەئەودەمە شاتر بە پۆستەجی ووتراوە .

---

[٣٦٩] خسرەو جاف: س ، پ ، ل٨٩

دووەم: بنەمایـەکی فارسـی هەیـە پـێ وایـە لە(شـاهترین)ەوە هـاتووە کەبـەمانای گـەورەترین و بـەهێزترین دێـت، بەبۆچـوونی (نـوری حـاجی فـەتاح) سـەرۆکی یـەکێك لەتیرەکانی شاتریە لەسەر بۆچوونی یەکەمی (عـەباس ئـەلعزاوی)ە[٣٧٠]. شـاتر بـەمانای (لەتکـەر، دابەشـکار) دێـت، شـاتر مانـای تریشـی هەیـە وەك (وریـا، زۆرزان، چوسـت و چـالاك، چـاوپووك، زرنـگ) لـەزمانی فارسـی بـەمانای (نامەبـەری، پیـادە، نانـەوا، سەرپـەرشتیاری ئـەسپ دێت) بۆچـونێکی تـریش شـاتری بـۆ شـاتیرە دەگەڕێنێتـەوە بـە واتای تیرەیەکی دیار و لەپێش وبـژاردە. شـاتری شـەش تـیرە و هـۆزی سـەرەکی پێـك هاتووە: (برایمیی، میروەیسیی، وردە شاتری، یوسف جانی، کەرەم وەیسـی، کـەرۆیی) بـەلاّم زۆر لەسەرچـاوەکانی مێـژووی عەشـایەر ولەناویانـدا مەوسـوعەکەی عـەزاویش تیرەکانی وەڵی و نەژۆێنی و عیسایش بەبەشێك لە شاتری دەزانن وگەورەی هەموو ئەم تیرانەش لەدیداری عەزاویدا خۆیان وەك بەشێك لەشاتری ناساندووە .

شاتری کۆن لەگەڵ تیرەکـانی تـری جـاف کۆچـەر بـوون و گـەرمیان و کوێسـتانیان ئەکرد، ئێستا نیشتەجێ شارەزوور و گەرمیانن و بەچەند شـوێنی تـری کوردسـتان بـلاّو بوونەتەوە .

کۆمەڵی یەکـەم: برایمیـی لەسـەردەمی کـەریم فـەتاح بـەگ لـەماوەی جـەنگی یەکـەمی جیهانی، دووسەد ماڵ کۆچـەر و دانیشـتوویان سـەد مـاڵ بـووە، گـەورەیان (مەنسـوری ئاخە، ئیبراهیمی مەنسور،حەمەی مـەحمود ،حەمـەی برایمـە) سـەرۆکایەتی شـاتری لـە دەستی ئەم بنەماڵەیە، لەپاش تەفروتوناکردنی بنەماڵەی (کەرەم وەیسـیەکان) لـەدوای کوشـتنی(حەمە پاشـای جـاف). لەسـەرۆکەکانی تـری برایمـی کـە بەدرێـژایی مێـژوویان سەرۆکایەتی شاتریان کـردووە ولەدیارترینـەکانی جـافیش بـوون: مـەحمودی محەمـەد، حاجی محەمەدی مەحمود، حاجی قادری شاتری، حاجی ئیبراهیمی شـاتری ومسـتەفای حاجی قادربوون، لـەنێو ئەمانـەدا حـاجی قـادری شـاتری وەك گەورەیـەکی دەگمـەن و

---

٣٧٠ شوکریە کریم سەعید: س، پ ،ل ٢٤٢-٢٤٣.

چەترێکی کۆکەرەوەی شاتری وجافیش سەیرکراوە و لەسولَح وئاشتەوایی ونانبدەی ومیهرەبانیدا کەم وێنە تاریف دەکرێ .

کۆمەڵی دووەم: میروەیسیی کۆچەریان لەسەردەمی کەریم فەتاح بەگ دووسەد ماڵ بووە، دانیشتوویان سەد ماڵ بوو، گەورەیان (حەمە فەرەجی ئاخە، قادری پیروەیس، نوری حاجی فەتاح) ئەمانە ڕاستگۆن لەپەیمان دان.

کۆمەڵی سێیەم: وردەشاتری کۆچەریان لەسەردەمی کەریم فەتاح سەدو پەنجا ماڵ بووە، گەورەی ئەمانە (حەمەی ڕەسوڵ و حەمەی خوسرەوە، شافەرەج حەمەی خەسرەو، سابیری شافەرەج، حاجی تالیم، مەحمودی ئەلی هەیاس) ئەمانە هەردەم ناوی ئازایەتیان هەبووە، بنەماڵەی ئەلك گەورە و سەرۆکایەتی ئەم تیرەیان کردووە [٣٧١]. کۆمەڵی چوارەم: کەرەم وەیسی ئەم تیرەیە عەزیز شاوەیس سەرۆکایەتی کردوون، کەرەم وەیسی بە بەشێکی دەست رۆیشتوی تیرەی شاتری ناسراو بوو، وەکو پێویست گوێڕایەڵی بڕیارەکانی (حەمەپاشای) جاف نەبوون، بەتایبەت کە نیشتەجێ بوون و بە کۆچەری نەمانەوە و بوونە خاوەن زەوی تاپۆکراو، لەئەنجام دا حەمەپاشا دوای گەڕانەوەی لەئێران (عەزیزی شاوەیس)ی بەعوسمانیەکان بەگرت دا و لەزیندانندا ژەهرخوارد کرا و گیانی لەدەست دا، ئۆباڵی مردن وژەهرخواردکردنەکەشی خرایە پاڵ (حەمەپاشا)ی جاف، بۆیە لەلایەن فارسی کوڕی و کەرەم وەیسی وشاتریەکانەوە بڕیاری تۆڵە سەندنەوەیان داوە و زۆربەی سەرۆك تیرەکانی جافیش سەرەتا بەزارەکی پەیمانیان داونەتێ کە لەتۆڵەسەندنەوەی عەزیزی شاوەیسدا شەریکیان بن، لەناوچەی گەرمیان و لەچیمەنی برایم سەمین، لەساڵی (١٨٨٠) هەلیان بۆ دەڕەخسێت و (حەمەپاشای) جاف دەکوژن، دوای ئەوە زۆربەی تیرەکانی جاف عێل جاری لەتیرەی کەرەم وەیسیەکان دەکەن، هەرچەندە هانا بۆ (هەمەوەندیەکان) دەبەن، بەڵام لەشکری جاف بەسەرۆکایەتی (عەبدولڕەحمان بەگ)برای حەمەپاشای جاف دەدەن بەسەر هەموو ڕەشماڵی کەرموەیسیەکان دا زۆرێك لەسەرچاوەکان دەڵێن هەموویان لەناو

---

[٣٧١] کەریم فەتاح بەگ: س ، پ ،ل١٢٨–١٢٩.

براوە، بەلاَم کوشتارێکی زۆریان دەبێت، هەردوولا ناچاردەکەن بەرەو ئێران هەڵبێن، لە ناوچەکانی(جوانرۆ، زەهاو) نیشتەجێدەبن، ئێستا ماڵی کەرەم وەیسی لەناوچەکانی شارەزور و گەرمیان هەن بەلاَم زۆر نین[٣٧٢] .

کۆمەڵی پێنجەم کەرۆیی: سەبارەت بەناوەکەیان چەند بۆچوونێك هەیە: هەندێك دەڵێن لە(کاکە ڕۆیی)ەوە هاتووە کەباوك یان برای بووە دواتر ناوەکە لەسەر زاران بووە بە کەڕۆیی یا کەرۆیی. یان هەندێك دەڵێن ناوەکەی لە(کەرەو بی)ەوە هاتووە وەك باس دەکرێت لەژێر دار بیەك بووە و کەرەی خواردووە دواتر ناوەکەی کورت دەبێتەوە بۆ کەرەوی. یان هەندێکی تر دەڵێن ئەمانە لەکەرەوی عەربەوە هاتوون بەلاَم لەڕاستیدا ئەوانەش کە بەعەرەب ناویان دەرکردووە کوردن و تواونەتەوە لەناو عەرەب دا بەهۆیی تێکەڵی و دەسەلاَتی عەرەبی لەناوچەکەدا .

ئەم تیرەیە پێشتر یەکێك بوون لەو تیرە کوردانە سەربەخۆ لەجاف ناوی هاتووە، ریچ ئاماژەی بۆکردوون و دەڵێت سەربە دەسەلاَتدارێتی بابانەکان بوون، دواتر ئەم هۆزەبوون بەشێك لەجاف و زیاتر لەگەڵ شاتری تیکەڵ بوون، ئەم بەشەی کەرۆیی ناو جاف چەند بنەماڵەیەك بوون لەکەرۆییەکانی ناوچەی قزلڕەبات و گەرمیان پاش زویر بوونیان لەسەر کێشەیەکی خێزانی ئەم بەشە لەکەرۆیی هاتوون بەرەو سەرەوە بۆ ناو جاف وەك دەردەکەوێت لەسەردەمی (عەزیزی شاوەیس) لەناو شاتری دا گیرسابنەوە، کە رەویەکان لەبزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردا هەمیشە قوربانیدەر و کۆڵنەدەربوون و کوڕی ڕۆژانی تەنگانە بوون[٣٧٣]. تیرەی شاتری لەپێشدا کۆزی زستانەیان کەوتبووە ناوچەی کفری لەنێوان (شێروانە، سەی خەلیل، باوەنور)، چەند خێزانێکیان لەناوچەی (شارەزور، دزیایش) نیشتەجێ بوون هێزی جەنگاوەریان (چوارسەد سوار، شەش سەد پیادە) بووە[٣٧٤]. شاتری لەشەڕ و ئاشتیدا خاوەن

[٣٧٢] سالح هاروونی: هاروونی لەمێژوودا ،چ١ ، سلێمانی ، ٢٠١١،ل ١١٨–١١٩ .

[٣٧٣] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل١٢٨–١٢٩ .

[٣٧٤] محمود عزیز حەسەن : س ، پ ، ل١٩

مەوقیف و قسەو بۆچوونی خۆیان بوون، لەڕۆژهەڵات و باشوری کوردستان بەشێوەی جیاواز بڵاو بوونەتەوە، سەرەتای بڵاو بوونەوەیان لە(سنە، بانە، ناوچەی مەریوان، هەندێ ناوچەی تری ڕۆهەڵاتی کوردستان)بووە، کلۆدیس جیمس ریچ دەڵێت: شاتری لەساڵی ١٨٠٠ز کۆچیان کردووە بۆ دیوی کوردستانی عێراق و بەشێکییان لەئێران ماونەتەوە، ئەوانەشی کەهاتوونەتە دیوی عێراقەوە سەرەتا لەناوچەیەك نیشتەجێ بوون کەئێستا پێی دەوترێت (بانی خێڵان)، کە دەکەوێتە باشوری قەزای دەربەندیخانەوە، ریچ دەڵێت: شاتری لەساڵی ١٨٢٠زاینی هەزار و دووسەد چەکدار و پیادەیان هەبووە، بەناوبانگن لەسەخاوەتی و خزمدۆستی و تیرەیەکی بێ وەیی و بێ کێشەن لەناو تەواوی تیرەکانی تری جاف دا، خزمایەتیان لەگەڵ زۆربەی هۆزەکانی تر دروست کردووە و خاڵوانی بەگزادەکانی جافن و خاوەنی چەندین کەسایەتی گەورە و کاریگەرن لە کوردستان و ناوچەکانی ئێران، لەزۆربەی شۆڕشەکانی گەلی کوردا ڕۆڵی کاریگەریان هەبووە، لەدامەزراندنی کۆماری کوردستان لەمەهاباد چەندین کەسایەتی باڵاو پلەداریان هەبووە وەك (میرزا عەبدولقادر حەمیدی شاتری) کەکۆتا بەجێماوی کۆماری کوردستانە و لەئێستادا لەڕۆژهەڵاتی کوردستان دەژێ، هەروەها لەپێگە حوکمیەکان و دەسەڵاتیش دا لەعێراق و ئێراندا سەرکردەیان هەبووە کەدیارترین نمونەش سەرکردەی کۆچکردوو (نەوشێروان مستەفا ئەمین) کەیەکێك بوو لەسەرکردە دیار و کەسایەتیە کارێزماکانی هەرێمی کوردستانی عێراق و ناوچەکە و لەبنەڕەتدا خەڵکی گوندی ناوگردانی شاتری شارەزوورە. شاتری لەگەرمیان لەم گوندانە بڵاو بوونەتەوە (قەڵاتۆپزان، گلاڵکەوە، چەمەبیسم للە، سەیدخەلیلی فەقێ مستەفا، سەید خەلیلی خەلیفە، پووقە، تۆقووت، توڕکە، کیژۆك، گەرمك، ژاڵەی حاجی قادر، ژاڵەی سەفەر، سۆفی ڕەحیم، خاڵەبەگ، دێی حەمەی قادر، قولەبەرز، تازەدێ، بێ ڕەش، قولەسوتاو، زەماوەنگە، چاڵەڕەش، حەسەن محە، قاسم ئاغا، زەنگەکە، لەواوان، پاریاوڵە، کەڵەشێرە، بانی خێڵان، ئیمام قادر، کانی سارد، گولانی حەمەی مەحموو) جگە لەم گوندانە شاتری لەبانسنوق، شێخ لەنگەر، باریکە، کوڵەجۆ، زەرداو نیشتەجێن

لەناوچەی زەندئاباد هتد.. هەروەها ژمارەیەکی زۆر خێزانی شاتری لەقەزای کەلار و باوەنوور نیشتەجێن. لەقەزای ڕانیە و بتوێن دوو گوند هەیە شاتری تێدانیشتەجێیە، شاتری لەڕۆژهەلاتی کوردستان بوونیان هەیە[٣٧٥]. لەشارەزوور لەگوندەکانی(دیێ قادری مارف، گامێش تەپە، هەردوو مەستەکان، ناوگردان ،بێرەشکە، شاتوان، کەلوران، دەرەشیش، بەردەبەل، بناوەسووتە، هەیاس) لەگەڵ تیرەی هاروونیدا (شاتری)یش نیشتەجێن[٣٧٦]. شاتریەکان بەدرێژایی شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کورد هەمیشە لەسەنگەری شۆڕش و کوردا بوون، لەسەردەمێکێدا ڕژێمی بەعس زۆرێک لەهۆزەکانی کوردی ناچارکرد بەکردنەوەی فەوجی جاش و خەفیفە بەلام شاتریەکان نەچوونە ژێرباری ئەو فشارانەی بەعس و مێژوویان پاك و سپی یە لەجاشێتی[٣٧٧].






حاجی قادری مەحمودی شاتری (١٨٨٩ – ١٩٧٨)   حاجی براهیم شاتری (١٩١٩ – ٢٠٠٠)   مستەفای حاجی قادری ژاڵە   سابیر شافەرەج محەمەد

## تیرەی یوسف جانی :

[٣٧٥] گەرمیان شاتری: تۆڕی کۆمەلایەتی فەیسبووك، ٢٠١٩/٣/٣.

[٣٧٦] حەکیم مەلا ساڵەح: هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا ،چ ٢ ،چاپخانەی چوارچرا–هەولێر، ٢٠١١، ل١٢٨.

[٣٧٧] گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ بێستون ژاڵەیی: کەلار، ٢٠١٩/٢/٥ .

یوسـف جـان بـرای (باوەجـان)ی بـووە، لەسـەردەمی (سـلێمانی ئـەلی وەیـس، حەمەساڵەحی کوڕی) کاریگەری و ناوبانگیـان زۆر بـەدیار کـەوتووە و بوونـە تیرەیـەکی بەهیزی جاف و شاتری[٣٧٨] . ئەمانە پێشترلەڕێگەی داری خلەوە کە هابەسەر گژی سێ دارەوە، دەچوونە ناحیەی وارماوە، لەڕێگەی چەمی چەقانەوە دەرۆیشـتنە پێنجـوێن و لـەوێوە دەچـوونە ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان لەکوێسـتانەکانی رۆژهـەلاتیش لە(کـەلی بـاو، مێشوولە) هەواریان دائەنا، کـەپانزە سـەعات لەسـنەوە دور بـوو[٣٧٩]. وەك باسـدەکرێ لەقۆناغێك دا لەتیرە هەرە دیاری و گەورەکانی ئێلی جاف بـووە، بـەلام پاشـان گـورزی زەمانە بچوکوکی کردووەتەوە، لەسەردەمێکدا (خلکی مەمە) سەرۆك و دەمڕاسـتی ئـەم تیرەیە بووە، یەکێك بووە لەپیاوە دیارەکانی ئێلی جاف، دەستی شیعر دانانی هـەبووە و بــەهۆنراوە بەتونــدی بەرپەرچــی ئەوانــەی داوەتــەوە کــە دژی جــاف شــیعریان هۆنیوەتەوە، بەهۆی توندڕەوی و بزێـوی و چاونەترسـی خۆیـەوە لەناوچـەکەدا میرانـی ئەردەلان تورە دەکات و (ئەمانولاخان)ی والی لەشکر کێشی بۆ دەکات و لەبەیانیـەك دا هـەل دەقۆزێتـەوە و بەلەشـکرەوە هـەلێ دەکوتێتـە سـەر(خلکی مەمـە) و دەیکوژێـت . دواتـر... (مـەحمود پیرۆەیـس) سـەرۆکی یەسـوجانی بـووە، یەسـوجانی لەهەڵسـوڕانی کاروباری عەشایەری خۆیدا سەربەخۆیە، لەگـەرمیان لەگونـدەکانی (لـەوایان، پاریۆڵـەی بچوك، کەواچەرموو، پوقە) نیشتەجێن لەگوندەکانی (بییـە ڕەش، ژاڵـەی حـاجی قـادر، کـارێزە) چـەند ماڵێکیـان هەیـە، لەشـارو شارۆچـکەکانی هـەردوو ناوچـەی گـەرمیان و شــارەزوردا چــەندەها مــاڵی یەســوجانی دەبینــرێن[٣٨٠]. لەشــارەزوودا لــەم گوندانــە نیشتەجێن (قوماشی ئەحـەی فـارس، تاسـروجە، سـەراوی سـوبحان ئاغـا، کشـەیەری، بێڕەشکە، ناوگردان)[٣٨١] .

---

[٣٧٨] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل١٢٠ .

[٣٧٩] کریم فتاح بەگ : س، پ ، ل ١٣٠ .

[٣٨٠] سالح هارونی: س ، پ ، ل١٣٣.

[٣٨١] بێستون شەوکەت: عەقڵی خێڵ ، چ١ ، ١٩٩٩ ،ل ٣٦-٣٧ .

یوسف جان و باوەجان بران، یوسف جان شەش کوڕی هەبووە هەبووە بەناوەکانی خلك، هەواس، دەمان، چەرمەڵ، چەرمەڵ، ئەلوەیس یارك، باوەجانیش سێ کوڕی هەبووە بەناوەکانی زاڵە، حەمەڕەزا، زۆراب[٣٨٢] .

یوسف جانی پیاوی عاقڵ و ناودariyان زۆر بووە لەوانە: خلکی مەمە: ئەم پیاوە لەسەردەمی ئەمانولاَخاندا ڕیشسپی و برا گەورەی یوسف جانیەکان بووە .

پیرۆەیس کوڕی مستەفا: پیاوێکی لێزان و ژیر بووە وشاعیر وشیعر دۆست بووە بۆیە ناوبانگی بەهەڵبەستی شیعری دەرکردووە وەك باسدەکرێت لەگەڵ پیرەمێردی شاعیر نامەی شیعریان ئاڵ و گۆڕکردووە .

مەحمودی پیرۆەیس دوای باوکی بووەتە ڕیش سپی (یوسف جانیەکان) ئەم پیاوە پیاوێکی خاوەن وێژە و زمان پاراو بووە و قسەی نەستەق و لەجێی خۆیدا بووە، هەر بۆیە بووەتە خۆشەویستی گەورە پیاوان و ڕیش سپی و سەردەمی خۆی[٣٨٣] . هەروەها ئەمانەش پیاوی دیار بوون (عەمینی سلێمان، محمودی مارف، حەمەعەلی محمود، قادری پیرۆەیس، مارف ئەلك ،حەمەعەلی ئەلك، ڕەمەزانی ئەلك، ئەحمەدی قادری ئەلی باوە، شاسواری قادر، ئەلی محەمەد عارەب)[٣٨٤] .

مام والی کوڕی حەمەعەلی مەحمود پیرۆەیسە، لەساڵی ١٩٥٢ لەسەراوی سوبحان ئاغا تۆتە دونیاوە، لەدوای کۆچی دوای باوکی لەساڵی ١٩٧١تەواوی ئەرکی تیرەکەی دەکەوێتە ئەستۆیی، پیاوێکی خۆش کەیف و قسەخۆش و نەرمونیان بووە، کەسایەتیەکی بەهێزی هەبووە لەگەڵ زۆربەی هۆزەکانی گەرمیان و شارەزوور پەیوەندی بەهێزی هەبووە، بەبەردەوامی هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانی داوە، لە

---

٣٨٢ گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ هاوار مام والی حەمەعەلی پیرۆەیس: سەراوسوبحان ئاغا، ٢٠١٨/١١/٦ .

٣٨٣ مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل١٢٢ .

٣٨٤ بێستون شەوکەت: عەقڵی خێڵ ، چ١ ، ١٩٩٩ ،ل٣٦-٣٧ .

ساڵی ٢٠٠٤ لەکاتی چارەسەرکردنی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی نێوان دوو بنەماڵە لەکەلار کۆچی دوای کرد[٣٨٥] .








لای دەستە ڕاست حوسێن زۆراب – حەحەعەلی پیروەیس و قادر سالّەح

مەحموی مامەلی – گەرمیان– کەواچەرموو

–مام والی حەمەعەلی پیروەیس – براگەورەی یەسوحانی

## تیرەی وەڵی :

ئەم تیرەیە لەپێشوودا زیاتر لەشاتریەوە نزیك بوون، بەڵام ئێستا تیرەیەکی سەربەخۆن لەجاف. لەسەر ناوەکەیان قسەی زۆر هەیە هەندێك دەڵێن نەوەی پیاو چاکێکی خواناس بوون، هەندێکی تر دەڵێن نەوەی پیاوێك بوون بەناوی (وەلید) بەتێپەڕ بوون کات بوو بەوەلی و وەڵی، هەندێکی تر دەڵێن بەشێکن لەوەڵەدبەگی[٣٨٦] .وەڵیەکان لێکۆلینەوەی وردیان کردووە و گەیشتوونەتە ئەنجام لەڕابردوودا لەجوانڕۆوە کۆچیان کردووە بۆناو جافی مورادی. لە(کەلار، باوەنوور، دەربەندیخان، ژاڵەناو، زەڕایەن،

---

[٣٨٥] گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ هاوار مام والی حەمەعەلی پیروەیس: سەراوسوبحان ئاغا، ٢٠١٨/١١/٦ . پێداچوونەوەی بابەتەکان مام هاوار .

[٣٨٦] مەلا سۆران گەرمیانی : مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل١٢٨–١٢٩ .

هەڵەبجەی تازە، سەیدسادق، شاتوان، شەکرالی، ناوگردان، کانی میل، کانی سارد، تازەدێی گەرمیان) براگەورەی ئێستایان (مام دارای عەبدولقادرە)[٣٨٧].

## تیرەی عیسایی :

یەکێکە لەتیرەکانی ئێلی جاف، ئەم تایفە سەد ماڵ بوونە جاران، لەناحیەی شێروانە لە(ژاڵە، باوەنوور، مامیل، سەید محمود) نیشتەجێن، کۆچەریان نەبووە مەگەر پانزە ماڵ نەبێ لەناو شاتری دا، گەورەی ئەمانە (فەرەجی عەلی ئەمیرخانە) بووە، سی سوار و سی پیادەیان بووە[٣٨٨] . ئەم تیرەیە پیاوی دەوڵەمەندوو دەست رۆیشتوی تێدا هەڵکەوتووە، وەك (ڕشید موسی) ئەم تیرەیە لەدووبنەماڵەی سەرەکی پێکهاتووە وەك (ئەمیرخان، مراد وەیس) ئەم تایفەیە گوندی(عیسایی، یارەمەند) دوو گوندی سەرەکیانە و دانیشتوانەکەی هەموو لەتیرەی عیساین لەگەرمیان هەروەها لە شارۆچکەکانی (کەلار، باوەنور، ڕزگاری) نیشتەجێن[٣٨٩].دانیشتوویان لەگوندی (بێڕەش، یارەمە، قولەسوتاو، پارێوڵە، گڵەزەردە، خراپە) و سلێمانی و شارەزوور و ناحیەی سیروان هەیە، لەئێستادا ژمارەیان نزیکی دوو هەزار خێزانن، محەمەد عەزیز عەلی هەمیرخان سەرۆکی ئەم تیرەیە بوو تا کۆچی دوایی لە٤ی ٣ی ٢٠١٩[٣٩٠] .




مەجید ئەحمەد بارام – محەمەد عەزیز عەلی هەمیرخان

کەسایەتی ناسراوی عیسایی– سەرۆك تیرەی عیسابییەکان

---

[٣٨٧] حەسەن جاف: ئەکاونتی ئێل بەگی جاف .

[٣٨٨] کریم فتاح بەگ: س، پ ، ل١٣٧.

[٣٨٩] سالح هارونی: س ، پ ، ل١٣٤

[٣٩٠] گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ جیهانگیر محەمەد عەزیز: ڕزگاری، ٢٠١٩/٣/٢٨ .

## تیرەی نەژۆێنی :

یەکێکە لەتیرە ناسراوەکانی هۆزی جاف، وەك تەواوی تیرەکانی تری جاف گەرمیان گەرمیان و کوێستانیان کردووە، زۆر تێکەڵاوی تیرەی شاتری بوون، وەك هەر تیرەیەکی سەربەخۆی جاف، بەگوێرەی زەمان زۆر بوونە و لەچەندین بەرەبابی سەرەکی پێکهاتوون، لەچەندین گوند و شارۆچکەی گەرمیان و شارەزووردا بڵاوەیان کردووە، لەناو خۆیاندا هەمیشە یەکگرتنێکی پتەویان هەیە و کچ و کوڕی ئەم تیرەیە ئەمڕۆ زۆربەیان زاکۆیان تەواو کردووەو ژیانێکی سەردەمیانەیان پێکهێناوە[391]. ئەم تیرە هەر لەکۆنەوەسەربەخۆ بوون و لەسەرجەم خۆشی ناخۆشیەکانی جاف دا بەشدار بوون و یەکێك بوون لەتیرە ناودارەکانی جاف. نەژۆێنی لە سێ بەرەباب پێکهاتووە وەك: (کەیانی، کەلأنتەر، نەویجان) .

ناوی نەژۆێنی لەنوێژ خوێنی یەوە هاتەوە بەهۆی زۆر پابەند بوونیان بەئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە کە زۆر نوێژیان کردووە، پابەندی دین بوون، ناویان ناوون نوێژ خوێنی یان نوێژ گەر یان نوێژانیەکان، ئیدی بەرە بەرە بەهۆی گۆڕانکاری زمانەوانیەوە کورت کراوەتەوە بۆ نەژۆێنی. ئەم تیرەیە درەنگ وازیان لەکۆچ و باری گەرمیان و کوێستان هێناوە، بژێوی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری بووە، هەر بەو بۆنەیەوە شوێنی ئاوەدانیان کەم بووە، ڕەقەی نەژۆێنی جێگەی هەوارگەی ئەم تیرەیە بووە، تا ئێستاش هەر بەو ناوە ناسراوە، هەوارگەی زستانەیان لەدامێنی جەوەڵی داری خلە بووە[392] .

لەپێش ساڵی(١٩٠٠) زاینی ئەم تیرەیە یەکێك بووە لەبەشداربووەکانی شەڕی قەڵای خاو، درەنگ وازیان هێناوە لەژیانی کۆچبەری و بژێوی ژیانیان لەسەر ئاژەڵداری بووە، هەر بەم بۆنەوە شوێنی ئاوەدانیان کەمە، ڕەقەی نەژۆێنی جێگەی هەوارگەی زستانەیان بووە لەدامێنی جەوەڵی داری خلە، هەوارگەی هاوینەیان نزیکی مەریوان بووە لەڕۆژهەڵاتی کوردستان. پاش ژیانی کۆچەری لەم شوێنانە نیشتەجێ بوون وەك :

---

[391] خسرەوجاف : س ، پ ،ل ٢٠٦ – ٢٠٧

[392] عەشرەتی نەژۆێنی – تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك .

پارێولاّی خواروو و ئاوەخوێڕی سەربەناحیەی باوەنور، کەلار کۆن پیرەی عیسا نەژۆێنی و حاجی ئەڵماس گێژ ئاوەدانیان کردووە، گوندی شۆراوی سەربەقەزای کەلار، کەوەڵە ناسراوە بەجافان سەربە ناحیەی قەرەحەسەن، قلرخی خواروو، سەربەقەزای سەیدسادق، لەم گوندو شارانەش هەن وەك: هەڵەبجەی شەهید، زەمەقی خواروو، بەشارەتی خواروو، قەزای سەیدسادق، شاتوان، قلرخی سەروو، سواری، هەڵەبجەی تازە، ئاوایی حەمەعەزیز، کانی کەوەیی چوغ، یەخشی سەروو، دەربەندیخان، باوەخۆشێن، سۆڵە، بەرکەل، کانی سارد[٣٩٣]

## تیرەی هاروونی :

هاروونی تیرەیەکن لەجافی مورادی، سەرەتا لەناوچەی (هاروون ئاد)ی نزیك (کرماشان) نیشتەجێ بوون، پاش کۆچەکەی (زاهیربەگی) سەرۆکی ئێلی مورادی بۆ یەکەم جار هاتوونەتە باشوری کوردستان، لەپەیماننامەی (زەهاو) کە لەمانگی کانوونی دووەمی ساڵی (١٦٣٩) زاینی لەنێوان هەردوو دەوڵەتی (عوسمانی و سەفەوی)دا مۆرکراوە، ناوی چەند تیرە و هۆز و شوێنێك هاتوون کە پێویستە لەقەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی بن، یەکێك لەو تیرانە تیرەی (هاروونی)یە .

ئەم تیرە هەروەك زۆربەی تیرەکانی تری جاف، ماوەیەکی دوورو درێژ لە کۆچ و کۆچباردا بوون لەبەینی ئێلاخ و گەرمەسێردا، کۆزی زستانەیان لەخۆرئاوایی ڕووباری (سیروان) دا بووە هەر لەخڕی (قەلاّتۆبزان)ەوە هەتاکو نزیك (دەربەندیخان)، لە کۆچکردنیش بۆ ئێلاخ لەڕێگەی (بانیخێلاّن) و تەنگەبەری (دەربەندیخان)ەوە هاتوونەتە سەر ڕووباری تانجەرۆ، ئینجا لەپردی (تووەقوت) پەڕیونەتەوە، لەوێوە بۆ (کەولۆس) و

---

٣٩٣ ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد،هۆز و تیرەکانی جاف، ٢٠١٨/١٠/١٥ .

(تەڕاتەوەن) و نالّپارێز و لەوێیشەوە ڕۆیشتوونەتە لەوەڕگاکانی هاوینەیان لەخۆرهەلأتی (پێنجوێن) و دەشتی (مەریوان)، تیرەکانی (عەمەلّە و سەدانی)یش لەگەلّ هاروونیـەکان گەرمیان و کوێستانیان کردووە. هاروونیەکان بەگشتی لەچەند بنەمالّە و بەرەبابێك پێك دێن کە هەریەکیان سەرۆك و ریشسپی خۆیان هەیە بەم شێوەیە :

١- بنەمالّەی سەلیمی سەرۆکیان (عەبدول محەمەدی حەمەمین) بووە .

٢-بنەمالّەی نادرشایی سەرۆکیان (پیروەیسی حاجی عەلی) بووە .

٣- بنەمالّەی قارەمانی سەرۆکیان (مستەفا قارەمان) بووە .

٤- بنەمالّەی بەیاخی سەرۆکیان (هەمزەی عیسا) بووە .

٥-بنەمالّەی ولّەدبەگی سەرۆکیان (فەریقی محەمەد) بووە .

٦- بنەمالّەی نێرنجی سەرۆکیان (مەحمودی ئەلی) بووە .

هـەموو بنەمالّـەکان لـەناو خۆیـان دا سـەرۆکایەتی سـەلیمی یـەکان بـۆ تیرەکـەیان قبـوولّکردووە و گوێڕایـەلّیان بـوون. بـەپێی سـەرژمێریەك کـە لەسـالّی (١٩٢٢ز) کـراوە ژمارەی ڕەشمالّەکانی (هاروونی) وئەو تیرانەی لەگەلّیان گەرمیان و کوێستانیان کردووە حەوت سەد و هەشتا ڕەشمـالّ بـوون، لەگـەلّ دەسـت پێکردنـی جافـەکان بەنیشـتەجێ بـوون، ئـەم تیرەیـە دەسـتیان بـە نیشـتەجێ بـوون کـردووە، لەناوچـەی گـەرمیان و شارەزوور سی و نۆ گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە[٣٩٤] . هاروونیـەکان یـەکێك بـوون لـەتیرە دەولّەمەندەکانی جاف، لەسالّی (١٩٢٢) زیاتر لەدەهەزار سەر مەڕیان شك دەبرد، جگـە لەژماریەکی زۆر ئەسپ، ماین، گا، مانگا مالأتێکی زۆر[٣٩٥]. یەکێکن لەکۆنترین تیرەکانی نـاو جـاف، لـەزۆر پـەرتووکی مێـژووی کۆنـدا نـاوی هـاروونی هـاتووە و نـاوی جـاف نەهێنراوە، هەندێك دەلّێن هاروونیەکان لە نـەوەی پیـاوێکی دەسـەلأت دارو هەلّکـەوتوو

---

[٣٩٤] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٥٤- ٥٥ .

[٣٩٥] مالّپەری کوردپیدیا: عەشیرەتی جاف و تیرەکانیان ، ٢٠١٣/١٠/٢٣ .

بووەبەناوی (هاروون) هەندێکی تر لایان وایە لەشوێنێك گیرساونەتەوە بەناوی (هاوون ئاوا) تا ئێستاش جێگەیەکی ئاوەدانە لەڕۆژهەلاتی کوردستان[٣٩٦]. هاروونی ئەمانە ئەبن بەچوار بەشەوە: (کۆمەلی سەلیم، کۆمەڵی نادرشەیی، کۆمەڵی قارەمانی، کۆمەڵی خولامی). هاروونی کۆچەر و دانیشتوانیان بەگشتی لەسەردەمی کەریم فەتاح بەگ سێ سەد ماڵ کۆچەر و سێ سە ماڵیشیان نیشتەجێ بوون، دانیشتوەکانیان لەناحیەی سەنگا و ناحیەی پێبازو ناحیەی وارماوە بوون، ئەم تایفەیە کۆچەر و دانیشتوانی دووسەدو پەنجا سواریان بووە لەگەڵ سێ سەدو پەنجا پیادەی تفەنگدار، ئەم تایفەیە زۆرئازا و بوێرن[٣٩٧] هاروونی لەشارەزوور و بناری شارەزووردا لەم گوندانە نیشتە جێن (قاجر، تەپەڕێزینە، قەدەفەری، مستەکانی مەلاعەلی، مەستەکانی کۆن قولخورد، عەلیاوا، گوڵەخانە، مەلاوەیسە، کانی شێخ، قارەمانی، غولامی سەروو، غولامی خواروو، دوانزە ئیمایی سەروو،دوانزەئیمامی خواروو، بێژاو، گردی شەریف، دەرەگولان، ڕیشێن، نێرگسە جار، جەرداسنە، وازۆڵ، گولانەکۆن، توەقوت، دێی قادری مارف، گامێش تەپە، ناوگردان، بێ ڕەشکە، شاتوان، دۆلاش، کەلۆڕان، تەپەڕەش، کشەیەری) بەشێکیان لەجوانرۆ ماونەتەوە[٣٩٨].لەگەرمیان بەتایبەتی لە دەشتی پێبازدا گوندەکانی هاروونی بریتیە لە(بانی خان، تۆپ خانە، حاجی لالیخانی عبدولقادر یان بنەماڵەی ئەولکەریمی حاجی، تازەدێی حاجی حسن، پونگنە، دڕکە) بەشێك لەدانیشتوانی هەردوو گوندی (بساکان، بانی خێلان)ی نزیك دەربەندیخان و (کەوزەینالی) سەربە قەزای مەیدان کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی ڕووباری سیروانەوە، (قەرەبلاخی خوارو)ی سەربەناحیەی کۆکس لەتیرەی هارۆنین، سەبارەت بە سەرۆکایەتی تیرەی هارونی وەکونەریتی عەشایەری ئەم تیرە پشتاوپشتە و لەدەستی نەوەی سەلیم بووە[٣٩٩].

---

[٣٩٦] خسرەو جاف: س ، پ ،ل٢٨٥ — ٢٨٨ .

[٣٩٧] کریم فتاح بەگ : س، پ ، ل١٣٤ .

[٣٩٨] حەکیم مەلا ساڵەح: س ، پ ، ل١٤٢— ١٤٣ .

[٣٩٩] ساڵح هارونی: س ، پ ،ل٣٥—٣٧

جاران کۆزی زستانەی هـارونی: کـەوتوبووە نێـوان ناوچـەی کفـری و پێـواز و ڕۆژئـاوای ڕووباری سیروان، جێگایی ئەسڵی پێشویان ناوچەی (هارون ئاباد) بووە، نزیکـەی سـەد خێزانێك لەتیرەی قارەمانیەکان وازیـان لـە ژیـانی کۆچـەری هێنـاو لەناوچـەی خورمـاڵ نیشتەجێ بوونە[٤٠٠].



عەلی حەمە ئەمین سەلیم–حاجی مەحمودی هارونی– حەمە عەلی عەبدولڕوحمان– حەمەی عەلی حەمەئەین

## تیرەی کەماڵەیی:

یەکێکە لەتیرە سەرەکیەکانی ناو هۆزی جاف لەمێژەوە وەك تیرەیەکی سـەربەخۆ و ناوبراون، وەك هەر تیرەیەکی تـری جـاف لەگـەرمیان و کوێسـتاندا خێـڵ و سـەر خێڵـی ناسراوی خۆیان هەبووە، چ لەگەرمیان و چ لەکوێستان دا خاوەنی هەوارگـەو لـەوەڕگای تایبەت بەخۆیان بوونە. بەڵگەیەکی نوسراو لەبەردەست دا نیـە سـەبارەت بەناوەکـەی، لەم ڕووەوە بۆچوونی جیاواز هەیە، هەندێك پێـی وایـە ئـەم تیرەیـە لەنـەوەو نەتیجـەی پیاوێکەوە پێکهاتوون بەناوی (کەماڵ) هەندێکی تر لایان وایە (کەماڵ) ناوی ناوچـەیەك

---

[٤٠٠] محمود عزیز حەسەن: س ، پ ، ل ١٨

بـووه و لـەژێر دەسـەڵاتی ئـەم تیرەیـەدا بـووه، هەنـدێکی تـر لایـان وایـە کـە چـەند سوارەیەکی ئازاو چاوپوك لەئێرانەوه هاتوون بەناوی (کەماڵ، شاتر، هـاروون، سمایـل، مکایل) هەر یەك لەمانە بوون بەتیرەیەکی گەورەی ناو (جـاف). تـیرەی کەماڵـەیی وەك تیرەکانی تری جاف ئاژەڵدار بوونـە و مـەڕ و مـاڵاتێکی زۆریـان هـەبووه، یـەکێك بوونـە لەتیره دەوڵەمەندەکانی ناو جاف.

لەگیا گەناندا خێڵ جموجوڵی پێ کەوتووەو نەیانهێشتووه زەردی گژوگیا دەرکـەوێ خێڵ گوێزاوەتەوه بـۆ مێـرگ و سـەوزەلانییەکانی تـر، ئیـدی بـەو چەشـنە هەوارگـە بـە هەوارگە ڕۆیشتوون تا گەیشتوونەتە دوا هەوارگەی دەستنیشان کراو لەکوێسـتان دا، وە هەر کزەبای ساردی پایز دەستی پێکردووه سەرەو خـوار بـەرەو گـەرمیان بوونەتـەوه، هەوارگـەی تیرەکـە لەڕۆژهـەڵاتی کوردسـتان (بیانـدەره)بوو کەشـوێن هـەوار خێڵـی (کەچەڵی) بوو، (شەکەربەگ) شـوێن هـەواری عـەلی ئەحمـەد (مەمـەیی)بوو، (حـەوزێ) شوێن هەواری سەمینی شاوەیس، (میشاوەکۆن) شوێن هەواری مـەحموودخانی بـووه .

کەماڵـەیی لەچـەند بـەرەبابێك پێـك هـاتوون وەك (کەچـەڵیی، شـیروانی، سوسـکی، مەحموودخانـە، مەمـەیی). کەچـەڵی بەگـەورەتریت بـەرەبابی نـاو تـیرەی کەماڵـەیی دەژمێردرێت ودەوڵەمەندیشن، حەمەسور کەماڵەیی بـاوکی وەلـی دێوانـە لـەم بەرەبابـە بووه، لەچەند بنەماڵەیەکی سەرەکی پێکهاتوون وەك بنەماڵـەی (حەمەسـور، حەمـەلی، هەیدەری، زایـەری، بـاپیر، سـەیفوڵڵا، زۆراو، شـاوەیس) هەنـدێك پیـاوی نـاوداری تێـدا هەڵکەوتووه وەك(مستەفای عەلی پیروەیس، مەحمودی حەمەی عیسا، مستەفای ئەلی، حەسەنی محە، خەلیفە قادر، زۆراوی ڕەمەزان). ئەم تیرەیە لەناو تیرەکانی تـری جـاف دا بەتیرەیەکی پاك و خاوێن و دوور بوونە لەکاری دزی دەخەڵی زیاتر لەتیرەکانی کـەی جـاف پابەنـدی ئـاین و ڕێبـازە جـۆراو جۆرەکـانی ئیسـلام و پیرەکـانی نـاو تەریقەتـە جۆراوجۆرەکان بوونە، لـەم تیرەیـەدا پـەیڕەوانی تەریقـەتی (قـادری، نەقشـبەندی) زۆر هەبووه و پیاوی خواناسی زۆریان تیادا هەڵکەوتووه.لەم ساڵانەی دوای نزیکـەی حـەوت سـەد خوێنـدنکاریان زانکۆیـان تـەواوکردووه، لەبەشـەکانی(جوگرافیا ١٩٤ خوێنـدنکار،

زمانی ئینگلزی ١٣٢ خوێندکار، مێژوو ٨٥ خوێندکار ،٨٨ خوێندکار کۆلێژی پزیشکی، ٦٧خوێندکار بەشی کیما، کۆلێژی یاسا٦٤ خوێندکار، ٤٨ خوێندکار بەشی ئەندازیاری، چەند بەشێکی تری زانکۆکانی کوردستان و عێراق، هەروەها نزیکەی (پێنج سەد) خوێندکار پەیمانگایان تەواوکردووە .

شوێنی نیشتەجێ بوونی تیرەکە بەشێوەیەکی سەرەکی گەرمیانە، کە لەباکوری کەلار و دەشتی شێروانە نیشەجێ بوونە، پێکهاتوون لەپازدە گوند، لەشارەزووریش چوار گوند نیشتەجێن، بەلاّم لەم سالاّنەی دوای دا بەهۆی کۆچی بەلێشاوی گوند بۆ شار، هەندێك لەکەماڵەییەکان بەشارو شارۆچکەکانی دەوربەردا بلاّوەیان کردووە وەك (سلێمانی، هەولێر، کەلار، عەربەت، دەربەندیخان، سەیدسادق، کۆیە، ڕانیە) بەدیوی ڕۆژهەلاّتدا لەهەندێك گوندی سەقز کەماڵەیی هەیە کە ژمارەیان حەوت گوندە .

کەماڵەییەکان بەو پێیەی کە تیرەیەکی بێوەیی و لەخواترس بوون، هەمیشە جێگەی ڕێزو ستایش بوون لەنێو هۆزەکانی تردا، کەریم فەتاح بەگ دەڵێت خەڵکانێکی دڵساف و بێگەردن و تیرەکانی تر ئەدەبیان لێکردوون, بەلاّم ئەمە ناگاتە ئەوەی هەرگیز تووشی شەڕ نەهاتبن لەگەڵ هۆزەکانی دەوروبەردا [٤٠١].کەماڵەیی ئارامی و سەربەخۆیەکی زۆری هەبووە لەکاتی دەسەلاّتی دا ناوبانگیان بەئازایەتی و ڕۆحسوکی دەرکردووە لەناو خێڵە کوردیەکاندا، ئەمانە نزیکەی پێشوتر پێنج سەد خێزانێك بوون زۆر حەزیان لە وازهێنانی ژیانی کۆچێرێتی بووە و دانیشتنی دێهات و کشتوکاڵیان پێ خۆش بووە، سەرۆکی گشتیان (فاتیحی محەمەدکەریم، دەروێش سەمین) بووە[٤٠٢].ئەم تیرە دووسەد کۆچەریان لەسەردەمی کەریم فەتاح بەگ هەبوو، وسەد ماڵ دانیشتویان هەبوو، سی ماڵیان لەناحیەی شێروانە بوو لەگوندی گۆبان، لەقەرەچیل و دوومیلان کەماڵەیی هەبوون، هەندێکی تریان لە (قلرخ، خەرجانە، جۆلان) بوون لەناحیەی خورماڵ و تانجەرۆیش کەماڵەیی هەبوون. بەلاّم لەبارەی نوێژو ڕۆژوو ئەمانە زۆر قایمن

---

[٤٠١] خوسرەو جاف ،س ، پ ،ل ٣٠٠ — ٣٢٩ .

[٤٠٢] شوکریە کریم سەعید: س، پ ،ل ٢٥٦.

بـەلأم خورافاتیـان زۆره[٤٠٣] . محەمـەد ئـەمین زەکـی بـەگ دەڵێـت: ئـەم عەشـیرەتە لەناوخۆیاندا یەکگرتوون لەشەری دەرەوەدا هەموویارمەتی یەکتری ئەکـەن، ئـەم هـۆزە هەموویان سونە مەزهەبن[٤٠٤] . کەماڵەیی لەگەرمیان چەند دێهات و وردە دێیەکی هەیـە (گۆبان، نازێی حەمەی فەتاح، نازێی سەمین، قەرەچێل، ئـاوایی حـاجی عـارف، ئـاوایی حاجی قـازیی، قەڵبـەزەی کەماڵـەیی، گـەرمکی عـەلی مـەحمود، کـانی چـایلە، میلانـی سەرو، میلانی خواروو، گۆمە زەرد، ئاوای حاجی حسین،) هەروەها لەقـەزایی کـەلار بـە تایبەتی لەکەلاری کۆن ڕێژەیەکی بەرچاوله خێزانی کەماڵەیی نیشتەجێن[٤٠٥] .ئەم هـۆزە بەشی زۆریـان لەگـەرمیان دەژیـن، ئەوبەشـە کەمـەیان هاتونەنـە شـارەزوور، لەگونـدی (قلرخی سەرو، قلرخی خواروو، بێستان سوری سەروو) نیشتەجێن[٤٠٦] .

## تیرەی رۆغزادیی :

رۆغزادیی تیرەیەکی گـەورەن لـەناو جـاف مـورادی، بـەوە ناسـراون تیرەیـەکی ئـازاو لێهاتوون، دەربارەی ناوەکەیان زۆربەیان بڕوایان وایە باپیرەگەورەیان کەسێك بووە بــەناوی (زاد) لــەڕۆخی ســیروان لــەدایك بــووە، هــەر لەبــەر ئەوەیشــە نــاوی ڕۆغزادیەکانیان لێ نراوە، هەندێکیشیان دەڵێن دایکی باپیرەگەورەیان ناوی (رۆحی) بووە بەکوڕەکەی وتراوە (رۆحیزاد) پاشان ناوەکەی گۆڕانی بەسەردا هـاتووە بـووە بە (ڕۆخیزاد، رۆغزاد). یان هەندێك دەڵێن دایە گەورەیان ژنێـك بـووە بـەناوی ڕۆغـە لەژێر دەوار منداڵی بووە، کاتێك هەواڵیان داوە ووتیانە ڕۆغە زا بەپێی کات ناوەکەی دەبێت بەڕۆغزادی. ئەم تیرەیە ماوەیەکی دوورو درێـژ لەناوچـەی (بلـەبزان) ژیـاون،

---

[٤٠٣] کریم فتاح بەگ: س، پ ،ل ١٣٥–١٣٦ .

[٤٠٤] محەمەدئەمین زەکی بەگ : س ، پ ، ل٢٥٣

[٤٠٥] سالّح هاروونی: س ، پ ، ل١٣٣

[٤٠٦] حەکیم مەلاسالّەح: س ، پ ، ل١٤٣.

بەکۆچەرێتی ژیاون، هەوارگەی تایبەتی خۆیان لەگەرمیان و کوێستان هەبووە، کۆزی زستانەیان لە (سەرکەلی کەوەڕێ و مازخ)دا بووە لەخۆرهەلاتی ئاوەسپی، بۆ کۆچی هاوینەش لە(پەیکولێ و گەورەقەلا)وە هاتوونەتە گرێزە لەشارەزوور، لەوێشەوە بۆ (کەولوس، نالپارێز، دەشتی قزلجە) و ناوچەی (شلێر) ڕۆیشتوون، پاشان ڕۆیشتوونە هەوارگەکانیان لەنێوان (سەقز و دیواندەرە) لەکوردستانی ئێران، لەکاتی کۆچەریدا (تەرخانی) یان لەگەلدا بووە کەیەکێکە لەتیرەکانی ئێلی مورادی.
ڕۆغزادیەکان لەچەند بەرەباب و بنەمالەیەك پێك دێت، هەموو بنەمالەکان سەرۆکایەتی حەمەجانیەکانیان بۆ تیرەکەیان قبولکردووە، پاش دەست پێکردنیان بە نیشتەجێ بوون لەناوچەکانی (شارەزوور، قەرەداخ، گەرمیان، ناوخوان) زیاتر لە (٧٦) گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە. تیرەی ڕۆغزایی چەندین کەسایەتی دیار و خاوەن پایەی کۆمەلایەتییان تێدا هەلکەوتووە، کە هەم لەناو تیرەکانی دەوربەریاندا ڕێزیان لێگیراوەو لەچارەسەر کردنی کۆمەلایەتی و خێلەکیەکانی ناوچەکانیاندا ڕۆلی دیار و کاریگەرییان گێڕاوە لەوانە:( ڕۆستەمی محەمەد، ئەحمەدی ڕۆستەم، خەلیفە یونس، سلێمان خان، محەمەد سدیق خان، لالە سەرحەرد خەلیفە یونس، حاجی حەمەجان، حەمەسالەحی عەزیزی سەیمراد، مەلا حەسەن، حاجی سل ێمان، تۆفیق شاوەیس، فەتاحی کامەران، حەمەی تۆفیق، ڕۆبیتەن کاکەخان).
ڕۆغزاییەکان هەر وەك تیرەکانی تری جاف لەفۆلکلۆری بینراو و بیستراوەوە دەولەمەندن، هەمیشە شانازیان بەکولتوری کۆچەریەتی و ژیانی ڕەسەنی جافگەرییەوە کردووە[٤٠٧]. ئەم تیرەیە لەناوچەکانی شارەزوور، زەرایەن، سەرقەلا، قلاسور، دەوروبەری قەرەداغ، موان، قالی جۆ، شیروانە، سەنگاو، تەپەگەڕووس، بەردەکەڕ نیشتەجێن. بەشێکیان لەکوردستانی ئێرانن لەسنوری (سنە، سەقز، ناوخوان) دان .
ئەم تیرەیە لەدوای شەڕی خوێناوی نێوان (میرنیشنی ئەردولان، جاف) کە لەو شەڕەدا سەرۆکی (جاف) کوژراوە، چەندین تیرەی (جاف) بەسەرۆکایەتی (زاهیر بەگی

---

٤٠٧ ئەیوب ڕۆستەم : هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ، ل٥٢ .

جاف) جوانرۆ بەجێدەهێڵن ودێن بۆ ژێر دەسەلاتی میرنیشنی (بابان)، رۆغزادیەکان یەکێك بوون لەو تیرانە لەگەڵ (زاهیر بەگ) جوانڕۆیان جێهێشت، تیرەی ڕۆغزادی یەکێکە لەتیرە ئازا وچاونەترس و پەلاماردەری ناو هۆزی جاف و لەتەواوی ڕوودای شەڕەکانی جافدا هەمیشە جێگەی دەستیان دیار بووە[٤٠٨] . رۆغزادی لەمێژووی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردا ڕۆڵێکی گرنگیان بینیووە، چەندین ڕۆڵەی قارەمانیان فیدای ئەو ڕێگایە کردووە، زۆرێك لەخەڵکی دێهاتەکانیان بەرشالأی ئەنفال کەوتن[٤٠٩].بریتین لەهەشت بەرەبابی سەرەکی (حەمەجانی، وەیس وەیس، شاوەیس، سمایلی، سەرحەدی، زۆراو، رۆغزاد، قادر وەیس) ئەو هەشت بەرەبابە دابەش بووەتە سەر چەندین گرووپ و بنەماڵە جۆراو جۆرەکان کەتێکرا لەبنەچەدا هەر هەموویان خزم و خۆێشی یەکترن بەتیرەی رۆغزادی ناو دەبرێن[٤١٠] .

کۆمەڵی یەکەم: حەمەجانی جاران ئەمانە گەریاویان سێ سەد ماڵ دەبوو، دانیشتویان سەد ماڵ بووە، کۆچەری و دانیشتوانیان بەگشتی ئامۆزاو برازاو برای یەکترن لەڕووی ژمارەوە لەبەرەبابەکانی تری تیرەی رۆغزایی زیاترن و دوای ئەوەی دەستیان لە گەرمیان و کوێستان هەلگرت لەم دێهاتانەی خوارەوە نیشتەجێ بوون: (زەڕایەن، کوڕەی گەورە، ناحیەی تانجەرۆ، سەیان، مێشاو، سپی کانی، سیرسان، قەزای پێنجوێن، هەردەی مارفی سەییە، سەرکەلەکان، ناحیەی پێواز، خەلۆە، قرژالە، خەلوەکان، تولەبی، کولەجۆ، سێخڕان، هۆمەرمل، چوارشاخ لەناحیەی سەرقەلاّ).

لەئێستادا زیاترن لەهەزار ماڵ (ئەحمەدی ڕۆستەم، حاجی محەمەدی مەحمود، حاجی عەزیزی ڕەشید) برا گەورەیان بووە، مەلاحەسەنی ئەحمەد رۆستەم براگەورەی ئەم

---

[٤٠٨] خوسرەو جاف: س ، پ ،ل١٣٦–١٣٧

[٤٠٩] حەسەن جاف: ئەکاونتی ئێل بەگی جاف .

[٤١٠] سالّح هارونی : س ، پ ، ل ١٢٤

بەرەبابە بوو تاوەفاتی لەم چەندساڵەی کۆتایی لەناو خەڵکدا قسەی بیستراو و ڕێزلێگیراو بوو[٤١١] .

کۆمەڵی دووەم: سەرحەدی ئەمانە جاران سەد ماڵ ئەبن، کۆچەریان نەبوو هەموو دانیشتوو بوون، حەفتا ماڵیان لای (حەلیفە یونس) و سی ماڵیان لەقولیجانی سەرحەد بوو، گەورەی ئەمانە خەلیفە یونس بوو، ئەم سەد ماڵە گشتیان براو ئامۆزای یەکترین، لەم دێهاتانە خوارەوە نیشتەجێن لەشارەزوور گوندی (دسکەرە، دێی بالول) لە گەرمیانیش لە(قولیجانی سەرحەو) نیشتەجێن، ئێستا سەرحەدی خەلیفە یونس سەرۆکی ئەم تیرەیە .

کۆمەڵی سێیەم: رۆغزادە ئەمانە جاران سەدماڵ کۆچەرییان هەبوو، دانیشتوویان سەدو پەنجا ماڵ دەبوو، سەرۆکیان (فاتیحی کامەران) بووە لەئێستادا ژمارەی ئەم بەرەبابە دەگاتە شەش سەد خێزان، لەشارەزوور لە(زێڕین جو)دا نیشتەجێن، لەپێواز و (کوردەمیر) و سەنگاو لە(مەسۆیی بەرکەچ، مەسۆیی حەمەیی فەرەج، مەسۆیی ئەحمەد ڕەحیم) لەسەرقەلا (هەوارە قوڵە، سماق، تەپەسپی، بەرودار،سەرقەلا ، تەپەگەرووس)نیشتەجین ڕیش سپیان موسایی عیسایی خەسرەو بووە، ئێستا رۆستەمی حاجی ئەحمەدە لەکەسایەتیە دیارەکانیان (عوسمان ئەمین، تۆفیق شاوەیس)[٤١٢] .

کۆمەڵی چوارەم: سمایل ئەمانە جاران کۆچەریان حەفتا ماڵ دەبوو، دانیشتوویان هەشتا ماڵ بوو گەورەی ئەمانە جاران (ساڵەحی کاکەخان، رۆستەمی حەمەی فتاح، عبدالکریمی رۆبیتەن) بوو[٤١٣] . ئێستا حەوت سەدو پەنجا خێزان دەبن، لەشارەزوور لەم دێهاتانەی خوارەوە نیشتەجێن: (بنگردی موان، محمود خانی خوارەوە، محمود خانی سەرەوە) لەدەڤەری قەردەداغدا (بلکان، دووکان، دوکەروو، کوڵەجۆ، چالکە، مچە کوێرەی گەورە) لەناوچەی سەرقەلادا (هەوارەڕەقە، کاکە برا، ژالان، کونە کۆتر،

---

٤١١ خسرەو جاف: س ، پ ، ل١٣٨

٤١٢ خسرەو جاف: هـ، س ، پ ، ل١٤٠

٤١٣ کەریم فەتاح بەگ :س ، پ ، ل١٣٢

پەلەوشـك، تـەپی کـەرەم، مـوانی مـرزا) براگـەورەیان ڕوبیتـەنی ڕۆسـتەمی فەتاحـە، حەمەساڵەح عەبدولاَ لەگەرمیان، حەمەی فەتاح، ئەیوب فەتاح یەکێکی تـری دەمڕاسـتی ئەم بەرە بابەیە(٤١٤) .

کۆمەڵی پێنجەم: وەیس وەیس ئەم بەرەبابەی تیرەی ڕۆغـزای جـاران لەچـوار سـەد ماڵ کەمتر بوون، لەم دێهاتانـە نیشـتەجێ بـوون لەشـارەزوور: (مـوانی حەسـەن قـادر، موانە کۆن، کانی میل) لەسـەرقەلاَ: (میـل قاسـم، هـەوارە بـەرزە) (ئەحمـەدئاوا، کـانی هەنجی، کانی هەمزە، سێتەلان) لەتانجەرۆ: بەڵخە لەقەرەداخ. سەرخێڵی ئەمانە جـاران قادر شێخ ئەلی وەیس بووە، دواتر مـەلا عـەزیز کـاکی و حەمەسـاڵەح حـاجی سـلێمان، ئێستا چەندکەسێك لەناو ئەم بەرە بابەدا قسە بیسراون وەك: نەجمەدین مەلا محەمـەد، مامۆستا عەزیز، حەمەساڵەحی حاجی سلێمان .

کۆمەڵی شەشەم: شـاوەیس ئـەم بەرەبابەیـە تێکـڕا شـەش سـەد خێـزان دەبـن لـەم گوندانە نیشتەجێن لەشارەزوور: (موانە کۆن، سیتەلانی خـواروو، ئاوەکەڵـە) لەناحیـەی پیواز (تەپە گەڕوس، هومەرئاغاجان، قەلاَی تەپەگەرووس، براوگـەل، دەرواری سـەروو، کەلەکـەران، چـیا چـەرموو، تورەجـار، کـوردەمیری حەمـەی سـلێمان) لەشەسـتەکاندا حەمەی تۆفیقی حەمەی شاوەیس دەم سپیان بـوو، ئێسـتا ڕەسـوڵی حەمـەی تۆفیـق و حەمەساڵەحی حاجی نەسرەدین دەم سپی ئەم بەرەبابەیە .

کۆمەڵی حەوتەم: زۆراو (شەڕە) سەرجەم لەدووسەد خێزان زیـاترن، لـەم جێگانـەدا نیشــتەجێن: لەدەڤــەری قــەرەداخ (کــەلوش، مەســۆیی، گۆمــەزەرد) لەدەربەنــدیخان (دیوانە، چەمەرگە، کانی سارد) دەڤەری سەنگاو (بانی مورد) نیشتەجێن، براگـەورەیان جاران حاجی عەبدولاَی فەقێ بووە(٤١٥) .

کۆمەڵی هەشتەم: قادر وەیسی ئـەم بەرەبابـە لەدووسـەد خێـزان کـەم تـرن نـین، لـەم گوندانـە دەژیـن: لەشـارەزوور (کـاژاو) لـەپێواز (خاڵەمـەرد، زەینـەڵ، رازیانـە، سـەری

---

[٤١٤] خسرەو جاف : س ، پ ، ل١٣٩

[٤١٥] خسرەو جاف: س ، پ ،ل١٣٨–١٣٩

باینجان) براگەورەی ئەم ئێستایان قادری حاجی حەمەساڵەحی حاجی قادرە، ئەم بەرەبابە لەسەر حەمەجانیەکان دەژمێردرێن(٤١٦) .




مەلا حەسەن ئەحمەد ڕۆستەم - ئەحمەد ڕۆستەم ڕۆغزایی - خەلیفە یونس ڕۆغزای - سلێمان خانی ڕۆغزایی

## تیرەی تەرخانی :

ئەگەر بەگوێرەی قۆناغەکانی مێژوو لێی بدوێن، یەکێکن لەتیرە تازە و سەربەخۆکانی ناو هۆزی جاف، ئەم تیرە لەئێستادا تیرەیەکی سەربەخۆ و دیاری ناو هۆزی جافن، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەتیرەی (ڕۆغزادی) جیا بوونەتەوە(٤١٧) .

سەبارەت بەناوەکەیان لە(تروخانی) یەوە هاتووە، کەبەمانای ئێش و ئازار دێت بەدەست سەرانەوە کەیەکێکە لەزاراوەکانی مەغۆل. ئەم تیرەیە لەساڵی (١٩٢٢) زدا نزیکەی پێنج سەدماڵێکیان کۆچەر بوون(٤١٨) . دەبن بەدوو لقەوە (بەشی ئەلك، بەشی قاچۆڵ) کۆچەریان جاران سێ سەد ماڵ دەبوو، دانیشتوویان سەدو پەنجا ماڵ بووە،

---

[٤١٦] خسرەو جاف : ه، س ، پ ، ل١٦٣ .

[٤١٧] خسرەو جاف : ه، س ، پ ، ل ١٤٠

[٤١٨] شوکریە کریم سەعید : س، پ ،ل٢٤٣.

دانیشتوەکانیان بەزۆری لەناحیەی شێروانە (کەلار)ی ئێستا نیشتەجێ بووبوون[419].
هەروەها مەردۆخی باس لەنیشتەجێ بوونی تەرخانی دەکات لەکەنارەکانی ڕەواندز[420].

ئێستا بەشێوەیەکی گشتی تیرەی تەرخانی لەگەرمیان لەگوندەکانی: (ملەسورە، زەردەکان، حەسیرە، زەڕین، تورانەکان، تەپەسەوز،کانی ماران، درۆزنە، تەیمانە، هەوارەبەرزە، زاوت، چەمی شۆر، شێخ تەویل، بێستانە،بەکربایەف، پیازەجاڕ، حەسیرە) لە(دەربەندیخان، کەلار، ڕزگاری) ژمارەیەکی زۆر خێزانی تەرخانی دەبینرین. لەشارەزور لەگوندەکانی: (محمودخانی خوارو، ئاوایی حەمەعزیز، کانی کەوەیی چووخ، داری قەلأن، یەخشی، زەلەڕەش، کانی ئاسکان، ناوتاق، کانی توو، کانیی هەمزە) نیشتەجێن. تەرخانی لەگەڵ ڕۆغزایی دانیشتوانی گوندی (قالیجۆ) پێك دەهێنن ، لە(هەڵەبجەی تازە، زەڕایەن) ژمارەیەکی بەرچاوخێزانی تەرخانی دەبینرێن[421].لەدۆڵی قەرەداغدا لەگوندەکانی (هۆمەر قەلآ، سەروچاوە، بەڵخە، ئاوەسپی، عەلی یاوە، دیوانە) نیشتەجێن[422].جێگایی ئەسڵی ئەم تیرەی جاف ناوچەی (بلە بیسان) بووە، لەجوانرۆی ئێران[423]. ئەم تیرەیە لەسەردەمی حەمەپاشای جافەوە یەکێك بوون لەو تیرانەی هەمیشە پشتی پاشاکانی جافیان گرتووە، دەستە ڕاستی پاشاو گەورەکانی جاف بوون، پشکی شێریان هەبووە لەبەرگری لەخاك و وڵات، لەشالأوی ئەنفال دا تەرخانی زۆرترین کەسیان لێ ئەنفال کراوە[424]. کۆمەڵی ئەلکی: ئەم بنەماڵەیە بەکاکڵەی تیرەی تەرخانی دەژمێرێت، سەرۆکایەتی ئەم تیرەیە هەردەم بەدەست نەوەی (ئەلك)ەوە بووە و (حەمەی شاسوار، عەزیز شاسوار) سەرۆکایەتی کردوون، پاشان (حاجی ڕەفعت حەمەحسن) کەپیاوێکی خانەدان و هێمن بووە جڵەوی ئەم

---

[419] کریم فتاح بەگ : س، پ ،ل ١٣٢–١٣٣.

[420] محەمەد مەردۆخی : س ، پ ، ل٩٢

[421] سالح هارونی : س ، پ ، ل١٢٧

[422] خسرەوجاف : س ، پ ، ١٦٦

[423] محمود عزیزحەسەن : س ، پ ، ل١٩

[424] مینەجاف: تۆڕی کۆمەلأیەتی فەیس بووك، ئەکاونتی مینەجاف، ٢٠١٧.

تیرەیە گرتــە دەســت، لەســاڵی (١٩٨٨) ز بــەخۆی وخێـزان و کەسـوکاری و بەشـێك لـە تیرەکەی کەبەر پەلاماری شالأوی ئـەنفال کـەوتن، زەرەرو زیـانێکی گیـانی قـورس بـەر خانــەوادەی کــەوت، خۆیشــی تــالأوی زینــدانی (نوگرەســەلان)ی چەشــت، پاشــان بــەر لێبوردن کەوت و گەڕایەوە ولأتی وێران کراو لەگەڵ خۆشەویستە شـوێن بزرکراوەکانیـدا دابرانێکی هەتاهەتای کەوتە نێوانیانــەوە هەربــەو حەسـرەتەوە کۆچـی دوای کـرد[٤٢٥] . لەئێستادا ئەم تیرەیە لەلایەن بەکرحاجی ڕەفعـەت و دارا حەمەڕەشـید حەمـە حەسـەن بەڕێوەدەبرێت .






سوارە حاجی دارا ڕشید - حاجی ڕەسوڵ تەرخانی- حاجی رەفعەت حەمەحەسەن — بەکر حاجی ڕەفعەت

---

٤٢٥ ساڵح هارونی: س ، پ ، ل ١٢٥–١٢٦

## تیرەی عەمەڵەیی :

تیرەیەکی ڕەسەنی هۆزی جافن هەر لەمێژەوە بەهۆی نزیك بوونیان لەمیرەکانی جاف لەڕووی دڵسۆزیانەوە زۆرینەی ئەرکە ئیداری و جێبەجێکردنی بڕیارەکانی سەرۆکی هۆزی جاف بەئەمان سپێردراوە جێبەجێکەرێکی چالاك و بەئەمەك بوون.

جێگای کۆچ و هەواریان بەهۆی نزیکیان لەسەرۆکی خێڵەوە ژمارەیەکی کەمیان گەرمیان و کوێستانیان کردووە. بەبۆچوونی زمناکۆ حوسێن فەتاح ناو ئەم تیرەیە لە (ئاماله یا ئاوماڵەوە) هاتووە بەهۆی باشی لەدراوسێتی و هاوماڵیدا، لەئێستادا زیاتر لە هەزار و پێنج سەد خێزان دەبن و لە (کەلار، کەلار کۆن، کۆکز، تازەدێ، حەسەن محە، دەکەکان، خانەقین، جەلەولا، دەربەندیخان، چەمەرگە، فەقێ جنە، ناحیەی سیروان، هەڵەبجەی شەهید) نیشتەجێن. ئەم تیرەیە بۆ کۆنترۆڵکردنی ناو هۆزی جاف و قایم و قۆڵکردنی کاروباری ناو هۆز زۆرتر لەسەرانی جافەوە نزیك بوون، هەمیشە ڕیش سپیانی ئەم تیرەیە بەلای ئومەرایی جافەوە قسەیان بیستراو بووە، لەکۆنەوە ئەم تیرەیە کەمیان وەك خێڵە کۆچەریەکانی ناو جاف گەرمیان و کوێستانیان کردووە، زۆرتر نیشتەجێ بوون لەنزیك ئومەرایی جاف .

وەك هێزێکی سوارەی چەکدار پەیوەست ئامادەبوون، بەڵام ئەوانەی کۆچەر بوون لەژێر فەرمانی سەرخێڵەکەیان (حاجی محەمەدی حاجی قادری سلێمان) دا گەرمیان کوێستانیان دەکرد[٤٢٦]. لەهۆزە کۆچەریەکانی ناوچەی جوانڕۆ بوون، لەبەرئەوەی کاروباری بەگزادەکانی جافیان هەڵسوڕاندوە ناونراون عەمەڵە، (عەمەڵە و ئەتباع) دوو وشەی عەرەبین لەدەربارەی میرو بەگزادەکاندا بۆ دوو چین خەڵك بەکاربراون، ئەوانەیان کە هاتوون بەم دیودا بەشێکیان لەگەرمیان لەناوچەی کفری نیشتەجێ بوون و بەشێکی کەمیشیان لەشارەزوردا لەگوندی (جانجان) دا جێگربوون و هەندێکیشیان لە (کاگردەڵ) هەیە[٤٢٧]. عەمەڵە لەسێ بەرەباب پێکهاتووە بریتیە لە(سوارە، ناوخاس،

---

[٤٢٦] خسرەوجاف : س ، پ ، ل٣٦٧.

[٤٢٧] حکیم مەلاساڵەح : س ، پ ، ل١٤٣.

هۆزی حەمە، گردە لەخانەقین، جەلەولا، دەکەکان) ئەم کۆمەڵانە سێ سەدو پەنجا ماڵ ئەبوون جاران، کۆچەریان زۆرکەم بووە، زۆرینەیان زوو نیشتەجێ بووبوون، لەکەلار زیاتر لەشەست ماڵیان هەبووە، کۆچەریان حەفتا ماڵ بووە، لەکۆکس پەنجا ماڵ زیاتریان هەبووە، ٢٠ماڵیان لەتازەدێ و قولەسوتاو بووە، باقی تریان لەقەزای هەڵەبجە بەبلاوی نیشتەجێ بووبوون، سوارەو پیادەی تفەنگداریان لەدانیشتووان و کۆچەرییان سەدو پەنجا زیاتریان هەبووە[٤٢٨]. جاران حمدئەمین و فەتاح ڕۆستەم سەرۆکی عەمەڵە بووە، پاشان حوسێن فەتاح بوو بەسەرۆکی تیرەکە، ئەم تیرەیە بوو بەپشتماڵەی بەگزادە، تا بەرپابوونی شۆڕشی (١٤ی تەموزی ١٩٥٨ز) لەعێراقدا ڕوخانی ڕژێمی پاشایەتی، زۆربەی پیاوانی ئەم تیرەیە لەدەوری بەگزادەکانی جاف بوون، بەتایبەتی سەرۆکی ئێلی جاف (داود بەگی فەتاح بەگ) کە لەوسەردەمەدا لەکەلار دادەنیشت، ئێساتش عەمەڵە ڕیش سپی خۆی هەیە، بەزۆری لەکەلار نیشتەجێن[٤٢٩] . ئێستا زمناکۆ حوسێن فەتاح براگەورەی ئەم تیرەیە .






حوسێن فەتاح ڕۆستەم – کەریم مەحمود قادر – کوێخا مەحمود محەمەد – زمناکۆ حوسێن فەتاح

[٤٢٨] کریم فتاح بەگ : س، پ ، ل١٣٧ .

[٤٢٩] ساڵح هارونی : س ، پ ، ل١٣٢ .

## تیرەی نەورۆڵی :

نەورۆڵی یەکێکە لەتیرە گەورەو ناسراوەکانی جاڤی مورادی، لەدەوروبەری شاری هەڵەبجەی شەهید و ڕووباری سیروان نیشتەجێن، لەساڵی ١٩٠٠ تا ساڵی ١٩٣٥زاینی دەسەڵاتدارترین هۆزی ناوچەی هەڵەبجە بوون، نەورۆڵیەکان کەسانی جەنگاوەر و لێهاتوو و نیشتمان پەروەر بوون لەشەڕی نێوان ئینگلیز و شێخ مەحمود نەورۆڵی کەعەبدولاّ محەمەد خواکەرەم سەرۆکایەتی کردون، لەگەڵ یەزدان بەخشی کە مەحمود محەمەد سان ئەحمەد سەرۆکایەتی کردوون، تەیارەیەکی ئینگلیزیان خستۆتە خوارەوە [٤٣٠]. ئەمانە تایفەیەکی گەورە بوون لەناو جاف دا، هەموویان هەزار ماڵ ئەبوون جاران، پێشتر ئەمانە کۆچەری بوون، بەیەکەمین تیرەی جاف دادەنرێن گەرمیان و کوێستانی تەرك کردبێت و لەناوچەی خۆیان نیشتەجێ بووبن، جێگایی نەورۆڵیی دێهاتەکانی سەر بەناوەندی قەزای هەڵەبجەیەی شەهیدن، ئەم تایفەیە هەموویان سێ سەد سوارو حەوت سەد پیادەی تفەنگداریان بووە جاران[٤٣١]. لەبنەڕەتدا خەڵکی نەورۆڵی بەری جوانرۆن کە (نوروەلی) ئاوەدانی کردۆتەوە و وشەی نەورۆڵی لەنوروەلی وەرگیراوە، نور واتا(تیشك، روناکی) وەلیش واتا (پیاو چاکی کەراماتدار) لەدوو دێ نزیکی کرماشاندا هەندێ نەورۆڵی هەیە. لەدەورو بەری هەڵەبجە ئەبن بە دووبەشەوە :

بەشی یەکەم: نەورۆڵی پارچە لەو ناوچەیەدا دەژین کەبەناوی تیرەکەیان ناونراوە ناوچەی (نەورۆڵی) ئەو ناوچەیە هەر لەگوندی هەسەن ئاواوە دەست پێ دەکات هەتا گوندی (نێرگسەجاڕ) کە بریتیە لەم دێهاتانە (هانە سوورە، تریفە، تەوەنەوەل، هەسەن ئاوا، سەراو، هانەی ژاڵە، کەوتە، نوورە، گونە، میراولی، چرۆستان، تریفە، پریسی سەروو، پریسی خواروو، کانی توو، بیەنگە) .

بەشی دووەم: نەورۆڵی دەشت لەم دێهاتانە نیشتەجێن (پریسی خواروو، بەکراوە، زەمەقی خواروو، تەپەکوڕە، خێڵی حەمە، گۆمەلار، دێ کۆن، بەشارەتی سەروو،

---

[٤٣٠] لەدوای وردبینی لەئەکاونتی میژووی عەشیرەتی جاف وەرگیراوە .

[٤٣١] سالح هارونی: س ، پ ، ل١٤٤–١٤٥

بەشارەتی خـواروو، شەشـکی سـەروو، شەشـکی خـواروو، قشـلاخەڕووتە، هەسـە ئـاوا) بەرلـەوەی ئـەمان بێنـە ناوچـەکە هـەردوو (بەشـارەت، کەوتـە، زەمـەقی، پرسـی سەرووگونە) ئاوەدان بوون، هەروەها لەهەردوو بەشارتدا (یاروەیسی) و لەهەسەن ئاوادا (کـەلهوڕ) هـەن[٤٣٢]. نەوڕۆلێـەکان زۆریـان پێیـان وایـە نـاوی نـەورۆلی لـەناوی دوو بـرا هاتووە بەناوی (نەورۆلّ) و (بەورۆلّ) لەناوچەی (باینگان)ی ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان دوو گوندیان بەناوی خۆیـان ئاوەدانکردۆتـەوە، پـاش کۆچـی (زاهیربـەگ)ی سـەرۆکی ئێلـی جـاف هاوتوونەتـە ئەمـدیوو. کـاتێ (ئەدمۆنـدز)ی ئەفسـەری سیاسـی بریتانیـا، لەگەڕانەوەیـدا لەهەڵەبجـەوە بەناوچـەی (نـەورۆلی) گـوزەری کـردووە و چـووەتە دێـی (گوندە) و لەسەر قەلاکەی ڕاوەستاوە، دیمەنی ناوچەکە زۆر سـەرنجی ڕاکێشـاوە بۆیـە بە دۆلی خۆشبەختان ناوی بردووە وتوویەتی ئەگەر چی لەکوردستاندا ناوچـەی جـوانتر و دلڕفێنتر زۆرن، بەلام لـەماوەی دەسـالی دورکەوتنـەوەی لـەولاتی خـۆم ئەمـە یەکـەم جارە لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست دا شوێنێك ببینم لە(بریتانیا) بچێت .

ژمارەی خێزانەکانی (نەورۆلی) لەسالی (١٩٢٢) بریتی بـوون لەحـەوت سـەد خێـزان، هێزی چەکداریان سـێ سـەد پیـادە وسـەد و پـەنجا سـوار بـوون، سەرچـاوەی بـژێویان باخـداری و کشـتوکالّ و ئاژەلّـداری بـوو، نەورۆلێـەکان جگـە لـەدێهات و ناوچـەکانیان ژمارەیەکی زۆریان لە(هەلّەبجەی شەهید، خورمالّ، ناحیەی سـیروان، هەلّەبجـەی تـازە) نیشتەجێن. سەبارەت بەسەرۆکایەتی ئـەم تـیرە لەکۆنـدا (عەبـدولا محەمـەد خواکـەرم، عـەلی محەمـەد مـارف، محەمـەد حسـین عـەزیزی ئەولمحەمـەدو چـەن کەسـێکی تـر) سەرۆکایەتی کردوون، لەم سالانەی دوایی (میرزاحەسەن) سەرۆکایەتی دەکرد، لـەدوای کۆچـی دوایـی ئـەویش مـلازم (سـیروان نـەورۆلی) جێگـایی گرتـەوە[٤٣٣]. نەورۆلییـەکان بەردەوام گیانی تەبایی بوونیان تیا هـەبووە و خۆیـان بـەدوور گرتـووە لەهـەر ئـاژاوە و دووبەرەکی و خوێنڕشتن لەگەلّ هۆزەکانی تردا، لەکاتێدا لەتواناو ژمارە و خۆیان بەکەم

---

[٤٣٢] کریم فتاح بەگ: س، پ ، ل١٣٩ .

[٤٣٣] حکیم مەلاسالەح: س ، پ ، ل١٣٩–١٤٠.

نەزانیووە، بەڵکو لەپێناوی پاراستنی هێمنی و گیانی دانیشتوانی ناوچەکەدا بووە، ئەگەر کێشەیەکیش هەبووبێت لەگەڵ هەموولایەکدا هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەری بەپەلەیان داوە، زۆرجار ڕۆڵی ناوبژیوانیشیان گێڕاوە بۆکۆتایی هێنان بەشەڕ و دوژمنایەتی دوو بنەماڵە یان دوو هۆز، چونکە پیاوی قسەزان و خاوەن کەسایەتی بەتواناى تیادا هەڵکەوتووە وەك (تۆفیق وەهبی بەگ، مەلا ساڵەح پرسی، ڕەسوڵ مەستی، مەلا عەبدولڕەحیم چروستانی، مەلا عەبدولعەزیز پریس، مەلا عەبدوڵڵا چروستانی، ئەحمەد پرسی، مەلا محەمەدی چروستانی، ساڵەح هەژار، عەبدوڵڵا حەسەن، محەمەدی نەورۆڵی، بنەماڵەی محەمەدی حەمە میرزا هتد...)[٤٣٤] .

## تیرەی باشکی :

تیرەیەکی سەربەخۆی هۆزی جافن، ناوی ئەم تیرەیە لەوشەی (باش)ەوە هاتووە، (باش–چاك) و دیارە باشەکە بووە بە(باشکی) یانی ئەو کەسەی کاری نەشیاوی لێ ناوەشێتەوە، هەندێك لایان وایە ناوی (باشکی) لە(باشوکی)یەوە وەرگیراوە، هەردوو وشەکەش دەگەڕێتەوە سەر وشەی (باش) ئەم تیرەیە ناسراون بەدڵپاك و دڵساف و دوورن لەدرۆ و دەلەسە و لەبۆچوون و قەناعەتی خۆیاندا ڕاستن، ڕەنگە وتەی بەناوبانگی(جاڤ سینە ساف) لەتیرەی باشکییەوە وەرگیرابێت، ئەم تیرەیە بەئازایەتی ناسراون، بە تایبەتی لەشەڕە بەردا هیچ تیرەیەکی تری جاف پێیان ناگات، خڕك وەشێنی ناو باشکی بەناوبانگە جارەوبار بەردەقانێ شیان بەکار بردووە، بەردی بەردەقانێی باشکی بەر هەر کەسێك کەوتبێت ساغ دەرنەچووە، ژنانی باشکی ئەوانیش لەهەندێك شەڕدا بەشدارییان دەکرد و تەنها تەماشاکەر نەبوونە ئەمە جاران دیارە

---

[٤٣٤] خسرەوجاف: س ، پ ، ل ٣٣٤ .

ئێستاش دنیا بۆ هەمووان گۆڕاوە لەناو ئەم تیرەیەدا ئەمڕۆ چەندین هەڵگری بڕوانامـەی زانکـۆی تیادایـە[٤٣٥]. ئـەم تـیرە لـەکتێبی (شـەرەفنامە)دا ناویـان هـاتووە، ئەمانـە دانیشتویان زۆر کەم بوو، زۆرینەیان کۆچەری بوون، بەشیوازی تایبـەت بـەخۆیان قسـە دەکــەن، چــل ســوار و چــل پیادەیــان هــەبوو، گــەورەیان (خەلیفــە حەســەن، محمودیاســین)بووە[٤٣٦] . مــەردۆخی دەڵێــت: باشــکی لەناوچــەکانی ڕەوانســەری سەربەسنە بەشێکیان نیشتەجێن[٤٣٧] . ئێسـتا ئـەم تیرەیـە لەگـەرمیان لەگونـدەکانی: گوندی دووخڕان برا گەورەیان قاوری ئەحل بـووە لەبنەماڵـەی یاسـین، گونـدی بۆوەکـە براگـەورەیان مەجیـد حەمـەلاو و حەمەخورشـید حەمـەلاو، گونـدی دەنگـەوەرە حـاجی محەمەد ئەحمەد قادر، گوندی کەنی زەرد عومەری حـاجی فـارس براگەورەیانـە لەگـەڵ براگەورەی هۆزی باشکی، گوندی قەبری مەلا برا گەورەیان ڕۆستەمی حەمەی ڕەحـیم و حاجی ڕۆیتەن بووە، گوندی کانیی کەوە بنەماڵەی (ئەلی بچوك و پاڵەوان بچوك) لـەوێ بوونە براگەورەیان مەلا محەمەد کەریم عەلی بـووە، گونـدی بنـە بـەراز زیـاتر بنەماڵـەی حاجی حەمەلی لەوێ بوونە براگـەورەیان مـەلا سـەعید حـاجی حەمەعـەلی و حـەمۆمین حاجی حەمەعەلی بووە، گوندی حەسەن ئەمنە هـەر خـۆی ئـاوەدانی کردۆتـەوە و هـەر خۆیشـی بـرا گـەورەیان بـووە، گونـدی مێوەکـەیان حـاجی مـەحمود کـەریم و حـاجی ئەولکەریم برا گەورەیان بووە، گوندی بەلەکاوی حاجی ڕەشید ئەکـەریم سـور و حـاجی محەمەد قاور براگەورەیان بووە، گوندی زاوت کۆمەڵێك ماڵی باشکی تێدایە براگەورەیان حـاجی مـەحمود پیرەیـە، گونـدی ترشـەکان دووبـەرەبابن زیاترلەبـەرەبابی وەسمـانن براگەورەیان حوسێن مەحمودی عـەمین، فارسـی وەسمـان، حارسـی وەسمـان، گونـدی کەڵەشێرە براگەورەیان بنەماڵەی حەمەی زۆرا و خێڵی سوورکن، گوندی گەرمکـە ڕەش حەمەی غەفور، حاجی عەمین سەعید وەیسی براگەورەیان بووە، گوندی کێلەسـپی بـرا

---

[٤٣٥] خسرەو جاف: س ، پ ،ل٢٨٠–٢٨١

[٤٣٦] کریم فتاح بەگ: س، پ ،ل ١٣٣–١٣٤.

[٤٣٧] محەمەد مەردۆخی: س ، پ ، ل٨٦ .

گـەورەیان مـام سـاڵەح، گونـدی گـردەڕەش خێڵـی مـام ڕۆسـتەم، عـەلی ڕۆسـتەم بـرا گەورەیان بووە، لەگوندی بانی خان و وڕێڵە هەندێك ماڵی باشكی تێدا هەیە. هـەروەها زۆرێكیان لەقەزای كەلار و ناحیەی ڕزگاری نیشتەجێن، هەروەها لەگونـدی قولەسـووتاو هەن ناسراون بەخێڵی مارە برا گەورەیان (مەحمودی ڕەش مارەیە)، لەسەنتەری شـاری سـلێمانی نزیكـەی حـەفتا مـاڵی باشـكی لێیـە براگـەورەیان (قـادر مـام سـاڵەح، مـەلا جەبار)ە، لەسەید سادق نزیكەی سەد ماڵ باشكی هەیە، لەگوندی كانی میلیش نزیكەی پـەنجا مـاڵی باشـكی لێیـە براگـەورەیان محەمـەدی مـام سـاڵەح و محەمـەدی گوڵەیـە، لەگونـدی قـالیجۆ و كـانی پانكـەش نزیكـەی پـەنجا مـاڵی تێدایـە براگـەورەیان قـادری حەمەلاو بووە . لەشارەزور لەگوندەكانی (قوماش، كەوچك تـاش، مـوانیی مـەلا تایـەر) لەقـەزای (سـەید سـادق، هەڵەبجـەی تـازە) ژمارەیـەك خێزانـی باشـكی دەبینـرێن[٤٣٨] . براگـەورەیان عـەلی حـاجی محەمـەد مـراوەیس، سـۆران حەمەسـاڵەح حـاجی حوسـێن مراوەیس . هۆزی باشكی لەباشوری كوردستان زیاترە لەحەوت سەد ماڵ .

جاران سـەرۆكیان (مرادوەیسـی محمـود) بـووە، حـاجی فـارس خەلیفـە حەسـەنیش یەكێك بووە لەڕیش سپیانی ئەم تیرەیە، ئێستاش عومەرحاجی فارس لەگـەرمیان گـوێ بۆگیراوی ئەم تیرەیە، كۆزی زستانەیان جـاران كـەوتووبووە ناوچـەی(كفری، سـەرقەلا) هێزی جەنگاوەریان (٣٠ سوارە، ٨٠ پیادە) بووە[٤٣٩] .

باشكی لەحەوت بەرەباب پێك هاتووە وەك :

ئەحمـەد باشـك: بـرا گـەورەیان بنەماڵـەی خەلیفـە هەسـەن، بنەماڵـەی مـراوەیس ، لەدوای ئەوان فـارس هەسـەن ئەحمـەد، حـاجی محەمـەد مـراوەیس مـەحمود، حوسـێن مراوەیس مەحمود، حاجی محەمەد خەلیفە، مەلا جەبار عەزیز .

مەحمود باشك: ڕیش سپی براگەورەیان قاوری مراوەیس، ڕەحیم حوسێن، مەحمود

---

[٤٣٨] ساڵح هارونی: س ، پ ، ل١٣٧

[٤٣٩] محمودعزیز حەسەن : س ، پ ، ل ٢٠

عـەمین، محەمـەد ڕەحـیم حوسـێن، سـەعید عـەلی حەمـەجان، مـەلا سـەعید حـاجی حەمەعەلی ساڵەح .

وەیسی باشك: براگەورەیان حاجی عەولکەریم شاسوار، حاجی حوسێن شاسوار .

غولامی باشك: براگەورەیان قاور عەمین عەبدولآ، قادری یاسین، حەسەن ئەمنە .

حەمەلا باشکی: مەجید حەمەلاو، حەمەخورشید حەمەلاو قاور، مەحمود پیرە .

سـورك باشـکی: حـاجی سـەعید قـادر ناسـراوە سـەعیدبەقالە هـارە، مەحەمـەد زۆراوی سورك، مەحمود زۆراو سورك .

یار ئەحمەد باشـك: یارئەحمـەد هەسـەن سـۆڤ ڕەسـوڵ، کـەریم سـۆڤ ڕەسـوڵ، خێڵـی مارە[٤٤٠].




حاجی حوسێن مرادوەیس– حاجی فارس حەسەن–حاجی مەحمود مراوەیس–عومەر حاجی فارس

[٤٤٠] گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ عومەر حاجی فارس : گوندی کەنی زەرد، ٢٠١٩/١/١٣ .

## تیرەی سەیانی (سەدانی) :

یەکێکە لەتیرە ناسراوەکانی هۆزی جاف، تیرەیەکن لەجافی مورادی باپیرەگەورەیان کەسێك بووە بەناوی (سەی دانا یا سەی زانا) پاشان بەتێپەڕ بوونی ناوەکەی گۆڕانی بەسەردا هاتووە بووە بە(سەدانی)، لەگەڵ تیرەکانی تری جاف هاتوونەتە باشوری کوردستان ماوەیەکی زۆر لەگەرمیان و کوێستانیان کردووە، کۆزی زستانەیان لەناوچەی (مەیدان) بووە، لەکاتی کۆچکردن لەڕێگەی تەنگەبەری (دەربەندیخان)ەوە هاتوونەتە (ئیمامی زامن) لەوێ بۆ ماوەی دوو تاسێ ڕۆژ ماونەتەوە، دواتر لەبناری شارەزوورە وە ڕۆیشتوونەتە ملەکەوە و لەوێشەوە بۆ پێنجوێن ئینجا ڕۆیشتوون بۆ هەوارگەکانی هاوینەیان لەهانەگلان و ماینەدۆڵی ڕۆژهەلاتی کوردستان[٤٤١]. هەندێك دەڵێن لەبنەڕەتدا ئەم هۆزە لەناوچەی (سهان) لەنزیك جوانرۆ نیشتەجێ بوون و ناوەکەیان هەر لەوناوچەیەی تێدا ژیاون هاتووە[٤٤٢]. ئەم تیرەیە لەناوچەی شارەزوور چەند گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە وەك (گێڵەك، تەکیە، گردیگۆ، تەپەتۆڵەکە، گردی قازی، شیرەمەڕ، تازەدێ، ئاوایی حەمەی مرواری، ئاوایی حاجی حەمەمین، کۆڵکنییەکان) لەگەرمیان دا لەهەردوو گوندی (بانەبۆر، قەرەچەم) یان ئاوەدانکردۆتەوە، ژمارەیەکیان لەگوندەکانی (داربەورپوولە، کانی پەنکەی سەروو) لەگەڵ خەڵکانی تیرەکانی تردا دەژین و چەند خێزانێکیان لە(کەلار، باوەنوور، دەربەندیخان، خورماڵ، هەڵەبجەی تازە، هەڵەبجەی شەهید) نیشتەجێن، دەیان خێزانیان لەناوچەی (ئارەنان)ی نزیك (سنە) و دەوروبەری (مەریوان) نیشتەجێن[٤٤٣].

بەگوێرەی بۆچوونەکان دەبێت سەیانی پاشماوەی عەشیرەتی زیائەدینی بێت، کە لایەنێکی سەربەخۆ بووە لەمۆرکردنی پەیاننامەی زەهاوی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و

---

[٤٤١] ئەیوب ڕۆستەم : هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ، ل٦٦ .

[٤٤٢] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل١٣٩.

[٤٤٣] ئەیوب ڕۆستەم : هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ، ل٦٦ .

سەفەویدا کە بۆدیاری کردنی سنوری نێوانیان لەساڵی (١٦٣٩) زمۆرکراوە، هەندێك پێیان وایە بەسەهانی ناویان دەرکردووە وردە وردە ئەو ناوە بووە بە(سەیانی) .

(خەسرەوی مچە، عەبدولا ڕۆستەم) بەدیارترین سەرۆکەکانی ئەم تیرەیە دەژمێردرێن[٤٤٤] . ئەبنە سێ بەشەوە، دابەشی شوێنی جۆراوجۆر بوونە، لەبەر ئەوەی زووتر لەتیرەکانی تری جاف دا نیشتەجێ بوونە، بەرەبەرە کەم بوونەتەوە و کەوتوونەتە ناو تیرەکانی تری جاف و غەیرە جاف. لەچەند بەرەبابێك پێك هاتوون وەك: بەرەبابی سەید مورادی – بەرەبابی ناودێری – بەرەبابی سەدانی. جاران بەگشتی سەیانی لەناوچەی گەرمیان و گەرمەسێردا بووە، بەڵام دواتر بە هۆکارێك بەرەو دەشتی شارەزوور ڕۆیشتوون، بەشێکیان لەناحیەی قۆرەتودا نیشتەجێن، هەندێکی دیکەیان لەناحیەی خورماڵ دەژین، لە دێهاتەکانی (شیرمەڕ، گیلەك، شێخ موسا، لوسینان ، چەقەڵاوە)دەژین[٤٤٥] .

## تیرەی یەزدان بەخشی(شەمێران) :

یەزانبەخشی لەسێ بەشی سەرەکی پێك هاتووە: خاڵە – بەگزادە– مامشەیی[٤٤٦] .
یەکێکن لەتیرە دیار و ناسراوەکانی هۆزی جاف، ئەم تیرەیە بەئازایەتی و لێهاتووی ناسراون، ڕەنگە بەشێك لەهۆی ئازایەتی ئەم تیرە بگەڕێتەوە بۆ شوێنەکەیان، کەیەکێکە لەسەخترین و دژوارترین ناوچەکانی جاف، زۆر نیە ئەم تیرەیە بەناوی شەمێرانەوە ناو دەبرێت، هەمووی ناگاتە حەفتا ساڵێك، کەریم بەگ لەساڵی (١٩١٤) لەکتێبەکەی دا ناوی ئەم تیرەیە بە(بەیەزدان بەخشی) دەهێنێت، شەمێران ناوچەیەکی

---

٤٤٤ ساڵەح هارونی : س ، پ ، ل١٣٠ .

٤٤٥ خسرەوجاف : س ، پ ، ل٤٠٠ .

٤٤٦ مەلا سۆران گەرمیانی : مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ل٢٢٢ .

شـاخاویی سـەخت و دژوارە، لەئێسـتادا براگـەورەی ئـەم تیرەیـە (حەمـە سـەعی مەحموودی سان ئەحمەد)ە لەکۆنەوە ئەو براگەورەیەی بۆماوەتەوە[٤٤٧].

ناوچەی شەمێران دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای هەڵەبجەوە، سنورەکەی لەباکوریەوە زێـی سـیروان، لـەخۆرئاوا و باشـوری شـاخی بـەمۆ، لەخۆرهەڵاتیـەوە سـنوری باشـور و خۆرهـەڵاتی کوردسـتانە، ناوچـەکە هەرلەگونـدی نێرگسـەجاڕ هـەتاکو سـەر بەنـداوی دەربەندیخان دەگرێتەوە، لـەم گوندانـە نیشـتەجێن (بەشـی یـیرك، تۆڵـەبی، شـەمێران، کانی کەوە، دۆڵی ناومز، ولۆەر، پشت قەلاّ، دەنگەوەرە، بەشی ئەحمەد بەگ، وەرمـن، دلّفی سەرو، دلّفی خوارو) ناوچەی شەمێران بەشێوەیەکی گشتی بەردەلاّن و شاخاویە و زەوی کشتوکاڵیان کەمە، زۆربەی زەویە تەخت و کشتوکاڵیەکانیان کاتی خۆی بوون بە ژێر دەریاچەی دەربەندیخان.

دوو بۆچوون لەسەر ناوی شەمێران هەن بەم شێوەیە :

بۆچـوونی یەکـەم: شـەمێرانیەکان بۆخۆیـان لایـان وایـە وشـەی شـەمێران لە(شـەش مـیران)ەوە هـاتووە کـە لەکۆنـدا لەناوچـەکە حوکمیـان کـردووە پاشـان لەئـەنجامی گۆڕانکاری زمانەوانیەوە بووە بە شەمێران .

بۆچوونی دووەم دەڵێت: لەکاتێکدا زێـی سـیروان سـنوری جیاکـەرەوە بـوو لـەنێوان هـەردوو دەسـەڵاتی(عوسمانی، سـەفەوی) بـەو ناوچـەیە ووتـرا (شـیممە از ایـران) واتـا دیمـەنێك یـان وێنەیـەك لـەئێران، پاشـان ناوەکـەی گـۆڕاوە بـۆ شـەمێران، شـەمێران بەشێوەیەکی گشتی شـوێنەوار و پاشمـاوەی نیشـتەجێ بـوونێکی دێـرینی تێـدا دیـارە، قەلاّی شەمێران و بوونی ڕووبەرێکی فراوانی گۆڕستان ئەو ڕاستیە دەردەخەن .

تیرەی یەزدانبەخشی کە زۆر جار بە (شەمێرانی) ناو دەبرێت بەشـێکن لـەئێلی جـاف مورادی ماوەیەکی زۆر لەکۆچ و باردا بوون، بەلاّم پاش شەڕی (حوسەین شەهید) کە لە سـەر ئـاوی شـلێر لـە بـەینی ئێلـی مـورادی ئـەو تـیرە و خێلاّنـە ڕویـداوە ئـەو کـات لـە شارەزووردا ژیاون و پێش ئێلی مورادی هاتوونەتە ناوچەکەوە، (یەزدانبەخشـی) یـەکان

---

٤٤٧ خسرەوجاف : س ، پ ،ل١٩٠-١٩١ .

وازیـان لـە ژیـانی کۆچـەرێتی و ڕەشمـاڵ نشـینی هێنـاوە و لەناوچـەی شـەمێران دا بـە ڕەزامەندی (پاشای جاف) نیشتەجێ بوون لەچـەندین گونـدێك، لەسـاڵی (١٩٢٢) هێـزی تـیرەی شـەمێران پێـك هـاتبوو لەسـەد و پـەنجا سـوارە و چوارسـەد تفەنگچـی پیـادە، ژمـارەی خێزانەکانیشـیان حـەوت سـەد خێـزان بـوون، شـەمێرانیەکان پێشـتر بـە دروستکردنی ڕەشماڵ و هۆڕ و بەڕە و مەوج و پیشەسازی دەستی بەناوبانگ بوون .

یەزدانبەخشی بەواتای (شەمێرانی) دەبـن بەچـەند بنەماڵەیەکـەوە لەوانـە بنەماڵـەی (نـادری بـارام، هەواسـی، بـارامی حەمـەی شـاوەیس، یـونس بـەگی، سـان ئەحمـەد، شـێخەکان، حەمـەمینی عـەزیز، وەسمـان، هـەلانی، مچـەکوڵی، خـوداداد ،مـەحمودی هەواس، میران، چراخ، هاجك، عەبدوڵای ڕەسوڵ، مستەفای مەحمود بەگ) .

شـەمێرانیەکان مـاوەی چـوار سـاڵ لەدەسـەڵاتی (ئینگلیـز) یـاخی بـوون و باجیـان نـەداوە، بەرامبـەر بـەو هەڵوێسـتەیان فڕۆکـەکانی (ئینگلیـز) هەڕەشـەی مـەرگ و بۆمبارانیـان لێکـردووە، بـەفرمانی (حەمـەی سـان ئەحمـەد) گونـدەکانیان چـۆڵکردووە ڕوویانکردۆتە چیاکان، ئینگلیزەکان هەوڵیان داوە بەهێزێکی تایبەت ناوچـەکە کـۆنترۆڵ بکەن، پاش چەند ڕۆژێك بۆردومـانی گونـدی (کـانی کـەوەی شـەمێران) حەمـەی سـان ئەحمەد بە تفەنگـە تـەیارە شـکێنەکەی خـۆی لەپـەنای بـەردێك دا مشـتی لەیـەکێك لـە تـەیارەکان گرتـووە لەگونـدی چـەمە ڕەش کەوتۆتـە خـوارەوە، ئەفسـەری سیاسـی بریتانیەکان لەشاری هەڵەبجە داوایان لەشەمێرانیەکان کـردووە، فڕۆکەکـە یـان تەسـلیم بکەنەوە بەرامبەر بەوە ئەو باجە لەسەریانە دەیانبەخشن، بـەڵام شـەمێرانیەکان ملیـان نەداوە، لەپارچـەکانی ئـەو فڕۆکەیە(چـەقۆ، گاسـن، تـەور، داس)یـان دروسـتکردوون و پاشان ئاگریان تێبەرداوە .

پاشان لەچەند قۆڵێکەوە ئینگلیزەکان هێرشیان کردۆتە سەریان، شـەمێرانیەکان لـە هەڵمەتێکی شێرانەیان شکاندویانن و تـا مەیـدان ڕاوییـان نـاون لـەو نەبەردیـە (گـەڵاڵی، نەورۆڵی، خەڵکی بناری هەڵەبجە بەتایبەت لایەنگرانی شێخ ڕەشید عـەبابێلێ) هاوکـاری

شەمێرانیەکانیان کردووە[٤٤٨]. میرزا شکرولاّ سنندجی لەنێوان سالاّنی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵێت: یەزدان بەخشی نزیك بە (پەنجا ساڵ) دەبێت چوونەتە ناو پاشماوەی ئێلی جافەوە، پێش ئەوە زستان و هاوینان لەناوچەی (جوانرۆ) بوون، ڕەعیەت و باج دەری ئەوێ بوون[٤٤٩]. ناوچەی شەمێران ناوچەیەکی زۆر خۆش و دلگیرە، لەبەهاراندا ڕێژەیەکی بەرچاو لەخەڵك ڕوو دەکاتە ئەم ناوچەیە بۆگەشت و سەیران، ئەوەی زیاتر ئەم ناوچەیەی خۆش کردووە و وای لێکردووە خەڵکی رووی تێبکەن، نزیکی دەریاچەی دەرەبەندیخانە. لە(هەڵەبجەی شەهید، سیروان، هەڵەبجەی تازە، دەربەندیخان) بەڕێژەیەکی بەرچاو خێزانی شەمێرانی نیشتەجێن. ئەم تیرەیە پێش زۆربەی تیرەکانی جاف وازیان لەژیانی کۆچەرێتی هێناوەو خۆیان بە کشتوکاڵەوە سەرقاڵکردووە[٤٥٠].

ناودارانی تیرەی شەمێرانی یان یەزدان بەخشی: (وەسمانی خاڵە، مستەفای وەسمان، خالیدی مستەفای وەسمان، میر محەمەدی خەلیل، سان ئەحمەدی میر ئەحمەد، محەمەدی سان ئەحمەد، مەحمود سان ئەحمەد[٤٥١].

تیرەی بەیداخی :

یەکێکە لەتیرەکانی هۆزی جاف، ناوەکەیان لەوشەی (بەیداخ )ەوە هاتووە واتا ئالاّ، کە ئالاّی لەشکری جافیان هەڵگرتووە، ئەم تیرەیە وەك تەواوی تیرەکانی هۆزی (جاف) کۆچەری بوونە خەریکی ئاژەڵداری بوونە، بەدوای لەوەڕگا گەرمیان و کوێستانیان کردووە لەخەتی (پێنجوێن)ەوە چوونەتە چەمی(کوڵە، دۆزەغەری) لەدەڤەری (مەریوان) گیرساونەتەوە، لەنزیکی تیرەکانی جاف هەوارگەی تایبەتی خۆیان هەبووە، لەو دیوەوە بۆگەرمیان گەڕاونەتەوە بۆناوچەکانی (مەیدان، قەرچەم) سەرۆك خێڵی ئەو

---

٤٤٨ ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل٦٠–٦٣ .

٤٤٩ میرزا شکرولاّ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلاّن، و ئەنوەر سوڵتانی ، چاپخانەی ژین–سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ، ل٧٣.

٤٥٠ ساڵەح هارونی: س ، پ ،ل١٤٥–١٤٦ .

٤٥١ خوسرەوجاف: س ، پ ، ل١٩٢

سەردەمەیان (ئەڵماس عەلی محەمەد) بوو. تاساڵی (١٩٣٠) بەو حاڵەتە ژیاون، لەدوای ساڵی ١٩٣٠ بەپێی ڕووداوە سیاسیەکان و بەستنی ڕێککەوتن لەسەرسنور لەلایەن دەوڵەتی ئێران و دەوڵەتی تازە دروست بووی عێراق و گۆڕینی شێوەی ژیان بەشێکیان لەگەرمیان و بەشێکیشیان لەشارەزوور نیشتەجێ بوون. بەشێکیان لەگەرمیان نیشتەجێ بوون لەم شوێنانەی خوارەوە وەك: (مەیدان، قەرچەم، خوڕخوڕ، سەیدمحمود، قەڵاتەپە، کوڵەجۆ) قەزای کەلار بەڵام بەشی زۆریان لەناحیەی باوەنور نیشتەجێ بوون، بەشێکیان لەکوڵەجۆی زەنگەباتن کە ناسراون بەخێڵی (عەودە سور). لەشارەزوور لەسەیدسادق، گردەنازێ، قاجر، بەشارات، نزیکەی سەد ماڵیان نیشتەجێی گوندی (داربەرولەن) سەربەپارێزگای سلێمانی (محەمەد ئەمین) براگەورەیانە.

ژمارەی تیرەی بەیداخی لەئێستادا نزیکەی (٧٠٠)حەوت سەد ماڵن. ئەم تیرەیە لەگەرمیان زۆر تێکەڵی تیرەی شاترین، لەشارەزووریش لەگەڵ تیرەی هاروونی دا تێکەڵاون. پیاوی ناوداریان زۆر تیادا هەڵکەوتووە وەك: (ئەلماس عەلی محەمەد، کوردەی عیسا، هەمزەی عیسا، ئەحمەدی ڕەحیم، حەمەی عەلی مورادیان، ساڵەح مەعروف، محەمەد عەلی وەیس عەزیز، ڕەحیم کەریم وەیسی[٤٥٢]. سەردەمێك هەمزەی عیسا سەرۆکیان بووە، دواتر(حەمەعەلی مورادخان) بووەتە ڕیش سپی و گەورەیان، بەشێکیان کە لە(قەسلان و بناری بەمۆ) بوون پشتماڵەی (مەحمود پاشای جاف) بوون، بۆ کاتی تەنگانە پارێزەر بوون بۆ تێکڕای جاف[٤٥٣].

---

[٤٥٢] خوسرەو جاف: س ، پ ،ل١٨٢– ١٨٣ .

[٤٥٣] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ١٩٤ .

## چەند تیرەیەکی جافی جوانڕۆ و جافی گۆران :

### تیرەی تاوگۆزی :

تاوگۆزی تیرەیەکن لەجافی جوانرۆ، باپیرە گەورەیان کەسێك بووە بەناوی (مەلا یوسف جان) کوڕی (مەلا ئەبوبەکری چۆریە) کە بە (موصەنیف) ناسراو بوو، بەڕەچەڵەك دەچێتەوەسەر پیر خدری شاهۆ، مەلا یوسف جان بەلاوێتی چووەتە گوندی (چۆڕی) و پاشان جێی هێشتووە و هاتۆتە گوندی (دەودان) بۆ ماڵی پیرمکایەڵی دەودان، کە باوکی دایکی بووە، لەوێ خالۆزایەکی خۆی خواستووە، لەشوێنێك کە لەتەنیشت (دەودان) دایە و پێی دەوترێ (کانی تاوك و گوێز) خانووی دروستکردووە، ئەم ناوەش دواتر گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بە(تاوەگۆز) بەنەوەکانی وتراوە تاوگۆزی. تاوگۆزی لەسێ بەرەباب پێکهاتووە وەك (ویصاڵی، کەماڵی، جەماڵی) هەموو خەڵکانی تیرەی تاوگۆزی دەچنەوە سەر ئەم بەرەبابانە .

لەکۆتایی سەدەی هەژدە شاعیری گەورەی کورد مەولەوی لەنزیك ڕووباری سیروان لەپشت شاخی بالأنبۆ گوندێکی دروستکرد و ناوی نا سەرشاتە، چونکە ڕوانیویەتی بەسەر ئاوی سیرواندا، لەزۆر شوێن بەسیروان دەوترێ (شەتی سیروان) پاشان چەند خێزانێکی تری تیرەکە لەڕۆژهەلأتی کوردستانەوە هاتوون و چەند گوندێکیان لە ناوچەکە ئاوەدانکردەوە وەك گوندی (گەڕاو، بەشی عەلی، پشت قەلاّ، زارین، بانیبۆلاّ، مۆرتکە، قەڵب، گمە، پشتە، کانی ژەنان) هەروەها تاگۆزیەکان لەڕۆژهەلأتی کوردستان لەناوچەی جوانڕۆ چەند گوندێکیان ئاوەدانکردۆتەوە لەوانە (شێخ سێڵە، ڕەجەوی، دەستیهەردی، بەشی ئەلیوەیس، بەشی مەحمود)، ئەم تیرەیە چەندین کەسی خاوەن پایەی دینی و کۆمەلأیەتی دیاریان هەبووە. ناوچەی تاوگۆزی شاخاوی و بەردەلأنە، زەوی کشتوکاڵیان کەمە، ئەو گوندانە ڕووبەرێکی کەم زەوی کشتوکاڵیان هەیە، تەنها

گەنم و جۆ بەرهەم دەهێنن، دارستانی سروشتی هەموو ناوچەکەی داپۆشیووە، هەر لەبەر ئەوەیە سەرچاوەیەکی سەرەکی دابینکردنی بژێوی خەڵکی (تاوگۆزی) ئاژەڵداری و سود وەرگرتنە لە بەروبوومی دارەخۆڕسکەکان وەك (بنێشت، قەزوان، چەقالە، گوێژ، بەڕوو)، ژمارەیەکیان سەرقاڵی ڕاوەماسین، هەندێکیان لەکاروباری دەوڵەتیدا کاردەکەن. ئەم تیرەیە ئێستا بەزۆری لە(زەڕایەن، عەنەب، هەڵەبجەی شەهید، هەڵەبجەی تازە، دەربەندیخان) نیشتەجێن[٤٥٤]. لەڕۆژهەلاتی کوردستان ئەمانە ئەبنە دوو کۆمەڵە کۆمەڵەیەکیان لەجوانڕۆن، کۆمەڵەکەی تریان لە(پشت قەلای شەمێران)ەون هەموویان زووتر وازیان لەژیانی کۆچەری هێناو نیشتەجێ بوون، شاعیری گەورەی کورد (مەولەوی) گەورەی ئەم تایفەیەبووە جاران، لەسەردەمی کەریم بەگی جاف سەد پیادەی تفەنگدارو، ١٢سواریان بووە[٤٥٥] .



لەبنەڕەتدا (تاگۆزی) خەڵکی گوندی (تاگوزی) سەربەناوچەی جوانرۆن، ناوەکە لەناوی دوو درخت پێکهاتووە (تاوگ +گوێز) کەئێستاش گوندەکە هەر ئاوەدانە، لەم گوندانە نیشتەجێن: (سەرشاتەی خواروو، سەرشاتەی ژوورو، زارێن، سەعداوا، گڵێجاڵ ، گمە، پشتە،قەڵپ ،گوکولێن ،کانی ژەنان ،مورتکە ،گەڕاو ،پشت قەلا ،کانی وەیسکی ، بەلەسۆ، بەڕوێنی سەروو، بەڕوێنی خواروو،چوارداران، وەوشکێ، خێڵی گورگە، بەشی **شاعیری پایە بەرز مەولەوی** ئەلی، بانی بۆڵان) لەهەندێ لەم گوندانە بنەماڵەی (زەردۆیی، شەرەف بەیانی، قواوی، باوەجانی)هەن. ئەم ناوچەیە بەرلەوەی تاگۆزی وخێڵەکانی تر کۆچی بۆبکەن هەردوو گوندی (زارێن، پشت قەلا) ئاوەدان بوون، ئەمانە بەشێکیان هاتوونەتە شارەزوور و گوندی (گورگە چیا)یان ئاوەدان کردۆتەوە، هەندێکیشی پەڕیوەی بەری قەرەداغ بوون

---

[٤٥٤] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل٧٣-٧٥ .

[٤٥٥] کریم فتاح بەگ: س ، پ ، ل١٤١.

و لەگوندی (چیمەن) نیشتەجێن[٤٥٦]. کەسەکانی ئەم تیرەیە لەناو ئێلی جاف بەسەیدی تاگۆزی ناو دەبرێن، بەڕەچەڵەك خۆیان دەگێڕنەوە سەر پیر خدری شاهۆ، هەندێکیان پێیان وایە لەڕێگای ئیمانداری و عیبادەت کردنەوە نازناوی سەیدیان بە سەردا بڕاوە. بەشێکی تیرەی تاگۆزی دەکەونە رۆژهەلاتی کوردستان و جوانرۆ سەرۆکیان(سەی عەبدولا) بووە جاران[٤٥٧] .

## تیرەی زەردۆیی :

زەردۆیی تیرەیەکی گەورەی هۆزی جافە بەزۆری لەناوچەی جوانرۆن و چەند گوندێکیان لەپاوەوە نزیکە و سەربەو شارەن، ڕێژەیەکی زۆری ئەم تیرەیە کەوتووەتە شاری کرماشانەوەو لەگەرەکی فەیزئاباد خەریکی کاروکردەوەی بازرگانین، دەڵێن هەندێکیان چوونەتە سەر مەزهەبی (شیعە)، لە باشوری کوردستان لەشاری هەڵەبجە و دەوربەری دا خێزانی زەردۆیی بەشێوەکی بەرچاو دەبینرێت، لەجافداری دا شاخی شاهۆ هەواری هاوینەی بووە[٤٥٨]. زۆر لەکەسانی ئەم تیرەیە زیاتر لە (١٥٠) ساڵ پێش تیرەکانی تری جاف دەستیان لە ژیانی ڕەوەندی هەلگرتووە نیشتەجێی شاران بوون بەتایبەتی شاری (کرماشان) هێشتا زۆریان لادێ نشینن و بەکار و کردەوەی ڕۆژانەی خۆیانەوە خەریکن، زەردوویی هۆزێکی کۆچەر و ئاژەڵدار بوون و یەکەم داهاتی ئەوان لەڕێگەی ئاژەڵداریەوە دابینکراوە، دوای ئاژەڵداری خەریکی باخداری و باخەوانی بوون، بنێشت کردن یەکێکە لەئیش و کارە تایبەتیەکانی هۆزی زەردووی لەمێژەوە ئەم خەڵکەبۆ بنێشت کردن لەوەرزی هاوین بەرەو شارەکانی (ئیلام، خورەم ئاباد، ئابدان،

---

[٤٥٦] حکیم مەلاساڵەح: س ، پ ،ل ١٣٨–١٣٩ .

[٤٥٧] ساڵح هارونی : س ، پ ، ل١٤٨ .

[٤٥٨] ساڵح هارونی : س ، پ ،ل١٦٠–١٦١ .

مەریوان، بانە، هەورامان) بەرێ دەکەون و بۆ ماوەی دوو تا سێ مانگ خەریکی بنێشت کردن دەبن[٤٥٩]. لەبەرئەوەی باپیرە گەورەیان تووشی نەخۆشی زەردویی هاتووە، ئەم تیرەیە نەوەو نەتیجەکانی بەناوی ئەو نەخۆشیەوە ناسراون، ئەم تیرەیە ئەبن بە چوار بەشەوە هەر بەشێك ناو تایبەتمەندی خۆی هەیە :

١- ساتیاری: باپیرە گەورەی ئەم بەشە لەو سەردەمەدا سەعاتی هەبووە، ئەو کات هەر کەسێك سەعاتی هەبوایە شتێکی سەرسام بووە، بۆیە سەعاتداری بووەتە سایتیاری ..

٢-ڕەوانی: لەبەر ئەوەی نیشتەجێی دێی ڕەوانی دەڤەری جوانڕۆ بوونە بەو ناوەوە ناسراون، ڕەزوباخی زۆریان هەیە .

٣- شاقوایی: بەناوی باپیرەگەورەیانەوە ناونراون، زۆربەیان لەجوانڕۆدا دەژین .

٤-کەوانگەر یا کەمانگەر: زۆر بنەماڵە لەناو شاری سنە بە کەمانگەر ناسراون،[٤٦٠].

---

[٤٥٩] خسرەو جاف : س ، پ ،ل٤٢٨ - ٤٢٩ .

[٤٦٠] خسرەو جاف : س ، پ ، ل٦٦ .

## کەمانگەر:

بەشێکی گەورەی زەدۆیی سەربەتیرەی کەمانگەرن، رۆڵەکانی ئەم تیرەیە پێشووتر لەناوچەکانی: ئافریان سەروو، ئافریان خواروو، ماویان، کورەدەرە، تفین، ساتیاری و قەرەویس، کۆڵەسارە، ماسان، کەوانە، پاڵنگان، گرگان، عەنەب، دەرەشیش نیشتەجێ بوون. زێدی ئێستایان دەکەوێتە سنوری هەردوو پارێزگاری کرماشان و سنە لەناوچەی بیلور. لەنزیك سنە لەپازدە گوند نیشتەجێن، سنوری باکوریان کرماشان و کامیاران، سنوری باشوریان میل دەربەند کرماشانە، سنوری ڕۆژهەلاتیان ناوچەی بیلورە، لەڕۆژئاواشەوە قەدپاڵی شاخی شاهۆ و ڕەوانسەرە. هەندێکیان لەهاویندا باریان دەکرد بۆ ناوچەکانی ماراب، گرکان، کەناری ڕووباری قەرەسوو، سەرچەم گرکان، نەهار، کێوی شاخ شکن، لەزستاندا دەچوونە زەهاو و نەسرئاباد. ناوی کەمانگەر لەکەمان(کەوان) دروستکردنەوە هاتووە، لەدروستکردنی کەماندا وەستاکار بوونە و شورەتیان بەو پیشەوە دەرکردووە، یان هەندێك دەڵێن لەشەڕدا تیر و کەمانیان بەوردی بەکارهێناوە و نیشانیان بەهەڵەدا نەڕۆیشتوو، کاتێك کۆنفیدراسیۆنێکی یەکگرتووی هۆزی جاف دامەزرا، کەمانگەرەکان پەیوەندیان بەم یەکگرتووە کردو بوون بەتیرەیەکی گەورە لەجاف جوانڕۆ. لەسەردەمی کۆندا باپیرە گەورەیان ئیبراهیم خانی کەمانگەر لەناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە بەتایبەت لەگوندی دەرەشیش و عەنەب بەخۆی و تیرەکەی باران کردووە هاتوونەتە شوێنەکەی ئێستایان، لەیەکێك لەنامەکانی مەولانا خالید کەبۆ حاکمی هەڵەبجەی ناردووە دەڵێت: بنەماڵەی مەلا مەحمودی بیاوێڵەیی کەیەکێکە لەپیاو چاکان بەدەردی بنەماڵەی کەمانگەر مەبەن، بەو پێیە بنەماڵەی کەمانگەر لەساڵانی(١٨١٠بۆ١٨٢٠)لەسنوری هەڵەبجە دەرکراون و ناوچەکەیان جێهێشتووە، ئەم تیرەیە تاسەردەمی ئیمام قولی میرزا عیمادودەولە تیرەیەکی کۆچەری بوون. لەم هۆزە دەیان کەسایەتی سیاسی و ئاینی و کۆمەلایەتی و زانستی دیاریان تێدا هەڵکەوتوو، خوا لێیخۆش بێت سدیق کەمانگەر ڕابەرێکی بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد بوو(کۆمەڵە) لەڕۆژهەلات، شێرزاد کەمانگەر دامەزرێنەری پارتی

ئـازادی (پـەژاك)، مـەولانا ئەحمـەد کەمانگـەر بەڕێوەبـەری جێبـەجێکاری کۆمپانیـای یوتیوب و جێگری سەرۆکی بەشی ڤیدیۆیـە لـەگۆگڵ، عومـەر فـەتاح ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسی یەکێتی و سەرۆکی حوکمەتی پێشوو لەئیدارەی سلێمانی[٤٦١] .



مەلا مەحمود خانی کەمانگەر منداڵ و تفەنگچیەکانی کەمانگەر لەساڵی ١٩٠٩ .

## ساتیاری

زۆر ئاماژە هەیە ئەم تیرەیە لەبنەچەدا سەربە هۆزی جاف بن، ئەوەی باس دەکرێت لەتیرەی کەمانگەر جیابوونەتەوە، بەڵام بەگوێرەی زانیـاری سەرچـاوە مێژوویـەکان لـە سەردەمی دەسەڵاتی گەڵاڵیەکان بەشێك بـوون لـەوان، ئێسـتا لەناوچـەکانی جـوانرۆ لـە (ڕەوانسەر) و (کرماشان)یش نیشتەجێن[٤٦٢] .

---

[٤٦١] جوتیار کەمانگەر: عەشیرەتی کەمانگەر، ماڵپەری مێژووی کورد .

[٤٦٢] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ، ل٢٧٨.

## تیرەی تایشەیی :

ناوی ئەم تیرەیە لەلایەن مێژوونووسی ئێرانیی بەناوبانگ ئەسغەر شمیم بە (تایشە ئای) و لەلایەن مێژوونووس مەسعوود کەیهانیش بە(تشە) هاتووە، نووسەر ناصر محسنی– ش بە (قشە ئای) ناوی بردوون و دەڵێت ئەمانە لەبنەڕەتدا کوردی وڵاتی ئەرمینیا (ئەرمەنستان) بوون و بەر لەوێ بێنە کوردستانی ڕۆژهەڵات ئایینی مەسیحییان هەبووە، دواتر لەگەڵ تیرەو تایفەکانی تری جاف دا تێکەڵاو بوون و بوونەتە بەشێکە لە پێکهاتەی جاف. ئەم تیرە بەشێکی گرنگی هۆزی جاف دادەنرێن و وەك تێکڕای تیرە و بەشە دێرین و ڕەسەنەکانی ئەم ئێلە ساڵانە بەژیانی کۆچەرییەوە سەرقاڵ بوون، ئەم تیرە لەتیرە گەورەو ناودارەکانی سنووری جوانڕۆ بوون پێش ئەوەی بگوێزنەوە بۆ ناوچەی ئێلی گۆران. بەگوێرەی سەرژمێرییەك ساڵی ١٩١٤ ئەنجامدراوە بەهەزار و پێنج سەد خێزان مەزەندە کراون و خاوەنی چەندین بەتالیۆنی سوارە و پیادەی جەنگاوەر بوون. ئەم تیرەیە بەسەرۆك و کەسەکانیانەو، نموونەی کەسانێکی خواپەرست و پابەند بەئایینی پیرۆزی ئیسلام بوون و، هەمیشە بەوە ناسراوبوون کە لەبەرژەوەندیی ئایینەکەیان دا خزمەتی بەرچاویان کردووە، زۆریش لەسەرۆکەکانیان خاوەنی زانست و ڕۆشنبیریی ئایینی بەرز بوون[٤٦٣]. مستەبەگی جاف دەڵێت: ئەم تیرەیە لەچوار بەش پێك هاتوون: (ئەلیارکی، خاڵە، وارژەئی، داردەرویشی) تیرەی داردەرویشی، ئەلیارکی زۆرتر تێکەڵی هۆزی (سنجاوییەکان) بوونە، لەدوایدا گەڕاونەتەوە ناو تایشەیی. خاڵەیەکانیان لەبنچەدا لەتیرەی (مکایەلی)ین، وارژەئی لەسەر نەزەرسوڵتان دەژمێردران، لەکۆنەوە لەزەهاو و داڵەهۆدا ژیاون[٤٦٤]. ئەو حەوت سوڵتانەی دانراوە بۆ ناوچەی ژێر دەسەڵاتی گۆرانەکان، هەمیشە سوڵتانێکیان لەتایشەیەکان بووە، کە ئەمەش پێگەو سەنگی ئەم تیرەیە دەردەخات[٤٦٥] .ئەم تیرە بەزۆری دەکەونە هەردوو

---

[٤٦٣] www. Googl.coom مێژووی هۆزی جاف ٢٠١٤/٦/٢٨ .

[٤٦٤] خوسرەوجاف : س ،پ ،ل٥٢٣ .

[٤٦٥] مەلا سۆران گەرمیانی : مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل١٩١ .

دیوی سنوری (ئێران، عێراق) ناوچەکانی ئەم تیرەیە دەکاتە دوو بەشەوە لەنێوان ئەو دوو وڵاتە دا، کەچی تایشەیی لەهەندێك سەرچاوە واباسکراوە لەم بەشانەیش پێك هاتووە کە سەرەکیترینیان ئەمانەن: خێڵی نەزەر–خێلی میرە(میرەییەکان)–خێڵی خواکەرەم[٤٦٦]. لەسەردەمی دەسەڵاتی (قادربەگی کوڕی کەیخەسرەو بەگی جاف)دا لەپاش ساڵی ١٨٢٠ز، شەڕێك لەنێوان تایشەیی و قادرمیروەیسی ڕوودەدات، ئەم دوو تیرە لەیەك ناوچەبوون و خزمایەتی ژن و ژنخوازی لەنێوانیاندا هەبوو، قادربەگ بەمەبەستی ناوبژیوانی دەچێتەوە نێوان ئەم دوو تیرەوە، بەڵام لەوکاتەدا گولەیەکی وێڵی بەردەکەوێ و دەکوژرێت، کوژرانی قادر بەگ شاعیرانیشی هێناوەتە گۆ چەندین هۆنراوەیان لەسەر هۆنیوەتەوە، قادربەگیش لەگۆڕستانی سەیدخەلیل بەخاك دەسپێرن، پاشان محەمەد بەگی جاف سەرۆکایەتی جاف دەگرێتە دەست[٤٦٧]. ئەم تیرە بەهۆی چەوسانەوەی میرەکانی (ئەردەڵان) زۆریان ناچار بوون بەکۆچ کردن و هەڵهاتن بۆ ناو هۆزی (گۆران) لەگەڵ تیرەی (قادرمیروەیسی)[٤٦٨] ناوەندی سەرەکیی ئەم تیرەیە دەکەوێتە ناوچەی پاڵان لە(زەهاو) و لەسەر سنووری ئێران– عێراق بڵاو دەبنەوە، سنووریان لە باکوورەوە: ناوچەی جێگیران، لەڕۆژهەڵاتەوە ناوچەی نیشتەجێ بوونی تیرەی نیرێژی لەجافی گۆران لەباشوورەوە ناوچەکانی جگەرلو و چوارکڵاو، لەڕۆژئاواوە هەوارگەکانی عێلی گۆرانە، ئەم تیرەیە بە زاراوەی جافی کوردی دەدوێن. شوێنی حەوانەوەی وەرزی زستانی ئەم تیرەیە بریتی بوو لەناوچەکانی کانی شیرینە و دەوروبەری بیرە نەوتەکانی قۆرەتوو، لەبەهارانیشدا لەناوچەکانی (تەپە ڕەش، دارایخان و زەهاو)دا نیشتەجێ دەبوون، لەوەرزی هاوینیشدا دەچوونە ناوچەکانی (پاڵان، حەسەن گایر، کانی سەفەر، پلەزەرد، قەدپاڵی داڵەهۆ)[٤٦٩].

---

٤٦٦ ساڵح هارونی: س ، پ ،ل ١٥٨–١٥٩ .

٤٦٧ کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل٨٠–٨٧.

٤٦٨ محمود عزیز حەسەن: س ، پ ، ل ١٣.

٤٦٩ www. Googl مێژووی هۆزی جاف .

لەسەرۆکە دیارەکانی تیرەی تایشەیی: فەقێ موستەفای تایشەیی: ئەم پیاوە وەك باسدەکرێت ئاین پەروەر بووە و هەر لەسەرەتای منداڵیو لاویەوە زانستە شەرعیەکانی خوێندوە و دواتریش بووەتە یەکێك لەسەرۆکە دیارەکانی تایشەیی .

نەزەر سولڵتانی کوڕی فەقێ مستەفا: سەرۆکێکی هەڵکەوتووی تایشەیی بووە و یەکێك بووە لەسولڵتانەکانی گۆران .

مەعاریف سولڵتان کوڕی نەزەرسولڵتان: ئەم کەسایەتیە سەرۆکی تایشەیی بووە، توانیویەتی هەموو گۆرانەکان بخاتە ژێر دەسەلاڵتی خۆی و سەرۆکایەتی هەموو تیرە و تایەفەکانیان بکات .

عەلی سولڵتان: پیاوێکی خانەدان و ناسراوی سەردەمی خۆیی بووە، زۆر چیرۆکی نەبەردی و داستانی دلێرانەی لەمەڕ دەگێڕنەوە .

کوێخا مستەفا: پیاوێکی دیار و ناسراو بووە .[470] .

کوێخا مەحمود نەزەر کوڕی کوێخا مستەفا: ئەم پیاوە ماوەیەکی زۆر سەرۆکی تیرەی تایشەیی بوو، پاش ئەوەی شۆڕشی گەلانی ئێران دەسەلاڵتی گرتە دەست بەسەرۆکایەتی خومەینی لە ساڵی (١٩٧٩) گەلی کورد توشی ستەم و کوێرەوەری زۆر بوو، تایشەییەکان بەسەرۆکایەتی کوێخا مەحمود شان بەشانی تیرەکانی جاف و هۆزە هاوپەیمانەکانیان وەك (قەڵخانی و هۆزەکانی تری گۆران) بەفەرماندەی سەرداربەگی جاف لەدژی ستەم و ناڕەوایی ڕژێمی ئێران ڕاپەڕین و زیانی زۆریان بەڕژێم گەیاند، لەو کاتەدا کوێخا مەحمودی نەزەری لەکاتی بەسەرکردنەوەی هێزەکانیان شەهید دەکرێت، لەپاش کوێخا مەحمود (ئیحسان نەزەری کوڕی) لەئاهەنگێکی شایستەدا، بە ئامادەبوونی سەرداربەگی جاف و ناوداران و پیاوماقولاڵنی تایشەیی، لەشوێنی باوکیدا بەسەرۆکی هۆزی هەڵبژێردرا، لەکۆتای سەدەی بیستەم لەناوچە سنوریەکانی باشوری ڕۆژهەلاڵتی کوردستانی باشور ئەم تیرە لەلایەن کوێخا فەرەج سەعیدەوە سەرۆکایەتی

[470] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل١٩٢ .

کراوە، پاش ئەویش کوڕەکەی کوێخا محەمەد لەجێگەی باوکی سەرۆك هۆزە ئێستا لەقەزای خانەقین نیشتەجێ یە[٤٧١].

## تیرەی ئەلیاسی :

تیرەی ئەلیاسی وەك هەندێك لەتیرەکانی دیکەی جاف، بۆ ناوچەکانی ئێلی گۆران و چیای دالاهۆ کۆچیان کرد و لەدۆڵی عەلی عاسی، قەدپاڵی دالاهۆ، ناوچەی بان زەردە جێگر بوون، ئەم تیرەیە بریتی بوون لەدووسەد و پەنجا خێزان، هەوارگەی هاوینەیان ئەم شوێنانەی دەگرتەوە: بان زەردە، قەلای ئاوارە، گۆیژە، ملەچیا. هەوارگەی زستانەیان: سەرقەلا، زەهاو، خوڕخوڕە بووە[٤٧٢]. ئەلیاسی سوڵتانی تایبەت بەخۆیان هەبووە لەناوچەی گۆراندا وەك تیرەی (قادرمیروەیسی، تایشەیی، بێویانی، نێرژی).

هەواری سەربەخۆیان هەبووە وەك هەر تیرەیەکی جاف. شوێنی ئەم تیرەیە لە ڕۆژهەلاتی کوردستان (قەرەسەنی، بەردی عەلی، بڕی مەلا محەمەد، بڕی کەریم ماهی، دۆپاریزگە، بڕی گەورەی محەمەد ئەوڕەحمان، بڕی خەلیفە حسەین، بڕی ئەوڕەحمان قارەمان، تەشی ڕێس، چالەڕەشی دەشتی زەهاو) لەباشوری کوردستانیش لەم ناوچانەنیشتەجێن (کفری، سەرقەلا، جەبراوە، باوەفەتی لەچەمچەماڵ، ئاوەژی لە بنگرد)[٤٧٣]. نیشتمانی ئەم تیرەیە لەئێستادا دەشتی زەهاو و بناری چیای دالەهۆیی سەرکەشە لەپارێزگای کرماشان، هەندێکیانیش لەکەلار و چەند جێگایەکی تر نیشتەجێن. هەندێك سەرچاوە ئاماژەبەوە دەکات ئەلیاسیەکان لەنەوەی کەسێکن بەناوی (ئەڵماس) هەشت کوڕی هەبووە بەناوەکانی (قادر، مەحمود، عەلی، ڕەحیم،

---

[٤٧١] کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣، ل٨٠–٨٧.

[٤٧٢] ماڵپەری کوردپیدیا: عەشیرەتی جاف و تیرەکانیان ، ٢٠١٣/١٠/٢٣ .

[٤٧٣] مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف، چ١، ٢٠١٨ ،ل ٢٦٣–٢٦٤ .

نــادر، مســتەفا، عەبــدولاّ، عەبــدولڕەحمان)، ئەلیاســیەکان بــەژمارە لەتایفــەکانی دەوروبەریان کە پێکهاتووبوون لە (تایشەیی، قادرمیروەیسی، بیویانی، نێـرژی) کـەمتر نەبوون[٤٧٤] .

## تیرەی وەڵەد بەگی :

ناوی تیرەکە لەباوەگەورەیانەوە بۆ ماوەتـەوە کـە وەڵـەد بـەگی کـوڕی خانەبـەگی کوڕی یار ئەحمەد کوڕی سەیفولاّ بەگی کوڕی سەید ئەحمەدی گەورەیە، ئەم تیرەیە لـە دیارترینی خێڵەکانی جوانڕۆ بوون و دەسەلاّتیان بەسەر هەموویان دا هەبووە و تەنانەت ئەردەلاّن و گۆرانەکان نەیان توانیووە بیان خەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، هەر بۆیە بەردەوام لەشەڕ و ململانێدا بوون[٤٧٥] .تیرەیـەکی ناسـرا و فـرە بـەرەبابن لـەناو جـاف جـوانڕۆدا، هەروەها لەنێو جاف مورادی دا ناسراون و بەگزادەیان هەیە و لەگەڵ بەگزادەکانی کـەی جـاف دا خـزم و خوێشـی یـەکن، لـەناو هـۆزی جافـدا توانـا و دەسـەلاّتیان زۆر بـووە، لەدەڤەری جـوانڕۆدا وەلەدبـەگی لەزۆربـەی ڕووداوەکانـدا بوونیـان هـەبووە[٤٧٦]. مـیرزا شکرولاّ سنندجی لەنێوان سالاّنی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵێ: ئەم هۆزە بـەهۆی ئازایـەتی و بەجەرگی و پیاوەتیەوە لەناو کوردا بوونەتە مەسەل، پێشتر هـۆزێکی مـەزن و بەپایـەو ڕێـز بـوون بـەهۆی ئازایـەتی و نەترسـیەوە زۆربـەیان کـوژران، کەسـانی ناسـراو نـاودار بەئازایەتی زۆر لەناویاندا هەڵکەوتووە وەك (بەهرام بەگ، سۆفی بەگ، ڕۆستەم بەگ) کـە لەشەڕو هەرادا وەك ڕۆستەمی زاڵ بوون. هۆزی ناسراوی بەجاف، لـەڕابوردوو دا هـەموو ژێردەست و ملکەچی تیرەی (وەڵـەد بـەگی) بـوون، جـاف (تایشـەیی) کـە ئێسـتا لـەژێر حوکمی حاکمانی (کرماشان)ن لەم هۆزە بوون، بەشێکی دیکەیان لەناوچەی کرماشـانن

---

[٤٧٤] حەسەن جاف: ئێل بەگی جاف: تۆڕی کۆمەلاّیەتی فەیس بووك .

[٤٧٥] مەلا سۆران گەرمیانی : مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ ،ل٢٠٤ .

[٤٧٦] خوسرەو جاف : س ، پ ،ل٤٤٦ – ٤٥٠ .

بەتایبەت لە(ماهیدەشت) بلاّو بوونەتەوە و لەویّ دەژین. نزیك بەسەد خێزانیان لەخاکی جوانڕۆ ماون، بەهاران و هاوینان لەناوچەی (شانیکان، کرە، کوێستانی بازان) مەڕو ماڵات دەلەوەڕێنن، پاپزو زستانیش لەداوێنی چیای (منج، چیگیران) بوون، هەروەها لە (سوورمڕ، رازان)ی ناوچەی زەهاو هەواریان دەخست. سەرۆکایەتی هۆزەکە پشتاو پشتە سەرۆکیان (فەتاح بەگی کوڕی وەڵەد بەگی کوڕی سەعیدبەگ)ە، ئەگەر چی هۆزەکە بەکردەوە بیّ سەر وسامانن بەلاّم لەگەڵ ئەوەش دا، گەورەیی و ترسیان دڵی عەشایر و ڕعیەتی دیکە نیشتووە، کە هۆزانی مەزن بەجاف و ئەوانی ترەوە ئەو پەڕی ئیتاعەیان (گوێڕایەڵی) دەکەن[٤٧٧]. لەبەگزادە ناسراوەکانی وەڵەدبەگی یەعقوب بەگی یەکەم، بارام بەگی گەورە، سەعید بەگی گەورە، ڕۆستەم بەگ، فەتاح بەگی یەکەم، سۆفی بەگ، حاجی یەعقوب بەگ، سەردار ئەمجەد، فەتاح بەگ کوڕی ئەمجەد بەگی یەعقوب بەگ[٤٧٨] .

## تیرەی بێویانی :

کۆچکردنی بێویانیەکان لەزێدی ڕەسەنی خۆیانەوە(جوانڕۆ) بۆ ناوچەکانی ئێلی گۆران بەسەرەتای قۆناغێکی نویّ و گرنگ لەژیانی ئەم تیرەیە دادەنرێت، پاش ئەوەی چەند تیرەیەکی تری جاف لەوناوچانە جێگربوون، دووبارە دەستیان بەژیانی کۆچەری کردەوە و بەجافی گۆران ناسران. هۆی کۆچکردنی ئەم تیرانەی جاف لەشوێنی ڕەسەنی خۆیان بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە :

---

[٤٧٧] میرزا شکرولاّ سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلاّن ، و ئەنوەر سوڵتانی ، چاپخانەی ژین —سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢— ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل ١١٩— ١٢٠.

[٤٧٨]ماڵپەری کوردپیدیا: عەشیرەتی جاف و تیرەکانیان ،٢٠١٣/١٠/٢٣ .

یەکەمیان: پەیدابوونی شەڕوشۆڕ و ململانێ لەنێوان جاف جوانرۆ و میرەکانی ئەردەلان، ئەوانەی کە گوشار و پاڵەپەستۆیان دەخستە سەر جاف جوانرۆ بۆ ئەوەی دەسەلاتیان کز بکەن و دەست بەسەر زەوی و کێڵگەکەیان بگرن .

هۆکاری دووەمیان: دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەسەرۆك هۆزەکانی گۆران بانگێشتی تیرەکانی جاف جوانرۆیان کرد و هانیان دا تا بۆلای ئەوان کۆچ بکەن، بۆ ئەوەی سود لەهێز و تواناکانیان وەربگرن بەمەبەستی بەرقەرارکردنی ئاسایش و ئارامی لەناوچەکەدا. جەنگاوەرانی بێویانی چەند بەتالیۆنێکی چەکداریان لەسوارە و پیادە لەنێو هێزی شەرکەری گۆراندا پێکهێنا، بەلام دوای ئەوەی ناکۆکی ناوخۆیی لەنێو سەرانی تیرەکە ڕوویدا، بووبە هۆی لاواز بوونی هێز و سامی بێویانیەکان .

ئەم تیرەیە لەنوسین و تۆماری قاجاریەکان ناویان بە(بی بیان، بیامە) هاتووە، کە لەناوچە ساردەکانی کوێستاندا لەنزیك تیرەی نێرژی و لەگەرمیان لەناوچەکانی زەهاو و بیبیان و شاوەلی نیشتەجێ بوون، ئێستا بەهۆی بڵاو بوونەوەی بێویانەکان ناتوانین شوێنێکی دیاری کراو دەستنیشان بکەین، بەلام پێشوو تر هەوارگەکانی جارانیان بۆ وەرزی زستان ناوچەکانی (بان لوادە، لەوەرگەکانی قزڵ زەهاو) بووە، زەوی زاری کشتوکاڵیشیان لەناوچەکانی شیمان (دوشیمان)، بونانی، قەلای زنجیر، بەلام هۆزەکانی قەڵخانی لەناوچەی داڵەهۆ دەستیان بەسەریدا گرت، هەروەها موڵك کێڵگەکانی ئەم تیرەیە بەهۆی دیاریکردنی سنوری عێراق– ئێرانەوە بوون بەدوو بەشەوە بەشێکی کەوتە دیوی عێراق و بەشەکەی تریان سەرۆك هۆزەکانی قەڵخانی لەئێران دەستیان بەسەردا گرت، بێویانیەکان ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ تیرەی دووڕۆیی[٤٧٩] .

مەیجەرسۆن دەڵێت: بیبانی (٤٠٠) ماڵن و (٧٠) ئەسپ سواریان هەیە، لەدوو گوند نیشتەجێن کەهەردووکیان پێیان دەڵێن (بیبانی) کەوتوونەتە سەر گردی (گوڕگوڕ) لەباکوری ڕۆژئاوای کەرکوك، هۆزێکی کشتوکاڵکارن و لەکاتی پشێویدا پەنا دەبەنە بەر

---

[٤٧٩] ماڵپەری مێژووی کورد : تیرەکانی عەشیرەتی جاف، ٢٠١٨/٧/٨ .

هـۆزی شـوان، سـەرۆکیان کوێخـا ئەحمـەد بـووە[٤٨٠]. بیـانی یـان بێویـانی، هەنـدێك ڕۆژبەیانیش بە بەشێك لەبێویانیەکان دادەنێن، ئەم تیرە لەبنەڕەتدا هەورامین، لەکۆنـدا بەشێوەزاری گۆرانی دەدوان، لەئێستادا بەشێوەزارەکانی کرمانجی ناوەڕاست و گۆرانی تا ڕادەیەك نزیك لەهەورامی قسـە دەکـەن، ئـەم هـۆزە زۆریـان کەوتوونەتـە ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان زۆرێکیـان لەناوچـەی دالـەهۆ نیشـتەجێ بـوون، دوای ئـەوەی ناکۆکیـان دەکەوێتە نێوانیان و پشت لەیەك تری دەکەن، دەرفەت بۆ خەڵکی قـەڵخانی ڕەخسـاوە بەپشتوانی ڕەزا شای بەهلەوی و دواتر محەمەد ڕەزاشا لە سەرووبەندی جەنگی جیهانی دووەم بێویانیەکانیان لەزێدی خۆیان دەربکەن، هـەر ئەمـەش بـوو بـەهۆی بلاوبنـەوەی خێزانەکانی بێویانی بۆ زۆرێك لەناوچەکانی باشوری کوردستان، کە هـەر لەکرماشـانەوە تا گەرمیان و خاسەی کەرکوك هاتوون لەناوچـەکەدا نیشـتەجێ بـوون، ئێسـتا بێویـانی لەڕۆژهەلاتی کوردستان لەسنوری پارێزگای کرماشان، جوانرۆ لەباشـوری کوردسـتانیش لەپارێزگای سلێمانی، کـەرکوك، گـەرمیان و دەوروبـەری نیشـتەجێن. هـەروەها بەشـێك لەبێویانـەکان لـەکۆتای سـالانی (١٨٠٠) زایـنی لەسـەردەمی فەیزولابـەگی بێویـانی بەشێوەی کۆچەری لەسەرقزلێ ژیاون، گوندەکە دەکەوێتە بنـاری شـاخی بێشـکان، لـەم گوندە شوێنەواری مێژووی زۆری تێدایە، دواتر لەساڵی ١٩٠٧ لەسەردەمی دایە خورشـە وەك گونـد ئاوەدانکراوەتـەوە کـراوە بەپایتـەختی سیاسـی و ئـابوری هـۆزی بێویـانی، ڕووبەری گوندەکە یازدە هەزار دۆنمە حەوت هەزار دۆنمی بۆ کوشتوکاڵ بـەکارهاتووە و چوار هەزار دۆنمی مەرعـە بـووە. بێویانیـەکانی لەچـەند خێـڵ و بـەرەبابێك پێکهـاتوون وەك: خێڵـی مـەڵك نـازدار، خێڵـی ئامـانوولا و خێڵـی ئەحمـەد زێـوا ئەمانـە لەبنەڕەتـدا لەخێڵی محەمەد ئەلا وەیسن، خێڵی باوەحاجی، خێڵی دووشەمیان، خێڵی مەڵکە، خێڵی محەمەد کەڵواری، خێڵی تـەیموری، خێڵـی حەمـە سمایلـە، خێڵـی زەکـی. بێویانیـەکان چەندین کەسایەتی دیاریان تێدا هەڵکـەوتووە وەك: فـەیزولا بـەگ کوڕی ڕەزا سـوڵتان

[٤٨٠] مێجەرئی .بی . سۆن : چـەند سـەرنجێك دەربـارەی هۆزەکـانی کوردسـتانی خـواروو، و نـەجاتی عەبدوڵلا ، چ١، چاپخانەی شڤان– سلێمانی، ٢٠٠٧ ،ل٤٢ .

بێویانی، حاجی پاشا کوڕی مەڵك، محەمەد کوڕی مـەڵك، حـاجی زۆراب کـوڕی ئـەمانولاّ فەرەج باوە، محەمەد وەلاّ وەیس بووە، مەلا عەلی کوڕی ئەحمەد زێوا، عەبـدولاّ کـوڕی کاکا کوڕی ئالیخان، مارف کوڕی قارەمان، مەڵك عەلی شێرخان، حاجی خانمراد کـوڕی فەتاح، حاجی ئەحمەد کوڕی شێخ فەیزولاّ، لەتیف سەفەر، کەریم کـوڕی فـەتحولاّ مـەلا ئەمین، عەبد عـەلی کـوڕی هەیـەر، مـارف کـوڕی هەیـەر، بـەختیار کـوڕی عـەلی مـراد، محەمەد کوڕی قادر، عەلی کوڕی سەیفولاّ، عەبدول محەمەد کوڕی عەبدولاّ .

ژن پێگەیەکی بەهێزی هەیە لـەناو تـیرەی بێویـانی، تائێستا ئاسـایە ژن لـەدێوخان لەسـەروە دابنشـێت، لـەدوای کۆچـی دوای فـەیزولاّ بـەگی بێویـانی خـاتوو خورشـیدەی هاوسەری کەهەم ئامۆزای بـووە ئـەرکی بـەڕێوەبردنی تـیرەی بێویـانی کەوتـە ئەسـتۆ، خاتوو خورشیدە کچی ڕەحمان بەگی محەمـەد وولاّ وەیسـی بێویانیـە لەسـاڵی (١٨٧١) زاینی هاتۆتە دونیاوە، خورشیدە سوارچاکێکی ئازا و نـاودار بـووە شـارەزایەکی باشـی هەبووە لەبەکارهێنانی چەك، خورشیدە لەبەر ڕێزی لـەناو بێویانیـەکان بەدایـە خورشـە بانگکراوە، هەروەها هۆزەکانی ناوچەی گەرمەسێر ڕێزی تایبەتیان لـەخاتوو خورشـیدە گرتووە، سەرنجی زۆربەی هۆزەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، ئەم ئافرەتە ڕۆڵـی پیـاوی گێڕاوە ئەمەش وای کردووە سەرنجی دامودەزگاکانی ئەو کاتی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، مەلیك غازی کوڕی مەلیك فەیسەڵ دووجار وەك ڕێزێك بـۆ ئـەو شـێرە ژنـە بـەپارێزگای دیالـەدا خـەلاّتی نـاردووە یـەکێك لەدیاریـەکان دەمانچـەیەکی گۆڵـد بـووە، هەرچـەندە خوێنـدەواری نـەبووە بـەلاّم زۆر شـەیدای خوێنـدن و نوسـین بـووە، بـە بـەردەوامی ئاشتەوای دەکرد لـەناو هۆزەکـان، ئەگـەر کـوڕ و کچێك ئەوینـداری یـەك بوونایـە دایـە خورشـە کـەس و کـاری هـەردووکیانی ڕازی دەکـرد مارەیـانی دەکـرد لەیـەکتری، دایـە خورشە لە(١٩٥٨/٢/٢٥) کۆچی دوای کردووە، پاش کۆچی دایە خورشە کوێخا (حەمید کوڕی فەیزولاّ بەگ ڕەزا سولّتان) دەبێتە برا گەورەی بێویانیـەکان دوای شـەهید بـوونی کوێخا حەمیـد لەسـاڵی (١٩٦٣) کوێخـا ڕەشـیدی بـرای دەبێـت سـەرۆك هـۆز تـا سـاڵی (١٩٨٧) دواتر کوێخا حوسێن دەبێتە سەرۆك تا ساڵی (٢٠٠٣) لەدوای ئـەویش مامۆسـتا

بەهمەن کوڕی شەهید کوێخا حەمید سەرۆك هۆزە تا ئێستا بەردەوامە، بۆ دیاری کردنی سـەرۆك هـۆز هـەموو ڕیـش سـپی و پیاومـاقولاَن کۆدەبنـەوە سـەرۆك هـۆز دیـاری دەکەن[٤٨١].

## تیرەی ئاغا وەیسی :

یەکێکە لـەتیرەکانی هـۆزی جـاف لـەجوانرۆ، پێشـتر دەوارنشـین بـوون و گـەرمیان و کوێستانیان کردووە هەمیشـە سـەرقاڵی ئاژەڵداری بـوون، لـەپێنج بـەرەبابی سـەرەکی پێکدێت بەرەبابی شەکر، بەرەبابی کاکەوەیس، بـەرەبابی نەزەر، بەرەبابی مرادعەلی، بەرەبابی عـەوەلی، سـەبارەت بەناوەکـەیان ئـەوان هـەر هـەموویان کـوڕی ئاغـا وەیسـی بچووکن، ئاغا وەیسی بچوك کوڕی میروەیسی ئاغا وەیسی گەورەیە، ناوەکەیشیان هەر لەمەوە هـاتووە، ئاغاوەیسـی گـەورە لەسـەرەتای سـاڵی ١٧٠٠زایـنی لـەجوانڕۆ هاتۆتـە دونیـاوە لەسـەرەتای سـاڵی ١٨٠٠ هـەر لـەجوانڕۆ کۆچـی



وێنەی ئاغاوەیسی گەورە
لە لایەن وێنەکێشی بەناوبانگ استاذ
( عدنان عبدالقادر الرسام ) ەوە کێشراوە

دوای کردووە، ئەم پێنج بەرەبابە لەسەردەمی عوسمانیەکان لەکۆتای ساڵی ١٨٠٠ زاینی لەجوانڕۆی زێدی ڕەسەنیان هاتوونەتە باشوری کوردستان، لەبناری بـەمۆ، دێهاتـەکانی سەر ڕووباری سیروان، قەڵەمە، تازەدێ نیشتەجێ بوون، لەدوای هەڵگیرساندنی جەنگی یەکـەمی جیهـانی و ڕووخانـدنی دەوڵـەتی عوسمـانی، بـەرەبابی عـەووەلی گەڕایـەوە ڕۆژهـەلاَتی کوردسـتان لەگونـدی تیلـەکۆ نیشـتەجێ بـوون، ئێسـتا زۆربـەیان لەشـاری کرماشان و ڕەوانسەر نیشتەجێن، چوار بەرەبابەکەی تر هەندێکی کەمیان لەسلێمانی و

[٤٨١] گفتوگۆیی نوسەر لەگەڵ تەهای کوێخا ڕەشید : ٢٠١٨/١١/١، کەلار .

عەربەت نیشتەجێن، ژمارەیەکی زۆریان لەشارەکانی کەلار و دەربەندیخان نیشتەجێن، لەئێستادا سەرۆکی ئاغاوەیسی کەریم محەمەد خەلیفەیە، ئەمانە کەسایەتی دیاری هۆزی ئاغا وەیسن حاجی جەلال حاجی فەیزوڵا، حاجی سابیری حاجی سەیفوڵا، مامۆستا عەزیز کەریم فەرەج. ئەم هۆزە لەچەند بنەماڵەیەکی دیار پێك دێت وەك بنەماڵەی: عەلی مرادی شەکر، عەزیز کاکەوەیس،محەمەد کاکەوەیس، خەلیفە ئەحمەد نەزەر، محەمەد نەزەر، سبحانی مراد عەلی، عەبدولڕەحمان مراد عەلی، لەگەڵ بنەماڵەکانی عەووەلی و هەندێك بنەماڵەی تر، سەرۆکایەتی ئەم تیرە لەساڵی ١٩٥١ تاساڵی ١٩٦٣ عەزیزی خەلیفە بووە، لەساڵی ١٩٦٤تاساڵی ٢٠١٥ محەمەد ئەحمەد نەزەر بووە، لەساڵی ٢٠١٧تا ئێستا کەریم محەمەد ئەحمەد ئاغاوەیسیە[٤٨٢].


کەریم محەمەد خەلیفە


حاجی عبدالله عزیز کاکەوەیس


سبحان مرالی ئاغاوەیس


عزیز احمد نەزەر
ناسرا بە عەزیزی خەلیفە

[٤٨٢] کەریم محەمەد ئاغاوەیسی : تیرەی ئاغاوەیسی و خێڵەکانی، پێداچوونەی بیلال جەلال حەداد، ٢٠١٧، ل١١– ١٢ .

## تیرەی ئیناخی:

ئیناخی تیرەیەکن لەجاف جوانڕۆ، باپیرە گەورەیان ناوی (عەلی ئێناخ) بووە، هەر لەبەر ئەوەیە ناوی (ئێناخ)ییان لێنراوە. ئەم تیرەیە ماوەیەکی زۆر گەرمیان و کوێستانیان کردووە، سەرەتا هەموو تیرەکە کۆزی زستانەیان لەمەڕەخێڵ، لانەوان، هەنجیرەك، ژاڵە، تەرگەڕان، کێلەکۆن، لەشکرگە بووە لەڕۆژهەلاتی کوردستان، لەکۆچ کردن بەدوای لەوەڕگەو سەرچاوەی ئاودا ڕویانکردۆتە ناوچەیەکانی لاران، پاوە، سەریاس، شمشێر لەساڵی ١٩٥٦ز بەدواوە، ئیناخیەکان بوون بەدوو بەشەوە، ئەوانەیان لەباشوری کوردستان نیشتەجێ بوون، بۆ کۆچی هاوینە ڕۆیشتوونەتە شنروێ، سەروەزەن، پشتقەلا لەدەوربەری ناوچەی سازان، ئەوانەیان لەڕۆژهەلاتی کوردستان نیشتەجێ بوون بۆهەمان لەوەڕگاکانی پێشوویان ڕۆیشتوون. ئیناخیەکان لەچەند بنەماڵە وبەرەباب پێکهاتووم وەك: سەلیم بەگی، ئەمیرخان بەگی، یەعقوب بەگی، ڕەحمان بەگی، ئێل بەگی، عوسمان بەگی، ڕۆستەم بەگی هەر بنەماڵەیە کیش ڕیش سپی و پیاوماقوڵی خۆی هەبووە. ئیناخیەکانی باشوری کوردستان لەگوندەکانی (لمە، قۆڵیمتان) لەسەر ئاوی سیروان نیشتەجێ بوون، ژمارەیەك خێزانیشیان لەگوندەکانی سازان، کۆساوا، کانی گوێز لەگەڵ دانیشتوانی تری ئەوگوندانە کەسەربە تیرەکانی ترن ژیاون. لە ڕۆژهەلاتی کوردستان شازدە گوندیان ئاوەدانکردۆتەوە لەوانە (لانەوان، هەنجیرەك، لەشکرگە، وارانجێ، مەڕەسان، ماسان، ژاڵە ،کێلەکۆن). ئیناخیەکان سەرەڕای نیشتەجێ بوون و دروستکردنی گوند هەتا ناوەڕاستی حەفتاکانیش بەردەوام بوون لە کۆچکردن بۆ هەوارگەکانیان لەناوچەکانی خۆیاندا. سەرچاوەی بژێوی (ئیناخیەکان) ئاژەڵداری و باخداری و کشتوکاڵە، لەبەر ئەوەی ناوچەکەیان لەسەرسنورە، لەڕووی بازرگانی و مامەڵەکردنەوە بایەخێکی گەورەی

هـــەبووە لـــەژیانی خەڵکەکەیـــدا، ژمارەیـــەکیان ســـەرقاڵی کاروبـــاری دەوڵەتـــداری و دووکانـــدارین. ئیناخیـــەکان تفەنگچـــی و نـــاودارن و زۆر حـــەزیان لـــە ڕاو شـــکارە، بەشـــێوەیەکی گشـــتی لەهەڵەبجـــەی شـــەهید و کۆمەڵگـــەی (ســـەریاس) لەڕۆژهـــەلاتی کوردستان نیشتەجێن، چـەندین خێزانیشـیان لە(هەڵەبجـەی تـازە، سلێمانی، ناوچـەی دەربەندیخان) نیشتەجێن، هاوینان بەمەبەستی خزمـەتکردنی باخـەکانیان باخـدارەکان بنەباخ دەبنەوە گوندەکانیان[٤٨٣]. تیرەی ئیناخی زۆر ئازا و بوێرن، چەندین سەرچـاوە ئاماژەی بەئازایەتی ئەم تیرەیـە داوە، دانـەری کتـێبی (تحفـەی ناصـری) یـەکێك بـووە لەئەڵقە لەگوێکانی داگیرکەرانی کوردسـتان و نوسـەری تایبـەتی (عـەلی ئەکبـەرخان)ی حاکمی جوانڕۆ بووە لەسەردەمی والیێ یەتی (معتمد ئەلدولە–فـەرهاد مـیرزای قاجـار)دا کە دۆسـتی ئیناخیـەکان نـەبووە، لەکتێبەکیـدا نووسـیویەتی (سـەلیم بـەگ)ی ئینـاخی لەگەڵ پڵنگێك لەشاخی شاهۆ ڕووبەڕووی یەك بوونەتـەوە، هەرچـەندە پڵنگەکـە دوازدە برینی کردۆتە جەستەی، بەڵام سەلیم بەگ بەخەنجـەر کوشـتوویەتی و داویـەتی بەسـەر پشتی وڵاخەکەیدا و بردوویەتی بـۆ (شـرف ئـەلملك) لەقـەڵای جـوانرۆ، ئـەویش خـەڵاتی کردووە و فەرمانی داوە بەچارەسەرکردنی برینەکانی، هەواڵی ئازایەتی (سـەلیم بـەگی) گەیاندۆتە (فەرهاد میرزا) مامەی (ناسرەدین شا) ئەویش خەڵاتی کـردووە. سەرچـاوەی ئەم تیرەیە لەسەر سنوری باشور و ڕۆژهـەلاتی کوردسـتان نیشـتەجێن، لـەدەور وبـەری ڕوباری سیروان دا نیشتەجێن، مەڕەخێڵ بەهەوارگەی ئەم تیرەیـە دەژمێـردرا، هاوینـان بـەرەو (لاران، سـەریاس، دەوروبـەری شمشـێر وپـاوە) ڕۆیشـتوون، ئـەم تیرەیـە بـەری شەش بـەرەباب بوونـە بـەناوەکانی (سـەلیم بـەگی، سلێمان بـەگی، ئـەمیرخان بـەگی، یاقوب بەگی، رۆستەم بەگی، ڕەحمان بەگی) دوو بەرەبابی دیکە لەناوچـەی ئینـاخی دا

---

[٤٨٣] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٧٨–٨٠ .

لەپێش (ئیناخ بەگەوە) هەر لەوێدا دەژیان وەك (عوسمانی وەلەدخان، ئیلەرووتی) ئـەم دوو بەرەبابە زستان بەسەر سیروانەوە دەژیان و هاوینانیش لـەنێوان جـوانڕۆ هـەورامان بوون. ئەدمۆنس دەڵێت: من ناوچەی ئیناخیم دیوە، ئەم تیرەیە جارجـار لەسـەر جـاف دەژمێردران، جۆری بەڕێوەبردنی ئەم تیرەیە لەناو خۆیاندا، بـەگزادەیان هەیـە و ئـەوان دەمڕاسـتی تـیرە و لێپرسـراوی کاروبـاری هـۆز بـوون[٤٨٤]. سـەید ئینـاخ نـاوی بـاپیرە گـەورەی ئیناخیەکانـە و لەنـەوەی پیرخـدری شـاهۆیە، سـەید ئینـاخ و یـەزدان بـەخش (شەمێرانەکان) برابوون، ناوچەکانی ئێناخی دەکەوێتـە سـەر سـنوری عێـراق _ئێـران و بەری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری سیروان، هەندێکیان سەربەشاری پاوەی پارێزگـای کرماشـان، هەندێکیان لەهەندێك گوند و ناوچەی پارێزگای هەڵەبجـە نیشـتەجێن، ناوچـەی ئینـاخی زۆرترین ئەشکەوتی تێدایە .

زۆرجار ئیناخیەکان لەگەڵ تیرەکانی دەوروبـەری تووشـی شـەڕ بـوون، بۆنمونـە لەگـەڵ ئیمامی شەڕ و دوژمنایەتیان حەوت سـاڵ درێـژەی کێشـاوە، شـەڕی ئیمـامی و ئینـاخی سەرەتا لەسەر بزنێك بووە حەفتا کەس کوژراوون لەبەینیان دا (چل کـەس لـەئیمامی و سی کەس لەئیناخی) هەتا لەشەڕێکدا (محەمـەد حەسـەن بـەگ) بـاوکی عوسمـان بـەگ سەرۆك هۆزی ئیمامی کوژراوە، بۆچارەسەرکردنی ئـەم کێشـەیە هـەموو سـەرۆك هـۆز و پیرەکانی ناوچەکە بەشداری دەکەن بەڵام ناتوانن ئاشـتەوایی لەبەینیانـدا بەرقەرارکـەن تا سەید عەبدلڕەحمانی هانەسوور دەڵێت ئیناخی سەیدن قسەی ئێمەیان قبوڵە ئێوەش بەئەمیری دەژمێدرێن نابێـت لەقسـەی ئێمـە دەرچـن، ئیمامیـەکانیش بەقسـەی دەکـەن شـەش کچـی ئینـاخی دەدەن بـە ئیمامیـەکان، ئـیتر ئاشـت دەبنـەوە[٤٨٥]. لەسـەدەی

---

[٤٨٤] خوسرەو جاف : س ، پ ،ل ٤٧٢ — ٤٧٣ .

[٤٨٥] خوسرەو جاف: س ، پ ، ل٤٧٨ — ٤٧٩.

(نۆزدە) لەپەنجا (خێزان) پێکهاتوو بوون لەناوچەی (جوانڕۆ)، کەسەر بەڕۆژهەڵاتی کوردستانی بوون، خەڵکی باج دەریان کەم بووە زۆربەیان بەگزادە بوون، لەوەڕگا و مەرزاو باخیان لەناوچەی (پاوە) هەبوو کەسەر بەجوانرۆیە، هاوینان ئەچوونە چیای (شاهۆ) لەوێ هەواریان دەخست، زستانە هەواریان لەمەڕە خێڵ و هەوارەمچی بوو، کوێخایەکی ناسراویان نەبوو، ناوەکەشیان چوون باپیرە گەورەیان (ئیناق بەگ) بووە، بەو ناوە ناسراوون[٤٨٦] . بەلأم ئێستا ژمارەیان زیادی کردووە و لەڕۆژهەلأت و باشوری کوردستان بلأوەیان کردووە .

## تیرەی کۆکۆیی :

کۆکۆیی تیرەیەکن لەجاف (جوانڕۆ) سەرەتا لەناوچەی جوانڕۆوە هەتاکو شاخی (شاهۆ، کۆیلە، ماکوان) و چەند هەوارگەیەکی هەورامانی ئەمدیو گەرمیان و کوێستانیان کردووە، پاشان دەستیان بەنیشتەجێ بوون کردووە و لەسەرەتای نیشتەجێ بوونیان دا لەوبەر ئاوی سیروان لەدامێنی کۆیلەو ماکوان و گوندەکانی (تین، ڕوان، سیمان، بەوڕۆڵ، گۆڕی گەورە) یان ئاوەدانکردۆتەوە. دەربارەی ناوی کۆکۆیی چەند بۆچوونێك هەن بەم شێوەیە: هەندێك پێیان وایە ئەم تیرەیە پێش نیشتەجێ بوونیان و لەکاتی گەرمیان و کوێستانکردندا کۆمەڵ کۆمەڵ ڕەشماڵیان هەڵداوە، لەبەرئەوە پێیان وتوون کۆکۆیی بۆچوونێکی تر هەیە پێی وایە ئەم تیرەیە لەکاتی گەرمیان و کوێستانکردن دا لەشاخێکەوە بۆ شاخێکی تر هەوارگەیان گواستۆتەوە، ئاشکرایە لەو ناوچانەدا بەشاخ

---

[٤٨٦] میرزا شکرولا سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلان،و ئەنوەر سولتانی، چاپخانەی ژین —سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،٦٨.

ئەوترێت (کۆ) لەبەرئەوە ناوی (کۆکۆیی)یان لێنراوە. چەند کەسێکی بەتەمەن و خاوەن ئەزموونی تیرەکە پێیان وایە، خەڵکانی تیرەکە یان سەرەتا لەکۆیەوە ڕۆیشتوونەتە (جوانرۆ) لەڕۆژهەلاتی کوردستان، لەوێ پێیان وتوون کۆمەڵێکی کۆیی، لەدوای دا وشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بەکۆکۆیی تیرەیی کۆکۆیی هاوسنورن لەگەڵ تیرەکانی (نەورۆڵی، ئیناخی، شەمێرانی،ئیمامی) بەشێوەیەکی گشتی لەسێ بەرەباب پێك دێت بەم ناوانە: بەرەبابی شاوەیس –بەرەبابی خولاوەیس – بەرەبابی مراوەیس . ناوچەی کۆکۆیی ماوەیەکی زۆر مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی سەر سنور بووە، چەند بازرگانێکی دیاریان هەبووە وەك (حاجی فەرەجی زەڕە، حاجی موشیر، حاجی بارام، حاجی ئەولکەریم عارف، کوێخا عەلی محەمەد حوسێن، حاجی محەمەد) ئەمەش کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر باشکردنی باری ژیان و گوزەرانیان. ناوچەی کۆکۆیی ئاودار و لەبارە بۆ باخداری، هەربۆیە چەندین پارچە باخی ڕازاوەیان هەیە لەگوندەکانی (چنار ـ چاوگ ،باوەکۆچەك). کۆکۆییەکان ئێستا بەشێوەیەکی گشتی لە(هەڵەبجەی شەهید) نیشتەجێن، بێجگە لەچەند خێزانێك کە گەڕاونەتەوە بۆگوندی (باوەکۆچەك) هاوینانیش باخدار و خاوەن ئاژەڵەکانیان بنەیەك دەبەنەوە ناو گوندەکانیان کەخۆیان پێی دەڵێن بنەباخ، چەند خێزانێکیشیان لەناو شاری سلێمانی نیشتەجێن[٤٨٧].

میرزا شکرولاً سنندجی لەنێوان سالانی (١٨٨٢–١٨٨٨) دەڵێ: سەرۆك و کوێخای ئەم هۆزە زۆر جار لەبەگزادەی (ئیناخی) بوون، پێشتر تایفەیەکی زۆر بە پایەو ڕێزبوون، بەلام بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار لەیەك بلاوەیان کرد، هەندێکیان لەباشوری کوردستان لە گوندەکان دا نیشتەجێ بوون و بەشێکی دیکەیان وەك جاری جاران لەناو ئێلی جاف دا بەدەوارنشینی ماونەتەوە و بوونەتە بەشێك لەئێلی جاف لەگەڵ ئەوان دا گەرمیان و

[٤٨٧] ئەیوب ڕۆستەم : هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٨١ – ٨٤ .

کوێستان دەکەن، ئێستا نزیکەی سی خێزانێکیان لەخاکی جوانرۆ ماونەتەوە، لەبەهار و هاوین و لەدووشوێنی (ماکوان، کۆیلە) هەوار دەخەن، لەپایز و زستانیش لەگەرمەسێری (نمرەساوەند، گۆڕی گەورە) مەڕو مالآت دەلەوەڕێنن، ڕوون نیە تا ئێستا کەسێکی ناسراویان لێ هەڵکەوتوە یان نا. هۆی ناونانیان چونکە لەسەردەمی بەهارو هاوین دا هەر دوو سێ ڕۆژ لە شوێنێك ئاژەڵ دەلەوەڕێنن و زوو زوو ئەم کێو و ئەو کێو دەکەن، ئیتر بەکۆکۆیی ناویان دەرکردووە[٤٨٨]. کەریم بەگی فەتاح بەگ لەکتێبی تەئریخی جاف دا دەڵێت: تیرەی زەردووی و کۆکۆیی هەمیشە پێکەوە بوون و لەبنەچەدا یەکن، مەیجەر سۆن کە ماوەیەك لەماڵی وەسمان پاشای جاف دا وەك (میرزا بنووس) ژیاوە دەڵێت: کۆکۆیی تیرەیەکە لەهۆزی جاف. ئەم تیرە وەك تیرەکانی تری جاف لەنێوان کوردستانی ڕۆژهەلآت و باشور بوونەتە دوو بەشەوە بەشێکیان هەر لەدەڤەری جوانرۆ ماونەتەوە بەشێکی تریان لەگەڵ کۆچەکەی زاهیر بەگی جاف هاتوونەتە ژێر دەسەلآتی میرنیشنی بابانەوە، هەندێك لەم تیرەیە لەکوردستانی ڕۆژهەلآت لەهەورامانی تەخت نیشتەجێن،بەشێوەیەکی گشتی تیرەی کۆکۆیی جگە لەتێکەلآوی زەردوویی لەگەڵ ئیناخی و ئیمامی و نەورۆڵی و شەمێرانیدا پەیوەندی پتەویان هەیە و لەدەڤەری جوانرۆدا لەگەڵ باوەجانیەکان دا تێکەلآون. ئەم تیرە لەدوای نیشتەجێ بوونیان بایەخێکی زۆریان داوە بە مزگەوت و خوێندن، هەر لەکۆنەوە مەلای زۆریان تێدا هەڵکەوتووە، ژمارەیەکی زۆر بڕوانامەی دوکتۆرا و ماجستێر و بەکالوریۆس و دەرچووی پەیمانگای لێیە، بەپێی زانیاری لەساڵی (٢٠١٣) دەرچووی زانکۆیان بەکوڕ و کچەوە (٥٠٤) کەسە، خوێندکاری زانکۆیان (١٥٤) کەسە، سەرووی ناوەندی (٢٥٠) کەسە،

---

[٤٨٨] میرزا شکرولا سنندجی : هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلان ، و ئەنوەر سولتانی ، چاپخانەی ژین –سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل ١١١– ١١٢.

(٦٥) کچی کۆکۆیی هەڵگری بڕوانامەی ئەکادیمیە (١٧٠) کچی کۆکۆیی مامۆستای قوتابخانەکانن[٤٨٩].

## تیرەی باوەجانی :

باوەجانی یەکێکە لەتیرە گەورەکانی هۆزی جاف، لەسەرەتای دەسەڵاتی قاجاریەوە باوەجانی لەدۆڵەدەرەدا دەژیان، کەناوچەیەکی بەردەڵانی دوور لەکشتووکاڵی بوو، بەڵام پڕبوو لە لەوەڕی ئاژەڵان، کاتێك حەبیبوڵلاخان دەبێتە سەرۆکی باوەجانی جێگەو شوێنی تیرەکە دەگۆڕێت و زەوی زاری کشتووکاڵی دەخاتە ژێردەستیان.

باوەجانی لەچەند تیرە و بەرەبابێك پێکهاتووە وەك: عالی: هاوینان دەچوونە تاڤگەی چیای سارابەند و زستانانیش دەگەڕانەوە بۆ دەشتەور و خانەشۆر، کشتوکاڵی گەنم و جۆیان دەکرد. قوچاڵی: لەدۆڵەدەرەدا دەژیان و دەچوونە خانەشۆر و تەختەقاپۆ. حەمدە: لەملەتولات و دەشتەور دا دەژیان. میروەیسی: لەدەشتی حور و خانەشوردا نیشتەجێ بوون. تەمەرخانی: لەدەشتی ور و تەمەرخانی دا نیشتەجێ بوون. خەسرەو باشە: زستانان دەچوونە گاورە، هاوینان میرئاباد. میرئابادی: لەمیرئاباد و تەختە قاپۆدا نیشتەجێ بوون. بەگزادە: هاوینان لەگوندی لوشە زستانانیش لەسەرتاوەیرە بوون. ئەعزەم خان: زستانان لەهولەدا بوون و هاوینان دەچوونە دامێنی چیای سارابەند. تەپان: لەگوندی تەپاندا دەژیان لەئێستادا خۆیان بەتیرەیەکی سەربەخۆ

---

[٤٨٩] خوسرەو جاف: س ، پ ،ل ٢٢٣ – ٢٢٥ .

دەزانن. زمکانی: هاوینـان لەگونـدی نەیرێـژدا دەژیـان و بـەدوای دەوڕگـا دەچـوون بـۆ ناوچەی جیگیریان[٤٩٠]. ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە سەر (باوەجان) ناوێك، کە لـەڕابووردا بەبەشـێك لـەئێلی (جـاف) دەژمێـران، هـەموو ئێلـی جـاف لـەڕابردوو سـەردەمی زوودا خەڵکی ناوچەی (جوانڕۆ) بوون. زۆربەی مـەرزا و لەوەڕگـەی هـاوین و زسـتانیان بـریتی بوو لەگوندەکانی (بلەبزان، گەلاڵ ، کلاش، نەورۆڵ، سریاس) پاشان بەچەرخی زەمانـە هـەلاّتوون و زسـتانیان لەگـەرمیانی (زەهـاو) هاوینیـان لەکوێسـتانەکانی کوردسـتانی ڕۆژهەلاّت بردۆتە سەر. لەنێوان سالاّنی (١٨٨٢–١٨٨٨) هـۆزی (باوەجـانی) گـرنگترین ڕەعیەتی ناوچەی جوانڕۆ بوون، لەنێوان (حەوت سەد تا هەشت سەد) خێزان دەبـوون، هاوینـان لەکوێسـتانەکانی (جـوانڕۆ) بـوون، زسـتان لەهەوارگـەی سـنوری ئێـران دا دەسوڕانەوە، نزیکی دووسـەد خێـزان لـەو حـەوت سـەد خێزانـە بـەناوی (قوبـادی)ەوە ناسراوون، بەلاّم لەبەر ئەوەی تێکەلاّوی هۆزی باوەجانی بـوون بـەکردەوە بـەباوەجانی دەناسران، زستان و هاوین لەنزیك لەوەڕگـەی باوەجـانی، لەوەڕگـەی تایبـەت بـەخۆیان هەبوو[٤٩١].

---

[٤٩٠] خوسرەو جاف: س ، پ ، ل٤٨٥ –٤٨٧ .

[٤٩١] میرزا شکرولاّ سنندجی : هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردسـتانی ئـەردەلاّن، و ئـەنوەر سـوڵتانی، چاپخانەی ژین–سلێمانی ، چ١ ، ٢٠٠٦ ،ل ٨٢– ٨٣ . خوسرەوجاف : س ،پ ،ل٧٢–٧٤ .

## خێڵی باوە:

خێڵی باوە تیرەیەکن لەجاف جوانرۆ سەرەتا لـەخۆرئاوای جـوانرۆ لەگونـدەکانی (دوو توێ، شەردێنە) یان ئاوەدانکردۆتەوە، ماوەیەك لەو دوو گوندە نیشتەجێ بوون، کاتێك ژمارەی دانیشتوانی زیادی کردووە لەبەر ئەوەی خەڵکێکی لێهاتوو و دەسترەنگین بوون و شارەزایی زۆریان هەبوو لەدروستکردنی (بەرداش و دەسـتهاڕ)دا کـە لـەو سـەردەمەدا بایەخێکی گەورەیان هەبووە بۆ هاڕینی دانەوێڵـە، لەلایـەن (حـەبیبولاخانی قوبادیـە)وە کەسەردار و دەست ڕۆیشتووی (قوبادی، باوەجانی) بوو ناوچەیەکی کشتوکاڵی بـەناوی (ناراو، بێڵەتاو) لەم گوندانە (گۆڕاوکێ، پشـتماڵە، بەشـی سـەیمراد، بانـەگاری گـەورە، ناراوی سەروو،ناراوی خواروو ،چەمەنزار، سوور مەر، گەناو، کۆزەران، سـەرابی بەسـی، زلان، تـەپان، بـانیمیران) نیشـتەجێ بـوون، هـەروەها چـەند خێزانێکیـان لـەناو شـاری (جوانرۆ) و لەشارۆچکەی (تازەئاوا= تازەئاباد)ی کوردستانی ئێران نیشـتەجێن. خێڵـی باوە لەچەند بنەماڵە پێکدێت بەم ناوانە (بنەماڵەی قـازی، بنەماڵـەی بابـابی، بنەماڵـەی ئەڵماسی، بنەماڵەی جەمشێری، بنەماڵەی بـاوەلێ، بنەماڵـەی داودی، بنەماڵـەی کوێخـا فەتاح، بنەماڵەی نـەویجانی، بنەماڵـەی وارانـی، بنەماڵـەی قـادری، بنەماڵـەی جەلیلـەی باوە) ئەم خێڵە لەوەرزی زسـتان لـەخانووی نـاو گونـدەکانیان ژیانیـان بەسـەربردووە، بەڵام بۆ بەسەربردنی وەرزی هاوین و دابینکردنـی لـەوەڕ بـۆ ئاژەڵـەکانیان، بەشـێکیان ڕوویانکردۆتە شاخی (شـاهۆ) و ناوچـەکانی (سـەریاس) و دەوروبـەری پـاوە. بەشـێکی تریان بـەرەو (تەپەڕەشـی زەهـاو، بـاخی سـەیخان) هـەتا (ملـەی سـەرتەك، خـەرکنێ، چوارکلاو) ڕۆیشتوون، ئەو ناوچانە لەکاتی کـۆچ و کۆچـباری دا لەچـوار چـێوەی قەڵـەم ڕەوی (عوسمانی) بوون، هەندێکیانیش لەچوارچێوەی قەڵەم ڕەوی (ئێرانی) بوون، ئـەو بەشـەیان کـە هەوارگـەکانی هاوینـەیان لەسـنوری قەڵـەم ڕەوی (عوسمـانی) بـووە، لـە

ناوچـەی بنـاری بـەمۆ ئـەم گوندانـەی دروسـتکردووە (بەلەسـۆ، چـواردارانی سـەروو، چواردارانی خـواروو، کانیوەیسـکێ، کـانی پاشـا، تووەوشـکێ، بـەڕوێن) پاشـان چـەند خێزانێکیـان ڕوویـان کردۆتـە (عازەبـان، جەلیلیـە، گیلـدەرە) ئەوانـەیان لـەعازەبان نیشتەجێ بوون پێیان دەوترێ (وارانی)، ئەوانەی جەلیلەش پێیـان دەوتـرێ (جەلیلـەی باوە) هەر چەند خێزانێکیان لە(دەربەندی دەهۆڵ) لەنزیك قەسری شیرین دەژین، پێیان دەوتری بنەماڵەی (عەبدولاّ خدر دووتوێی).ژمارەی خێزانەکانی خێڵی باوە زیـاتر لـەدوو هـەزار و پێـنج سـەد خێـزانن سەرچـاوەی بـژێویان بریتیـە لەئاژەڵـداری و کشـتوکاڵ لەسنورێکی بەرتەسکدا، ناوچەکەیان بەشێوەیەکی گشتی شاخاویە، لەزسـتاندا سـارد و لەهاوین دا کەش و هەوایەکی مام ناوەندی هەیە، خێڵی باوە گورج و گۆڵ و ڕۆحسـوکن و حەزیان لەکارکردن و ڕەنجدانە[٤٩٢].

## تیرەی ئیمامی :

لەبارەی ڕەگەز و ناوی تیرەکان داستان زۆرە، یەکێك لەو داستانانەی لەبارەی ڕەگەز و ناوی ئیمامی دەڵێت: باپیرە گەورەی ئیمامیەکان کەسێك بووە بەناوی (ئیمـام) خـەڵکی شاری ئەسفەهان بووە، پێش دەسـەڵاتی سـەفەویەکان شـاری ئەسـفەهان و دەوربـەری سونی مەزهەب بـوون، کاتێـك شمشـێری دەسـەڵاتی سـەفەوی دەکەوێتـەکار و بـەزۆری کوشتن وبرین، خەڵکی دەکەنە شیعە مەزهەب، ئەم (ئیمـام) نـاوە زۆر بـەوە نیگـەران و پەرێشان دەبێت، بەزۆر بکرێتە شیعە و واز لەمەزهەبی خۆی بهێنێـت، لەوکاتـەدا سـەید

---

[٤٩٢] ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە ، چ١ ، ٢٠٠٣ ،ل ٧٧-٧٨.

محەمەدی میر عەبدوڵلاَ یەکێك بووە لەسوارەی ناوچەی جوانرۆ و لە لەشکری دەوڵەتدا دەبێت، لەگەڵ (ئیمام) دەبێتە دۆست و ئاشنا ئیمام باسی دەردی دڵی خۆی بۆ دەکا و داوای ڕێنمای لێدەکا (سەیدمحەمەد) لەوەلاَمدا دەڵێت: هەستە لەگەڵما وەرە بۆ جوانڕۆ ، لەوێ ژنێکت لێ مارە دەکەین، ناوی خانمە و برازامە لەوێ بەئازادی مەزهەبی خۆتیش ناگۆڕیت و ترس و تۆقاندنیش لەگۆڕێکدا نیە، ئیمام لەگەڵ سەید محەمەد بەرەو دەڤەری جوانڕۆ دەکەوێتە ڕێ و سەید محەمەدیش خانمی برازای لەئیمام مارەدەکا و دوو جێگەی بۆ تەرخان دەکات .

ئیمام لەخانم حەوت کوڕی دەبێت، بەلاَم شەشیان بەهۆی نەخۆشی جۆراوجۆر دەمرن، ئەوەی دەمێتەوە ناوی عەلی دەبێت، لەو (عەلی)ە حەوت کوڕ دێتە دونیاوە، بەناوی (میرزا، ڕۆستەم،ئاقا ،محەمەد، حەیدەر، سەفەر، مستەفا). لەمیرزا: بەرەبابی عومەریەکانی کلور پێکدێن. لەڕۆستەم: بەرەبابی فەقێ و مەحمودی کانی سالار پێك دێت. لەمحەمەد: کەنیشتەجێی لاوەران بووە، بەرەبابی لاوەرییەکان دێتە کایەوە. لە حیدەر: کوڕی نەبووە تەنها کچێکی لێکەوتۆتەوە. لەسەفەر سێ کوڕی بووە بەناوی میکایل، سمایل، ئەحمەد. ئاقا: هیچ نەوەی لێ نەکەوتۆتەوە. مستەفا: لەناوچەی ئیمامیدا نەوەکانی نیشتەجێ بوون .

ئیمامییەکان لەسەر سنوری باشور و ڕۆژهەلاَتی کوردستان نیشتەجێن، لەو سنورەدا کێشە و هەرای سەیریان بۆ دروستکراوە[٤٩٣] .

---

٤٩٣ خوسرەو جاف: س ، پ ،ل٥١٦ — ٥١٨ .

## تیرەی قادر میروەیسی :

ئەم تیرەیە بەشێوەیەکی بەربڵاو لەزۆرێك لەناوچەکانی جاف بەدی دەکرێت، هەرچەندە لەسەر جافی جوانرۆ دەژمێردرێن بەڵام لەنێو جافی موڕادی وەك تیرەیەك حسابیان بۆ دەکرێت، لەڕۆژهەڵات لەناو هۆزی کەڵهوردا هەندێکیان هەن و بەتیرەی (بەوداق بەگی) ناسراون، لەکۆندا کوێخا حەسەن قادر میروەیسی سەرۆك خێڵیان بووە، ئەم تیرەیە هاوینان دەڕۆیشتنە (شانەڕەش) و زستانان دەگەڕانەوە ناوچەی سەرقەڵا، دوا کوێخای ئەم تیرەیە عەلی حەسەن بووە. دەڤەری گۆران حەوت سوڵتانی هەبووە، لەوحەوت سوڵتانە چواریان لەجاف هەڵبژێردراون ،یەکیان قادر میروەیس بووە، جێگەی ئەم تیرەیە سەرقەڵا و جێگرانە، کوێخا عەلی حەسەن پور کوڕی عەلی قادربەگ یەکێك بووە لەدەم ڕاستانی ئەم تیرەیە [٤٩٤].

**قانعی شاعیر دەربارەی هۆزەکانی کورد بەم شێوەیە دەدوێت :**

کوڕگەل کوردستان هەرئەو بانەیە
هەرئەو کەژوکێو هەرئەوشانەیە

لەگوڵ وبولبول لە پڵنگ لە شێر
پێدەگەیەنێ ئازاو دەنگ دلێر

یەکێ وەك بابان یاوەك ئەردەڵان
وەکیلی میلەت یانی کەریم خان

میری لوڕستان بەگزادەی کەڵهوڕ
فازلی کوردی هەروەك دانەی لوڕ

سمکۆ و ساداتی نەهری و شەمزێنی
لەغیرەت ئەوان هەزار ئافەرین

---

[٤٩٤] خوسرەو جاف : س ، پ ، ل ٥٢٧.

هەركی و كاله مومامش و زەرزا
هۆزی گەورك و بەگزادەی بانە

خانانی سەقزلە ئەردەلأنە
لەكۆن وتازە بەگی مەریوان

ئاغای کۆماسی سانی هەورەمان
جـــوانــڕۆ ولـــهـــۆن و هـــەتا ئیـناخی

مەنمی وباجەلأن هۆزی گەڵباخی
ئـــاغـــای درەی مـــیری شـــەقـــلأوە

جاف وهەمەوەند، خانی شێراوە
شێخ بزنی شوان، شێخی تاڵەبان

شێخانی ئیرشاد، یانی کەسنەزان
پـــیـــری تـــەویــڵـــەو شــێخـــی بیارە

بـــامـــنیش نـــەلێم لـــەگشـــت دیارە
شێخی بەرزنجە، ساداتی کیرام

گشت کێ کوڕی کێ، نەوەی نێکنام
میری میراودەل، بەگزادەی پشدەر

ئـــاغـــایانـــی کـــۆ شیــێری پڕ هـــونەر
عەشیرەتی بلباس ، هۆزانی ئەلۆەند

پارچەی نەورۆلی و لاوانی پەسەند
سورسوورو گەشکی سەنجەری نەڕان

لەرۆژی جەنگا وەك شێر دەنەڕان
زەنگنە و شیلانەو کاکەیی وگۆران

داســنــی وفــەیــلی یــاهۆزی سۆران
قەڵەوزی و شێخان، شێخی جەباری

تاگۆزی ومەلکەر شیری دیاری
گەورك ومەنگورخانی تیلەکۆ

هەوشار و سەرپێڵ تاوالی پشتکۆ
مــیری کــرمــانشا یانی میر کۆڵ

زەنــد ودوادە عشــیرەتـی گــــل
ئاغای شێوەکەڵ هۆزی کافرۆش

یامیرانبەگی و شێخی کۆنە پۆش
لەکو قەراوڵ جنگنی و هورمزیار

یــائاغا سوری تێغــی جەوهەردار
ناوداری و یالان غەوارە و باشکی
بالە کیو وەجاخ سویسنی و شینکی
یـــاجــافـــەڕەشــکـــەو کــەڵـوێو وئاکۆیی

بـنـچـنـەی کـوردان هـۆزی مـامۆیی
جەلالی و زرار بێسەری و چوچان

گێژو جەباری دەڤەری بارزان
بەرازی و سوسوهۆزی قەڵخانی

میری میرەجاف بەگی شیروانی
تیرەو ڕەگەزی کوردو کوردستان

ئەوەندە زۆرە ، نایەنە بەیان
من چیم نوسیووە هەزار یەك نابێ

توولی نادەمێ ئیتر كۆتابێ.[٤٩٥]

[٤٩٥] كەریم زەند : سوری ژیان ، چ١ ، كوردستان– سلێمانی ، ٢٠٠٣ ،ل ٣٥١–٣٥٣ .

*قانع: نـاوی تـەواوی محەمـەدی كـوڕی قـادری شـێخ سـەعیدی دۆلاشـە، لەسـاڵی ١٨٩٨ز لەگونـدی (ڕیشێن)ی شارەزوور لەدایك بووە، لە ١٩٦٥/٥/٧ز كۆچی دوایی دەكات .

## لیستي سەرچاوەکان

### سەرچاوە کوردیەکان :

١– ئـازاد مـام وەلـی: هـۆزی گـەلاڵی لەبزوتنـەوەی ڕزگـاری خـوازی کوردسـتاندا ، چ١، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی، ٢٠٠٨.

٢– ئارام عەبدولواحێد: مێژووی گوندی یالأنقۆز و نەوەکانی ،چ١، ٢٠١٠.

٣– ئـاری نانەکـەلی: چـەردەیەك لەمێـژووی هـۆزی نانەکـەلی، گۆگـڵ بەشـی مێـژووی کورد،٢٠١٨/٤/٤

٤– ئی ،جەی .ئار: هۆزەکانی کورد ، و حسێن ئەحمەد جاف ، چ١ ، ١٩٨٥ .

٥– ئەیوب ڕۆستەم: هۆزی وەلّی لە ڕابوردوو و ئێستادا ، چاپخانەی بابان ، چ١ ، ٢٠٠٨ .

٦– ئەیوب ڕۆستەم: هەگبە و هەوارگە، چ١ ، ٢٠٠٣ .

٧– ئەکبەرحاجی ڕۆسـتەم ئۆمـەربلی: دانـانی بناغـەی دێ ئۆمـەربل ،چ١، بەشـی دووەم، ٢٠١٠ .

٨– بێستوون شەوکەت: عەقڵی خێڵ ، چ١ ، ١٩٩٩ .

٩– تەحسین شێروانی: هۆزی شێروانی لەمێژوودا ،چ١ ، ٢٠١٠.

١٠– حەسەن مەحمود حەمەکەریم: کابانی کوردی، چ٣، ١٩٩٨.

١١– حەسەن ئەرفەع: کوردەکـان ،و سـامان عبـدوولا ،چ١ ،چـاپخانەی گـەنج–سـلێمانی ، ٢٠٠٩ .

١٢– حەکیم مەلا سالّەح: هەڵەبجە لەئامێزی مێژوودا ،چ٢ ، چاپحانەی چوارچرا – هەولێر ، ٢٠١١.

١٣– حسێن ئیسماعیل خان دەلۆ : ناوچەی کفری لە نێوان سالانی ( ١٩١٤– ١٩٤٥) ، چ١ ، ٢٠١٠ .

١٤– حەمید گەردی: هـۆزی گـەردی لەبنەڕتـدا ، چ١، بـەرگی دووەم ، هـەولێر ،چـاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری ،٢٠٠٨.

١٥–حەسەن فەهمی بەگی جاف: مێژووی هۆزی جاف و محمود پاشای جاف ، چاپخانەی —دێکان ، چ١ ، ١٩٩٤ .

١٦– حەبیبولاّی تابانی: هاونەتەوەی قەومی کورد وماد، و/جەلیل گادانی، ٢٠٠٦.

١٧– جەلالەدین شافعی کورد: جوگرافیای تاریخی کوردستان، چ١ .

١٨– خوسرەو جاف: مێژووی جاف ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی– هەولێر ، ٢٠١٣.

١٩–خالد مەحمود کریم: دەوڵەتی عوسمانی و عەشیرەتە کوردەکان لەکوردستانی باشور ١٨٦٩–١٩١٤ ،چ١ ، ٢٠١٢ .

٢٠–خوسرەو جاف: مێژووی جاف ،چ١ ،چاپخانەی هێڤی– هەولێر ، ٢٠١٣.

٢١–دارا تۆفیق کاکەمین: ناوچەی پشدەر لەسەری پاشایەتیدا ، چ١ ،٢٠١١ .

٢٢– زرار سدیق تۆفیق(د): هۆزو دەسەلاّتە هۆزەکیە کوردەکانی چاغی ناوەڕاست ، و ئیدریس عەبدولاّ مستەفا ،چ ١ ،چاپخانەی هاوسەر ، هەولێر ، ٢٠١٠ .

٢٣– ساڵەح هەلاج: چەردەیەکی مێژووی دەڤەری گەرمیان ، چ١ ، ٢٠١١.

٢٤–سەید هاشم ئەحمەد سەید محەمەد: یاداشتەکانم لەکفریدا لەنێوان سالآنی (١٩٤٠–١٩٦٠)، چ١ ، ٢٠٠١ .

٢٥– سەعد فارووق یوسف شێخ بزێنی: هۆزی شێخ بزێنی، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠١٦ .

٢٦–سهیل خورشید عزیز : مێژووی ناوچەی کفری ، چ١ ، چاپخانەی یاد ، ٢٠١٣.

٢٧–شەرەف خانی بەدلیسی: شەرەفنامە ،و مامۆستا هەژار ،چاپی سێ یەم ، ٢٠٠٦.

٢٨– د. شاکر خەسباك: کورد و مەسەلەی کورد ،و ئەمجەد شاکەلی ،چ١ ، ٢٠٠٥.

٢٩– ساڵح هاروونی: هاروونی لەمێژوودا ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠١١ .

٣٠–عاسی کاکەیی: کوردو چەند بابەتێکی مێژووی ، چاپخانەی ئەرابخا ، کەرکوك ، چ١ ، ٢٠٠٦ .

٣١– عەلی نەقی ئەلحوسینی: مێژووی٦٤١ساڵەی فەرمانڕەوای ئەردەلآنیەکان لەناوچەی کوردستانی ژێر دەسەلآتی ئێران، و ئاسۆس هەردی ، چ١ ،سلێمانی ، ٢٠٠٢ .

٣٢- م. علائەدین سەجادی: مێژووی ئەدەبی کورد ،چ١.

٣٣- عەلی ڕەزا گۆدەرزی: ئێلی کەڵهوڕ لەسەردەمی مەشرووتە، و محسن بنی وەیس، ٢٠١٣ .

٣٤- عەباس سلێمان سمایل: لورستان لەمێژودا ، چ١ ، ٢٠١١.

٣٥- عەبدوللاّ عەلیاوەیی (د) ود. مەولود ئیبراهیم حەسەن هتر: ئینسکلۆپیدیای هەولێر ، چ١ ، لوبنان ، ٢٠٠٩ .

٣٦- عەبدولقادر شکاك: جوگرافیای مێژووی عەشیرەتی شکاك ، چ١، ٢٠١٥.

٣٧- د. فەرهاد پیر باڵ: کورد لەدیدی ڕۆژهەلاّت ناسەکانەوە، چ١ ،٢٠٠٩ .

٣٨- کەریمی فەتاح بەگی جاف: تەئریخی جاف، چ١ ، ١٩٩٥ .

٣٩- کەریم محەمەد ئاغاوەیسی: تیرەی ئاغاوەیسی و خێڵەکانی، پێداچوونەی بیلال جەلال حەداد، ٢٠١٧.

٤٠- کاروان عوسمان عەلی: ئاوڕێك لەهۆزی گێژ لەدیادنامەی حاجی خەلیل گێژ، چ١، ٢٠١٠ .

٤١-کەریم ئاغایی هەمەوەندی: هۆزی هەمەوەند و بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردایەتی لە ١٧٨٧- ١٩١٨ ،چ١ ، ٢٠١٠ .

٤٢-کلودیوس جێمس ڕیچ : گەشتنامەی ڕیچ بۆکوردستان ، و محەمەدحەمەباقی ، چ٣، هەولێر ،٢٠٠٢ .

٤٣- کەریم ئەحمەد عەزیز: کەشکۆڵی مێژوو، چ١، ٢٠١٣.

٤٤-کریم زەند: سوڕی ژیان ،چ١ ، سلێمانی ، ٢٠٠٣ .

٤٥- کەریم زەند :جوگرافیای کوردستان ،چ٢ ،٢٠٠٥ .

٤٦- کۆمەڵێك نوسەر: عوسمانیەکان ، و سەلام عەبدلکریم ، چ٣ ، سلێمانی ، ٢٠١١ .

٤٧- د.مستەفا جەواد: هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانیە بەناوبانگەکان، و هەژار موکریانی، چ٢، ٢٠٠٨ .

٤٨– د.مستەفا جەواد: عێلی جاوان عێلی لەبیربراوە و ناودارانی لەبیرنەماو، و م جەمیل ڕۆژبەیانی، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠١.

٤٩– مارف خەزنەدار (د): مێژووی ئەدەبی کوردی ، بەرگی یەکەم ،چ١ ، هەولێر ، ٢٠٠١

٥٠–مارتین ڤان برونەست: ئاغاو شێخ ودەوڵەت ، وکوردۆ ، بەرگی یەکەم ،چ٢ ، سلێمانی ، ١٩٩٩.

٥١–محەمەدئەمین زەکی بەگ: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان لەزۆر قەدیمەوە تا دەوری ئەمرۆ، بەرگی چوارەم ، چ١ ،هەولێر ، ٢٠٠٦.

٥٢– محەمەد مەردۆخی: مێژووی کوردو کوردستان، و زانەر محەمەد،چ١ ،چاپخانەی ڕۆژهەلأت–هەولێر، ٢٠١١.

٥٣– محەمەدعبدولرحمان زەنگنە: مێژووی هۆزی زەنگنە ،چ١ ،١٩٨٠ .

٥٤– محمود عزیز حەسەن: کورتەك لەمێژووی هۆزی جاف و باسی هەندێك لەتیرەکانی ، چ١ ، ١٩٨٥ .

٥٥– محمود ئەحمەد محەمەد: میژووی هۆزی بڵباس لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ،ب١،چ١،سلێمانی ١٩٨٩ .

٥٦– میرزا شکروڵا سنندجی: هۆزو تیرەو تایفەی کورد لەکوردستانی ئەردەلأن ،و ئەنوەر سوڵتانی ،چاپخانەی ژین–سلێمانی ،چ١ ، ٢٠٠٦ .

٥٧– مستەفا نەریمان: شۆڕیی براهیم خانی دەلۆ لەبنج و بناوان و لق و پۆپەوە ،چ١ ،١٩٨٥ .

٥٨– مەریوان حاجی ئەحمەد والە هەمەوەندی: میژووی ڕەچەڵەك و ناودارانی هۆزی گەورەی هەمەوەند ، بەشی یەکەم ،چ١ ، ٢٠١٢ .

٥٩– مەلا سۆران گەرمیانی: مێژوو و ڕەچەڵەکی جاف ،چ١، ٢٠١٨ .

٦٠–مێجەرئی .بی . سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو ، و نەجاتی عەبدوڵلا ، چ١ ، چاپخانەی شڤان– سلێمانی ، ٢٠٠٧ .

٦١– مەیجەرسۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، و مینە ، ٢٠٠٧ .

٦٢– مەزاهر باجەلأن: ئێلی باجەلأن لەسەفەوییەكانەوە تاكۆتای قاجارەكان، و جەليل مورادی، كاروان عوسمان خەيان ،چ١ ،٢٠١٤ .

٦٣– نەوزادی موهەندیس: مێژووی هۆزی گەڵباخی لەسەرچاوەمێژوویەكاندا، سلێمانی ،٢٠١٢.

٦٤– نەوشێروان مستەفا ئەمین: بەدەم رێگاوە گوڵچنین چەند بابەتێكی كۆمەڵناسی، چ١ ، كتێبی یەكەم، بەرگی دووەم ، ٢٠١٥ .

٦٥– هاشم عاسی كاكەیی: كوردو چەند بابەتێكی مێژوویی ،چاپخانەی ئارابخا– كەركوك ،چ١ ، ٢٠٠٦ .

٦٦– هیوا مەلا حەسەن: چەردەیەك لەمێژووی هۆزی گەلاڵی، چ١، چاپخانەی چوارچرا– سلێمانی ٢٠١٧.

٦٧– وریا ڕەحمانی: كوردستان و كورد لەڕوانگەی نەخشەوانیەوە ،چ١ ،چاپخانەی ڕۆژهەلأت ،هەولێر ، ٢٠٠٩ .

٦٨– یەڤگێ ئیلی نیچنا ڤاسیلی یەڤا: هۆزەكانی كورد لەڕوانگەی مێژوو نووسانی كورد، و مەسنور سدقی، ٢٠١٦.

## سەرچاوە عەرەبییەكان .

٦٩-سي. جي .ادموندز: كرد و ترك و عرب سياسة و رحلات و بحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩–١٩٢٥ ،ط١.

٧٠-عباس العزاوي: العمادية في مختلف العصور، مطبعة وزارة الثقافة،هةولێر ،١٩٩٨ .

٧١-عباس العزاوي المحامي: موسوعة عشائرالعراق ، ط١ ، ١٩٤٧ .

٧٢- فؤاد حمة خورشيد : العشائير الكردية ، ط١ ، بغداد ، ١٩٧٩ .

٧٣-عيماد عبدالسلام رؤوف: دراسات و ثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم ،ص٢٤٠ .

٧٤-درويش باشا: تقرير درويش باشا لتحديد الحودود الايرانية– العثمانية سنة ١٨٥٣، مطبعة الحكومة، بغداد، ١٩٥٣ ، ص ٣٦ .

## لیستی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان

٧٥– ئاکام جمال محمد: مێژوو گۆڤارێکی مێـژووی وەرزییـە، ژمـارە ١٦، سـاڵی چـوارەم، پایزی ٢٠١٠.

٧٦–شوکریە کریم سەعید: هۆزی جاف و ڕۆڵـی لەبزوتنـەوەی ڕیزگـاری کـوردا ، گۆڤـاری کۆچ ، ژ ٩ ، ٢٠٠٨ .

٧٧–گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ جیهانگیر محەمەد عەزیز: ڕزگاری، ٢٠١٩/٣/٢٨ .

٧٨–د. فواد حەمە خورشید: کۆڤاری ڕەنگین ،ژ٨٤ ، ١٩٩٥ ، زانکۆی ئەنبار .

٧٩- **مستەفا نـەریمان: بـۆ بـرایم یوسـف بـەبان قایمقامەکـەی کفـری کوشـت؟، ڕەنگـین (گۆڤار)، ژ(٥٢) ،١٩٩٣، ل ١٤- ١٥.**

٨٠–گۆڤاری مێرك: کەریم خانی زەنـد، ومـەحمود عومـەر لەسـایتی گەنجینـە ، ژمـارە٦١، ٢٠١٠.

٨١– گۆڤاری سەنتەری برایەتی: ژمارە٢٦ ،هەولێر ،٢٠٠٢ .

٨٢– مـەحمود ئەحمــەد محەمــەد (مــەلا مــەحمود گەلاڵــەیی): ســەنتەری ڕۆشــنبیری کۆمەلایەتی بابان ، ژ١٠ حوزەیرانی ٢٠٠٩ .

٨٣– بەهجەت ئەحمەد: لێکۆلینەوەیەکی مێژووی دەربارەی هۆزی شوان، گۆڤاری زانسـتە کۆمەلایەتیەکان ، ٢٠١٦ .

## لیستی ڕادیۆ و کەناڵە ئاسمانیەکان:

٨٤– گەرمیان حەمەی پور: کـەناڵی ئاسمـانی NRT: لەپـەیام نێرانـەوە، ڕۆڵـی هونـەر لەپاراستنی شێوەزاری هۆزی کەڵهوردا، ٢٠١٧.

٨٥– کەناڵی ئاسمانی NRT : ڕاپۆرتێك لەسەر هۆزی بەختیاری : ٢٠١٨ .

٨٦– هەژار جەوهەر: تۆڕی میدیای ڕووداو، دووەمین فیستیڤاڵی هـۆزی پـالانی لەهـەولێر هەینی ٢٠١٨/٤/١٣ .

لیستی دەستنووس و محازەرەو لێکۆڵینەوەی بلاّونەکراوە .

٨٧– ئەحمەد حاجی غەفور کاوانی: دەستنوس، سلێمانی، ٢٠١٩/٣/١٣.

٨٨– دەستنوسی ئەحمەد مستەفا یاروەیس: ناحیەی ڕزگاری، ٢٠١٩/٣/٢٨ .

٨٩- بورهان عادل: دەستنوس، کەلار، ٢٠١٩/١/٣١ .
٩٠-دەستنوسی حەمەخان کاوانی: دەستنوس، سلێمانی، ٢٠١٩/٣/١٣.
٩١-چاوپێکەتنی دکتۆر حوسێن ئیسماعیل خان لەگەڵ د.موکەڕەم تاڵەبانی ، لەدایك بووی ١٩٢٣ کفری، لەرۆژی ٢ /١/ ٢٠٠٩.
٩٢-خالید ئەحمەدی: فەرمانڕەوای گەڵواخیەکان، ئامادەکردنی عەلی عەبدولا شەریف گەڵباخی: دەستنوس، سلێمانی ،٢٠١٨/٩/١٨ .
٩٣- سەردار حاجی ستار: مێژووی ڕەچەڵەکی هۆزی تیلەکۆ، لەچاپ نەدراوە .
٩٤- گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ شاکر کاکۆ مەرزان : هەولێر ، ٢٠١٦/١٠/٢٠ .
٩٥-ئامادەکردنی فریاد زەنگنە: دەستوسی مەلا عەلی زالواوی تایبەت بەمێژووی بنەماڵەکەیان لەسەنگاو، ناحیەی ڕزگاری، ٢٠١٩/٣/٢٠.
٩٦-کەمال حمەشەریف حارس محەمەد مەنمی: دەستنوس، سلێمانی، ٢٠١٩/١/١
٩٧- کاروخ عوسمان داودی: دەستنوس، گردەگۆزینە، ٢٠١٩/١/٣١ .
٩٨- حاجی دارا حەمە ڕەشید باوەمەردی: دەست نوس، سلێمانی، ٢٠١٨/٧/٢٦.

**سایتي ئەلیکترۆنی** .

٩٩- ئەسعەد جەباری: جینۆسایدی کورد، ناوی سەرجەم ئەنفالکراوەکانی هۆزی جەباری، ٢٠١٦/٤/١٦.
١٠٠- ئازاد سەلیم: مێژووی هورمزیار، ٢٠١٦، تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك .
١٠١-ئاراس جاف: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووك، ٢٠١٩.
١٠٢-ئامادەکردنی ڕێبوار حاجی نامیق: هۆزی گەورەی لەك، تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك.
١٠٣- ئامادەکردنی ڕێبین نامیق لەك: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك هۆزی لەك، ٢٠١٨ .
١٠٤-ئەینسایکلۆپیدیای ئازاد: کورتەباسێك لەسەر دروست بوونی هۆزی ئاکۆ .
١٠٥-حەسەن جاف: ئەکاونتی ئێل بەگی جاف .
١٠٦- حەسەن مەلا: کوردستانی نوێ،هۆزەکانی گەرمیان لەگێژاوی ئەنفالی سێیەم دا پەرتەوازە بوون، سلێمانی، ٢٠١٨/٤/٢٠ .
١٠٧- حەسەن مەلا: هەواڵ نیوز، سەنگینی میرسامیلی زەنگنە لەگۆشەنیگای مێژوودا.

١٠٨- ساڵەح هەلاج: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك، ٢٠١٦ .
١٠٩- زریان ئەحمەد: ماڵپەری میژووی کورد، ٢٠١٧/٣/٩ .
١١٠- ماڵپەری مێژووی کورد: تیرەکانی عەشیرەتی جاف، ٢٠١٨/٧/٨ .
١١١- ماڵپەڕی ویکپیدیای فارسی .
١١٢- ماڵپەڕی کوردپیدیا: هۆزی شێخانی .
١١٣- ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد، سەید محەمەد سەمەدی، مێژووی مەهاباد ٢٠١٨/٦/٢٠.
١١٤- ماڵپەڕی میلەت: سەفەرێك بۆ ئێزدخان ،٢٠١٦/٩/١٠ .
١١٥- ماڵپەڕی کوردپیدیا: ڕۆڵی هۆزی جەباری لەپاش نەفی کردنی شێخ مەحمود .
١١٦- ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد،هۆز و تیرەکانی جاف، ٢٠١٨/١٠/١٥ .
١١٧- ماڵپەری ویکپیدیا: ئینسایکلۆپیدیای ئازاد، ٢٠١٨/٦/٢٠ .
١١٨- ماکوان کەریم : هۆزی دۆم، تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك ،٢٠١٥ .
١١٩- ماردین عوزێری: تۆڕی کۆمەلایەتی فەیس بووك .
١٢٠- میرزا محەمەدی جەوادی قازی: نامیلەی دەست نیشان کردنی خێلاتی دانیشتووی دەوروبەری سابلاخی موکری .
١٢١- محەمەد عارف تەبەد: گەشتێك بەرەو کوردستانی ئێران شاری مێژووی خۆی، ماڵپەڕی جام کوردی ، ٢٠١٨/٣/٥ .
١٢٢- مینەجاف: تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس بووك، ئەکاونتی مینەجاف، ٢٠١٧.
١٢٣- سیروان کاوسی: ماڵپەڕی مالمۆکورد، لاپەڕیەکی تازە لەمێژوویەکی ونبوو ئەستێرەیەکی گەش ئاسمانی گەلێکی نووستوو .
١٢٤- سەریاس ئەحمەد: کوردپیدیا، چەند زانیاریەك لەسەر عەشیرەتی سورچی، پێداچوونەوەی هاوڕی باخەوان .
١٢٥- سەیدا محەمەد چۆڵمەکی: ماڵپەڕی یاریکورد نێت، پەیوەندیەکانی هۆزی چۆڵمەکی لەکوردستانی باشور، ٢٠١٧ .
١٢٦- سەبری هۆرێنی: هۆزی زڕگوش، سایتی وشە، ٢٠١٧/٩/١٧ .
١٢٧- سایتی وشە: عەشیرەتی کوردی مەنگوڕ، ٢٠١٣/٣/١٦ .

١٢٨– سایتی خەندان: مارك سایكس چۆن باسی كوردەكان دەكات ،٢٠١٦/٥/١٦ .
١٢٩– پەشێو مكرِەم ئەحمەد: هـۆزی گـل، تـۆڕی كۆمەلایـەتی فـەیس بـووك بنـار گلـی، ٢٠٠٣
١٣٠– كوردستان پۆست: هۆزی گەورك، ٢٠١٤/١/١٤.
١٣١-فەریدوون پەروازە: زاگرۆس پۆست، كورتەك لەمێژووی هۆزی مامۆیی، ٢٠١٤ .
١٣٢– عـەلی بانـەیی: پێوسـتە كوردسـتانمان خـۆش بووێـت، ماڵپـەری تەڤگـەری ئـازادی كۆمەڵگای كوردستان.
١٣٣– عەشرەتی نەژۆێنی: تۆڕی كۆمەلآیەتی فەیس بووك .
١٣٤– گەرمیان شاتری: تۆڕی كۆمەلآیەتی فەیسبووك، ٢٠١٩/٣/٣.
١٣٥–گۆران زەنگنە: تۆڕی كۆمەلآیەتی فەیس بووك، ٢٠١٧ .
١٣٦– هیدایەت جان: سایتی وشە، مەنگوڕ هۆزێكی ژنسالار لەكوردستان دا، ٢٠١٦/١٢/٦
١٣٧– ئەندازیار نەبیل محەمەد: هۆزی شەرەفبەیانی، ٢٠١٧/٧/١٩.

لیستی چاوپێكەوتن و گفتوگۆكان :
١٣٨– گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ م برهان حەمەفرەج: كەلار، ٢٠١٨/١١/٢٩ .
١٣٩-گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ بێستون ژاڵەیی: كەلار، ٢٠١٩/٢/٥ .
١٤٠-گفتۆگۆی نوسەر لەگەڵ ئەكاونتی ڕووداوی ئۆمەربل ٢٠١٦/٤/١٥ .
١٤١– گفتوگۆیی نوسەر لەگەڵ تەهای كوێخا ڕەشید : ٢٠١٨/١١/١، كەلار .
١٤٢– گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ عومەر حاجی فارس : گوندی كەنی زەرد، ٢٠١٩/١/١٣ .
١٤٣-گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ نەجم باجەلآن: كەلار، ٢٠١٩/٣/١٨ .
١٤٤-گفتوگۆی نوسەر لەگەڵ هاوار مام والی حەمەعەلی پیروەیس: سەراوسوبحان ئاغـا، ٢٠١٨/١١/٦ .

# پێڕست



## بەشی یەکەم

### هەندێك لەهۆزە ناسراوەکانی کورد:

## بەشی دووەم

## كورتەیەك لەمێژووی هۆزی گەورەی جاف



## هەندێ لەتیرە ناسراوەكانی هۆزی جاف .

چەند تیرەیەکی جاف جوانڕۆ و جاف گۆران :